Zakho Centre
for Kurdish Studies



# سلێڤانەیی
# ئەحمەد عەرەب
# دیوانا

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن
د. فاخر حەسەن گولی

# دیوانا

# ئەحمەد عەرەب سلێڤانەیی

## ئەحمەد عەرەب عەبدولوەهاب هاجیا – سلێڤانەیی

۱۹۵۱-۲۰۲۰

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا<br>ئەحمەد عەرەب سلێڤانەیی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێکێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین | دیـــار عـبـدالله |
| بەرگ | جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-9169-0-3 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٥٢ / ٢١ |



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

# دیوانا

# ئەحمەد عەرەب سلێڤانەیی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

# پێشەکی

ئەڤ دیوانە ژ ئەوان دیوانان دهێتە هژمارتن ئەوێن گشت جۆرە هەلبەستان ب خوە دگریت، لێ چونکە (ئەحمەد عەرەب) کەسەکێ ئەڤیندار بوویە، لەورا پشکا هەرا زێدەیا هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ ب ئەڤین و ئەڤینداریێڤە گرێدایە، ب خواندنا هەلبەستان دێ ب سەدان پەیڤێن جوراجۆرێن ئەڤین و ئەڤینداریێ هێنە دیتن، د ئەڤێ پێشەکییێدا هەولٚ هاتیەدان ئاماژە ب ژیاننامەیا هەلبەستڤانی و گرنگترین تیبینی و خالێن ئەڤێ دیوانێ بهێنە باسکرن.

## هەلبەستڤان ژلایێ جڤاکیڤە:

ئەحمەد عەرەب عەبدولوەهاب، ل سالٚا (١٩٥١)ێ ل گوندێ خوە (هاجیا) سەر ب دەڤەرا (سلێڤانەیان)ڤە، چاڤێن خوە ل ئەڤێ دونیایێ ڤەکربوون. زارۆکینیا خوە ل گوندێ ناڤبری دەرباز کربوو، ل سالٚا (١٩٥٦)ێ ب مەبەستا خواندنێ بەرێ خوە دا گوندێ (ئاسهێ) و دەست ب خواندنا سەرەتایی کربوو، لێ ژبەر ئالۆزیا ڕەوشێ ب تنێ شیابوو هەتا پێنجێ سەرەتایی ب داوی بینیت، پشتی ب داوی هاتنا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)، ڕژێما بەعس گوندێ (هاجیا) وەك تەڤایا گوندێن دیترێن دەڤەرا سلێڤانەیان ب زۆرەملی ڕاکربوون و ل مویسل ئاکنجیکربوون، لێ مالباتا هەلبەستڤانی ل سالٚا (١٩٧٧)ێ زڤڕینەڤە بازێڕێ زاخۆ و ل وێرێ جهواربوون. وەسا هاتیە گۆتن کو (ئەحمەد عەرەبی) ل سالٚا (١٩٨١)ێ، دەست ب ڤەهاندنا هەمی جۆرە هەلبەستان ب تایبەتی ئەڤین و ئەڤینداریێ کربوو. هەژی گۆتنێیە ل سالٚا (١٩٦٩)ێ ژیانا هەڤژینیێ ل گەل خانم (مریەم ئەحمەد عەبدو) پێکهینابوو. خودایێ مەزن چار کوڕ (فۆئاد، زیاد، ئازاد و ئەیاز) و شەش کچ (شیلان، ڤیان، ژیان، ئەڤین، دیلان و دیان) ب ئەوان بەخشی، ل سالٚا (٢٠١٣)ێ تووشی جەلٚتا دلی بوو، لێ دەست ژ هۆزان

ڤەهاندنێ بەرنەدا، ل سالا (٢٠١٨)ێ تووشی نساخیا ئێشاگران بوو، ل رێککەڤتی (٢٠٢٠/٣/٢٠) بۆ هەتاهەتایی ژ ئەڤێ جیهانێ مالئاڤایی کر.

**چەند تیبینیێن گرنگ ل سەر دیوانێ:**

ئەڤ دیوانا ل بەردەست وەك گشت دیوانێن دیتر خوەدی چەندین تیبینیانە، ل ڤێرە هەوڵ هاتیەدان ب تنێ ئاماژە ب گرنگترینی ئەوان بهێتەکرن و ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێنە:

- ئەڤ دیوانە ژ (٥٢١) هەلبەستان پێکهاتیە کو ل دویڤ ئەوێ دابەشکرنا مە رێکخستی (١٨) ئایینی، (٣٤٩) ئەڤینداری، (٨٨) سیاسی ـ نیشتیمانی، (٤١) جڤاکی ، و (٢٥) عەرەبینە، لێ هەژی گۆتنیە پتریا هەلبەستێن ئەوی ب ئەڤینداریێ ڤە گرێدایە.

- هەلبەستڤانی ل دویماهیکا تەڤایا هەلبەستێن خوە (ئەحمەد عەرەب سلێڤانەیی) نڤیسیە، ل ڤێرێ دیار دبیت کو ناڤێ ئەوی یێ هەلبەست نڤیسینێ (ئەحمەد عەرەب سلێڤانەیی) یە.

- شێوازێ نڤیسینا ئەڤێ دیوانێ ب دەڤوکا دەڤەرا (سلێڤانەیان) هاتیە نڤیسین و هەر کەسێ ب هویرێ ئەڤێ دیوانێ بخوینیت دێ بۆ ئەوی دیار بیت.

- ب هیچ رەنگەکی مە دەستکاریا رێنڤیسا هۆزانڤانی نەکریە، ب تنێ د ئەوان پەیڤاندا کو ب شاشیا رێنڤیسی دهێنە هژمارتن و کارتێکرنێ ل ریتم و واتایا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتیێ ئەوێ ناکەت، راستڤەکرن هاتینە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چو ـ چوو)، (بو ـ بۆ) (ژکەستی ـ شکەستی)، (تکم ـ دکم)، (تکەڤت ـ دکەڤت)، (تکین ـ دکین)، (تزانی ـ دزانی)، (تکێ ـ دکێ)، (تگرن ـ دگرن)، (تکێلم ـ دکێلم)، (شخودێ ـ ژ خودێ)، (تزانم ـ دزانم)، و... هتد.

- هەولٚ هاتیەدان هەر پەیڤەکا نە رۆهن یان پەیڤێن پێدڤی ب پێناسەکرنێ د دیوانێدا، ب شێوەیەکێ رێکوپێك ل پەراوێزان هاتینە نڤیسین.

- باراپتر ئەو هەلبەستێن رۆژ و هەیڤ و سالٚ ل سەر هاتینە دانان بو سالٚێن (٢٠٠٤ و ٢٠٠٦) دزڤرن و سالٚێن دیتر کێمتر دهێنە دیتن. هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ کو دیرۆکا تەڤایا هەلبەستان نەهاتیە دیارکرن، لەورا هەولٚ هاتیەدان ب ئەڤی شێوەیێ بەردەست بهێتە رێکوپێکرن.

- د ئەڤێ دیوانێدا هژمارەکا پەیڤان ب دوو شێوازان هاتینە بکارهینان مینا: (هیڤیدار - هویڤیدار)، (بیرهاتن - بویرهاتن)، (ژبیر - ژبویر)، (شنیکا - شنویکا)، (مژیلانك - موژیلانك)، (کیڤە - کویڤە) و ... هتد.

- ئەڤ دیوانە مینا گەلەك دیوانێن دیتر، هندەك هەلبەست دوو یان سێ جاران هاتینە ڤەهاندن، هەر ب ئەڤێ مەبەستێ مە هەولٚدا دانەیەکێ ژ ئەوان وەك هەلبەستا بنەڕەتی ل قەلەم بدەین و ل گەل دانەیێن دیتر بەروارد بکەین و جیاوازییێن وان ل پەراوێزان بنڤیسین، داکو ب ئەڤێ چەندێ پتر ببیتە جهێ مفا وەرگرتنێ.

- د ئەڤێ دیوانێدا ناڤونیشانێن هەلبەستێن: "دلێ ژار"، "بیك و زاڤا"، "بەهار"، "بێ ئێغبال"، "جەژنا ژدایکبوونێ"، "خوەزی"، "خەریب کرم"، "دلێ شکەستی"، "سەبرا دلا"، "دلێ کول"، "دل ماپ برین"، "کا سۆزا تە"، "کا سۆزداری"، "دار تەڤنێ"، "حەیرانۆك"، "هێلان"، "ڕەمەزان"، "سالا نوی"، "قوتابی"، "١٦ای تەباخێ" و "ئەز کەچم کوردستانیمە"، "ئالا مە"، "شڤان و بێری" و "مزگینی"، "هەولێر" دوو جاران، هەلبەستێن: "موحەممەد (س) مە کو دوو ژ ئەوان ب زمانێ کوردی و ئێك ب زمانێ عەرەبی یە"، "بێ باوەرێ"، دلێ بریندار"، سۆزداری"، بێ سۆزێ"، زاخۆکا من" سێ جاران، هەلبەستێن: "بۆچی سلی"، پەشیمانی"، گونەهباری" و "ئەڤین" چار

جاران، هەلبەستێن "جیرانێ"، "دایێ" و "پێشمەرگەمە" پێنج جاران و هەلبەستا: "نەورۆز" دوازدە جاران هاتینە بەرهەڤکرن.

- پترترین پەیڤا د ئەڤێ دیوانێدا هاتی بکارهینان پەیڤا (ئەڤین)ە و ئەوێن ب ئەوێڤە گرێدایی مینا: ڤین، ڤیان، ئەڤینی، ئەڤینداری و... هتد.
- هەلبەستڤانی سێ هەلبەستێن خوە ب ناڤونیشانێ "موحەممەد (س)" پێغەمبەرێ مە کو دوو ژ ئەوان ب زمانێ کوردی و ئێك ب زمانێ عەرەبی ڤەهاندینە ب چەندین خسلەتا ناڤکریە، بۆ نموونە: خودان قەدر و قیمەتی، تانجا پێغەمبەران، بەرەڤانکەرێ گونەهکاران ل ڕۆژا قیامەتێ، ڕەحمەتە بۆ موسلمانا، ناڤ شرین و... هتد. د چەند مالکێن دەستپێکا هەلبەستەکا ب ناڤێ "موحەممەد (س)" ب زمانێ کوردی دبێژیت:

موحەمـــــــەد ڕوونیـــــا چاڤـــــایێ
بـــــابێ قاســـــــمی و فاتمـــــــایێ
شـــــــرین خۆشــــــتڤێ خـــــــودایێ
ڕێبـــــــــــــەر بۆســـــــــــلمانایێ

- ژبەر ئەوێ گرنگیا هەلبەستڤانی دایە زانست و زانینێ، چەندین هەلبەست ل سەر مامۆستا، قوتابی و خواندنێ ڤەهاندینە، ل دەستپێکا هەلبەستا بناڤێ مامۆستایان ب ئەڤی شێوەیی دبێژیت:

چـــــاڤ تـــــاری بــــیم ڕێ نـــــەزان
ڕاکـــــــرم ژ خـــــــەوەك گـــــــران
نیشـــــا مـــــن دان پیتــــــە و وان
عــــــــورف و عـــــاداتێن جـــــوان

سەبارەت قوتابیان ژی دبێژیت:

ئـــــــەمین ئـــــــەمین قوتابینـــــــە
بـــــۆ پاشـــــەڕۆژا خـــــۆ ب هویڤینـــــە

بۆ مللەتی ڕۆناهینە
دا خۆ ناس کین کا ئەم کینە

- سەرکردە مەسعوود بارزانی ل دەڤ هەلبەستڤانی، سەرۆك، سەرکردە، بابێ شەهیدان، دلسۆزێ وەلاتی، خەباتکەر و... هتد. ل چەند دێڕێن هەلبەستا ب ناڤێ "سەرۆکێ من" دبێژیت:

دێ پێ بێژین سروودە
سەرۆکێ مە مەسعوودە
ئاخا پیرۆز ئازادکر
پێ ل دەوسا بابێ خوودە

- هەلبەستڤانی چەندین هەلبەست بناڤێ (پێشمەرگە)ی ڤەهاندینە و ئەوان وەك: جانڤیدا، خاك پارێز، نیشتیمانپەروەر، چەلەنگ، دلێر، عەگید، مێرخواس و... هتد ل قەلەم ددەت. د چەند مالکاندا وەها دبێژیت:

پێشمەرگەمە ئەز کوردم
ب کوردینێ سەربلندم
ل ڤێ خاکێ بەرەڤانم
زەند و بەندا دێ هلدم

- نەورۆز وەك جەژنەکا نەتەویی، جەژنا باب و کالان، ڕۆژا سەرکەڤتنا ستەمباری ل سەر ستەمکاری، سەر سالا کوردی، ڕۆژا ئازادیێ، ب کورتی ڕۆژا شادی و خوەشیێ، هەلبەستڤانی دوازدە هەلبەست ب ناڤونیشانێ (نەورۆز) ڤەهاندینە، ل چەند دێڕێن ئێك ژ ئەوان هەلبەستان دبێژیت:

مە پرس کربی ژ باب و کالا
ژ دیرۆکڤانا ل هەر چار مالا
ل نەورۆزێ کاوەی ڕۆهنکر دۆز
ل گەل کێ جەژن و سەرسالا

- (کوردستان) ل دەڤ هەلبەستڤانی: دیرۆکە، وەڵاتە، نیشتیمانە، دایکە، ئاخە، و... هتد، د چەند دێڕێن هەلبەستا ب ناڤێ ("کوردستان") دبێژیت:

تە خاك زێڕینە کوردستان
وارێ دێرین هەی ڕۆح و جان
هەی شینوارێ باب و کالان
ب ڕۆح و جانڤە ببین قوربان

- هەلبەستڤانی ب شێوەیەکێ گەلەك جوان باسێ گوندێ خوە (هاجیا) ل دەڤەرا (سلێڤانەیان) دکەت، د هەلبەستا ب ناڤێ "گوندێ من" پەیڤێن مینا: سنجەقا گوندا، وارگەهێ باب و کالان، بویکا بەهدینان و... هتد. ل چەند دێڕێن دەستپێکا هەلبەستا ناڤهاتی دبێژیت:

گوندێ مە سنجەقا گوندا
ل بەر بێخێرێ ب کەڤر و گەندا
شالیل و کەو وێ لێت خوینن
دێ لێ ژین سەر پێ بلندا

- (ئەحمەد عەرەب) د هەلبەستەکا خوەدا کو کێم هەلبەستڤانان ئەڤ پێنگاڤە هاڤێتینە، ئەو ژی شیرەت و ڕاسپێریا کوڕێ خوە دکەت کو پشتی مرنا من باشیێ بکەن و خوە ژ کارێن نەباش دویر بێخن. د هەلبەستەکا خوەدا یا بناڤێ "ئەگەر مرم" د ئەڤێ هەلبەستێدا، هەلبەستڤانی ب کورتی داخواز ژ کوڕێ کریە پشتی مرنا من ل گەل دایك، خویشك و برا، کەسوکاران، هەڤالان و خویانی و بیانیان یێ باش و هاریکار و ئاخڤتن خوەشبە، د چەند مالکێن هەلبەستا ناڤبریدا دبێژیت:

فوئاد بابو دلی ڤەکە
هزرا خووشك و برا بکە
حەسێب نەکە نە ل ناڤ وەمە

دەیکا کۆڤان تو ژبیر نەکە

- (ئەحمەد عەرەبی) گرنگیەکا زێدە دایە هەیڤا ڕەمەزانا پیرۆز و ڕۆژیگرتنێ، چەند هەلبەستەك د ئەڤی بیاڤیدا ڤەهاندینە کو پێکهاتینە ژ: "خودایێ هێژا، ڕۆژیگر، ڕەمەزان، هەیڤا ڕەمەزانێ" ل چەند دێڕێن دەستپێکا هەلبەستا بناڤێ "ڕەمەزان" دبێژیت:

ڕەمەزان هات ل مە مێڤانە
هەیڤا خێرێ و خێراتانە
ڕۆژیا بگرن و بکن نڤێژ
شاهیە ل ناڤ بوسلمانا

- وەك گەفەکرن بۆ دوژمنێن کورد و کوردستانێ هەلبەستەك ب ناڤێ "دوژمن بزانە کوردم" ڤەهاندیە و تێدا خویا دکەت: ئەم ئاخا خوە بەرنادەین و دێ جانێ خوە د ڕێکا وێدا قوربان کەین پاشی ب گوڕا شەهیدان سویند دخوت کو دێ تولا شەهیدان ڤەکەین، ل دەستپێکا هەلبەستا ناڤبریدا دبێژیت:

دوژمن بزانە کوردم
خاکا خۆ ئەز نابەردم
دێ پارێزم جان قوربان
ڕوحێ و جانی دا ل سەردم

- ژبەر وێ ئەڤینا هەلبەستڤانی ژبۆ دایکێ هەی، پێنج هەلبەست ب ناڤێ (دایێ) ڤەهاندینە، ئەوێ دایك وەك: تاجا سەری، بیناهیا چاڤان، خوەشتڤیا دلان، ئۆمێد و... هتد ناڤکریە. ل چەند دێڕێن ئێك ژ ئەوان ب ئەڤی شێوەیی باسێ دایکێ دکەت:

بدەستێن زێڕین لاندك هەژاند
ئەز نڤاندم ل من خەت لوراند

ژ بـــــــرس و ترســـــــێ قورتـــــــالكرم
ڤينـــا خـــۆ ل دلـــێ مـــن ده چانـــد
كوهــــــداری گۆتنــــا خودێمـــــــه
چەنـد حـەژ تـه بكـم هـێش يـا كێمـه
ب گــــــەردەن ئـــــازادكرنێ برێمـــــه
پێتڤـــــــــــــێ ڕازی بينێمــــــــــــه

ـ شەش هەلبەستێن ئەڤێ ديوانێ كو پێكهاتينه ژ: "حەيرانۆكێت ب كەنی"، "دوو دلێن سۆزدار"، "شڤان و بێری"، "دوو دلێن كول" و "دلداری"، " شڤان و بێری" كۆڕ و كچ يان بێری و شڤان مالكان دهاڤێژنه بەر ئێكدوو بۆ نموونه: ئەڤان چەند مالكێن هەلبەستا "شڤان و بێری" و ب ئەڤی شێوەيێ ل خوارێنه:

كـوڕ:

بێريـــێ مـــن خـــۆ كـــر شـــڤان
ســـەر خـــاترا وان چاڤێـــت جـــوان
ئـــەو ڕۆژا ئـــەز تـــه نـــەبينم
دێ پـــەزی هـــێلم بـــێ خـــودان

كـــچ:

شـــڤان ئـــەزم بێريـــا بـــۆتی
تـــێم بێريـــێ ژ دلـــەك ســـۆتی
چـاڤ مـال تـه و پـەز مـا نـەدۆتی
پـــەز مـــا ل هەڤشـــی و نـــەهاژۆتی

ـ يا دياره هەلبەستڤانی چەند هەلبەست ل سەر باژێڕێن كوردان ڤەهاندينه (زاخۆ، هەولير، دهۆك، دياربەكر، ئاكرێ و كەركووكێ)، لێ ژ هەميان پتر باسێ باژێڕێ زاخۆ كريه، ئەڤه ژی بۆ وێ چەندێ دزڤڕيت كو پڕانيا

ژیێ خوە ل وێرێ دەرباز کریە، ل دەستپێکا هەلبەستا بناڤێ "زاخۆکا من" ب شێوەیەکێ بالکێش باسێ زاخۆ دکەت:

ئـــەڤ زاخۆکـــا مـــن ڕەنـــد و جـــوانێ
تـــــو ب خابیرڤـــــە ڕح و جـــــانێ
ســـــــنجەڤا شـــــارا هـــــــەمیانێ
بەهشـــــــتێ خۆشـــــیا دلانـــــێ
وارگـــــــەهێ بـــــاب و کـــــالانێ
ب پـــــــــرا دەلال دیرۆکڤـــــــــانێ

- دناڤ ئەڤێ دیوانێدا، هژمارەکا مالکان دووبارە بووینە ب تایبەتی ل دەستپێکا ڤان هەر دوو هەلبەستێن ب ناڤێ (ژ کیڤە بینم) و (دلێ شکەستی) ئەو دێڕ ئەڤا ل خوارێ یە:

ژ کیڤـە بیـنم دلـێ بـەرێ مـن نەمایـە
ژ نویکا پێڤە حەژ تە بکم بێ مەفایە

- (ئەحمەد عەرەب سلێڤانی) حەفت هەلبەستێن فۆلکلۆری ب ناڤونیشانێ "هۆلێ"، "ئاگرێت خیڤەتا" و "هەی بەردە بەردە بەردە"، "کورکۆ چولی بڕی"، دوو جاران "دار تەڤنێ"، "دار تەڤنێ" و "شڤان و بێریڤان" ڤەهاندینە، ل دەستپێکا هەلبەستا "ئاگرێت خیڤەتا" ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێ دبێژیت:

ئاگرێـــــــت خیڤـــــەتا جـــــۆتن
ل ســـــــەرێ ملکـــــا دە تلـــــۆتن
مـــە خـــەیال چاڤێـــت هـــەی هـــۆتن
بینـــــا مـــــەمکا ئـــــەم ســـــۆتن
تـــــاڤێ لێـــــدا شـــــەوڤێ لێـــــدا
تـــــاری کەتـــــە دونیـــــایێ

- دویماهیك پشكا ئەڤێ دیوانێ كو دبیتە پشكا شەشێ گرێدایە ب هەلبەستێن زمانێ عەرەبی كو ژ بیست و شەش هۆزانێن ئەڤینداری، ئایینی و سیاسی پێكهاتیە، ل دەستپیكا هەلبەستا ب ناڤێ "محمد (س) دبێژیت:

محمـــــــــد بـــــــــدر منيـــــــــر

علـــــــي نهجـــــــك نســـــــير

خيـــــر خلـــــق يـــــا أمـــــين

حبيـــــــب اللـــــــه القـــــــدير

ل دویماهیێ سوپاسیا خودایێ ئێكانە دكەین بۆ ئەو هێز و شیانێن داینە مە كو ئەڤی كاری ب داوی بینین، هەروەسا سوپاسیەكا تایبەت بۆ كورێ هەلبەستڤانی (زیاد)ی كو هەر ژ دەستپێكا كاری هەتا داویێ ل گەل مەدا بوو كێماسی د هاریكاریكرن و پشتەڤانییێدا نەكر. هیڤیدارین ئەڤ كارە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنا گشت ئالیەكی.

د. فاخر حەسەن گولی

دهۆك ٢٠٢١

# پێشمەرگەمە

پێشمەرگەمە شەرڤانم
مێرەك ب سەد مێرانم
ل خاكا خۆ ئەز ب خودانم
ل مافێ خۆ بەرەڤانم

پێشمەرگێ بارزانیمە
هەردەم ل رێبازا ویمە
ب روح و جان فیدائیمە
زێرەڤانێ گەلیمە

پێشمەرگەمە ئەڤسەرم
د سەنگەرا دە وێ د خورم
سینگی دوژمنا دگرم
خاکێ نادەم تا بمرم

ئەزم پێشمەرگێ کوردا
پیلامە د سەنگەرا دا
دەربەك من ل دوژمنادا
شکەستنا وان بۆ من دەردا

# پێشمەرگەمە

پێشمەرگەمە جانفیدا     خۆ ژ مرنێ ئەز ڤەنادم
ئالا من دەم بلندا     دوژمنا ژ خاکێ ڕادم

من ئارمانج دەولەتبوونە     ل کوردستانێ ئازادم
خاکا من ل دلی خۆنە     گورزا ل دۆژمنی دادم

سنوورا دێ پارێزم     خوینێ ل سەر خاکێ ڕێژم
ئێک بۆست ئاخا خودانم     دوژمن ئەز دێ تە سۆژم

پێشمەرگەمە چەلەنگم     هاوار ڕۆژێت تەنگم
تولا شەهیدا ڤەکم     ل جیهانێ ب ناڤودەنگم

# پێشمەرگەمە

شەرڤانم پێشمەرگەمە
دلسۆزێ خاكا خۆمە
پارێزڤانم ل وەلاتی
ژبۆ مرنێ ئامادەمە

پێشمەرگەمە و دلێرم
شێرم و عەگید و مێرم
داگیركەرا دێ هێرم
ل خاكا پیرۆز ناهێلم

دوژمن خاكا من بەردە
من گیان و خوینا ل سەردە
بوستەك ئاخا خۆ نادەم
نەمانا تە ل من دەردە

سویند ب گۆڕا شەهیدا
وان خۆشمێرا و عەگیدا
خوین بێتە سەرچوكیدا
تولێ ڤەكەم د وەختێدا

## پێشمەرگەمە

پێشمەرگەمە و زێرەڤانم
ل خاکا پیرۆز بەرەڤانم
سێنگی ل دوژمنا دێ گرم
ئەز بەجکە شێرێ کوردانم
پێشمەرگەمە و بەرەڤانم
ل ئاخا پیرۆز بەرەڤانم
پێشمەرگەمە و زێرەڤانم
ل ئاخا پیرۆز بەرەڤانم
سینگێ دوژمنا دێ گرم
خاکێ داگێرکن وە ناکەم
ئەز دلێرم پیشمەرگەمە
جانیفدایێ خاکا خۆمە
بارزانی سۆزدارێ تەمە
هەتا بمرم ل دۆزا تەمە

# پێشمەرگەمە

پێشمەرگەمە ئەز کوردم
ب کوردینێ سەربلندم
ل ڤێ خاکێ بەڕەڤانم
زەند و بەندا دێ هلدم

خودان مافم ب باوەر
دوژمنا ژ خاکی کەم دەر
ڕوح و جانی دەینم سەر
مرنێ ل وان کەمە وەغەر

جانیفدا پێشمەرگەمە
دلسۆزێ خاکا خوەمە
دێ سنۆرا پارێزم
ساخم هندی هەمە

دوژمن هوین چاڤا ڤەکن
ئەم ئەڤرۆکە دەولەتن
هەر چوار پارچا ئەم یەکن
هوین نەشێن مە ژێکڤەکن

# پێشمەرگەنە

پێشمەرگەنە جانفیدا
هەر مێرەك وانا ب سەدا
پارێزڤانێن وەلاتی
دوژمن خاکا مە بەردە

دلێرن پێشمەرگەنە
رۆناهیا چاڤێت مەنە
ژبۆ مرنێ ئامادەنە
شێر و عەگیدێت مەنە

پێشمەرگە زێرەڤانە
د چەپەرا دە پیلانە
ل دوژمنا رۆح کر بەلا
پێخاسا ژبەر بازدانە

پێشمەرگەنە رۆح جان
دەولەتبوون ئارمانجا وان
خودان سۆزان و پەیمان
بژیت کورد و کوردستان

# مزگینی[١]

مزگینی هات ل مە گەش بی رۆژ
سەرکەفتنا مە یا پیرۆز
هلبژارتنا ئەنجام دان
مللەتێ مە ئەداکر سۆز

ل کوردستانێ پیرۆزباهی
شار و گوندا کەیفە و شاهی
ل مە رۆژ هەلات بی رۆناهی
ژیان خۆشبی بۆ سوباهی

هلکن شەمالا و فەنەرا
مەسعوود سەرۆکە و رێبەرە
هەر چار پارچا ئەو سەروەرە
یەکبوونا کوردا ئەگەرە

سەرکەفتین دوژمن بزانێ
بەرز بی ئالا کوردستانێ
دۆزا مە دەنگدا ل جیهانێ
ئارمانج دەولەتبوون نیشانێ



---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەفتی (٢٠٠٩/٧/٢٦)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# چاڤ بێنەدەر[1]

نەیار تە ساخ چاڤ بێنەدەر　　کۆماری ل کوردا نێزیك بی
گونەهبار تە چی چاکی کر　　ژ کی بێ دنیا پالدای بی
هەکەر کورد بێ نە ژ کوردانێ　　خودا دزانت دایك کی بی
وە کۆژتن[2] چەند غالی غەرەز　　ل دەڤ خودایی بەهشتیبین
ئەی زەحاکێن ئەڤی چەرخی　　هزار لەعنەت ل وە بارییبین
پالدەرێن کونەها مەزن　　ژ خۆ فرۆشا هوین کەرییبین
دێ مینین سەربەست و شاد　　ب ئازادیێ ئەم شاهیبین
خوینا شەهیدا بی خەلات　　ئاخا شرین ئەم گورییبین
بۆ تە فدانە ئەی وەلات　　ئەم خاك پەرێسێن وارییبین
ل مە کوردا نوی رۆژەك هەلات　　وار و وەلات رۆناهیبین

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١/٢/٢٠٠٤)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) کۆشتن.

# هاوارا برەخنە

كانێ گاز و كانێ غاز
پانزین ب هویقیا داخواز
گەلێ بەرپرسێن هێژا
مللەت وەكر بەلەنگاز

تورك بۆ مە تەلها ڤەدن
دێ چەوا كەهەرەبێ دن
ئەو دوژمنن نەمەردن
ژ پیلانا دەست نابەردن

دبێژین عەرەبا برا
رادهێلن مە وەك گۆرا
خودا ژ وانا مەسترە
دێ شكێنن دێ یێن چرا

عەجەم زیوانن نەكر
نە وان پشتە و نە وان بەر
مەهابات شاهدە ل سەر
چەند كورد وان كۆژتن[١] ب غەدر

بەرپرسینۆ ژ خەو رابن
ل مافێ رەوا هشیاربن
ل مللەتێ خۆ خودان بن
وەنەكێ ئەم هندابن

---

(١) كۆشتن.

مه ئازادی بخوین کری
دۆزا خۆ دێ بین سەری
مللەتێ کورد هلپەری
دەولەت خوازە ل کیش وەری

# ڕیڤیێ کونجا[1]

ڕەشەبایەك ڕابی ل وەلاتی
ل سالێن شێشتا و پێدا
ل گەل خوە ئینا پارتەك خوینمێژ
بی پەنجە شێر د عیراقێدا
عەفلەقی صەدام هلبژارت
کر پەتشاه و ئاغا د مالێدا
یەکەمین کونگر بەروڤاژی
نە ل سەر خێرێ وی گرێدا
لێ کۆم بین سویتار و تویلە
عەلو و تەهۆ و ئەزمان زێدا
دەستپێك پێنگاڤ کورد ڕوخاندن
کەس دی نەبی د مەیدانێدا
سینگ دا کۆمارا ئێرانێ
ب چەك و جەبلخانا لێدا
ئێك مەلیون کەس وی دان کۆژتن[2]
مال نەما تازیەك[3] نەتێدا
ل کوردا کر فەرمان و ئەنفال
ساڤا مە هێلان[1] د لانکێدا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێکەڤتی (٢٠٠٣/٩/٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن. ل جهەکێ دیتر: (٢٠٠٤/٩/٣).

[2] کۆشتن.

[3] ل جهەکێ دیتر: زیمار، بەهیەك.

کێمیا باراندن ل حەلەبچە ‌ ‌ ‌ پێنج هەزار چوون د ئێك گۆریدا

دەربەدەربین یێ کۆژت[٢] یێ گرت ‌ ‌ ‌ زیندانا ڕیێ نەما تێدا

پێنج هەزار گوند داگیرکرن ‌ ‌ ‌ عەرەب دامەزراندن تێدا

سەد و هەشتێ و هەردوو هەزار کورد ‌ ‌ ‌ ب ساخی کرن دبن عەردێدا

هەشت هەزار بارزانی گرتن[٣] ‌ ‌ ‌ دای بابێن وان چاڤ مان[٤] د ڕێدا

کورد نەچار بین بین پەنابەر ‌ ‌ ‌ ل سەر سنۆرا د ناڤ بەفرێدا

ب هەزارەها ساڤا مرن ‌ ‌ ‌ مە ب گورکرن د بلەهێدا

دای ل کوڕی نەبی خودان ‌ ‌ ‌ ترس ئێخست دلێ خەلکێدا

شاخ دان بن شیعا ل باشووری ‌ ‌ ‌ نێ نە کورد بین قوج تە لێدا[٥]

بناڤ کەت وەك گورگێ دەڤ بخوین ‌ ‌ ‌ تەرم ل هۆرا مان د ئاڤێدا



---

(١) ل جهەکێ دیتر: دایکا ساڤا مان.

(٢) کۆشت.

(٣) ل جهەکێ دیتر: کانێ.

(٤) ل جهەکێ دیتر: دەی بابا چاڤ مانە.

(٥) ل جهەکێ دیتر: هەر عەرەب بین ژ زەید و عوبێدا.

ب دلەك ئاسن[1] دا وان كۆم كێ
چاڤ گرێدای گولە لێدان
جەنگ ڕاوستا و ئەو نەوەستا
ب زۆرداری[2] چو د كوێتێدا
د گۆت نێ كوێت خاكا منە
مێژوو دبێژت[3] دیرۆكێدا
كوێت ڕامالی ب ئاخ و بەر
ئەم ئێخستین د بەلایێدا
چەند عالەمێ ژێ كر هویڤی
بی عەمێ گوزێ و كەت د كوسكێدا
گۆتنێ كوێتێ بەردە
پیا خوەكر ستۆ[4] ل كێرێدا
ب سەر شوورێ ژ كوێتێ دەركەت
كوێتێ ئەمیر هات تێدا
ل مە حەسار و تەنگاڤی
دینارێمە هەر ل كێمێدا
ئەو ڕابێ سینك دا ئەمریكا
نێ وی[5] دزانی مرنا درێدا
بزنێ نانێ شڤانی خوار
كوپالەك ل ستوی وێدا



---

[1] ل جهەكێ دیتر: زاڵم.

[2] ل جهەكێ دیتر: ب كەرینی.

[3] ل جهەكێ دیتر: یا خوەیایە.

[4] ل جهەكێ دیتر: خوە.

[5] ل جهەكێ دیتر: باش.

هـــەڤپـــەيمانـــا قورتـــال كـــرين
ئـــەم گـــەهانـــدين ڤـــان ئۆمێـــدا
فێلـــەبـــازى[١] وى خـــوە ڤـــەشـــارت
كراســـێ كـــورت مـــا د بـــەژنێـــدا
ژ كـــونجێ ئينـــان دەر وەك ڕويڤـــى
مـــــوهيبى ڕوتبـــــە ل ئاخێـــــدا
بـــدەســـتێ كوردانـــە[٢] و هـــات گـــرتن
ب قـــــەفـــل و زنجيـــرا گرێـــــدا
ب ڕهـــــێن درێـــــژ زينـــــدانكرن
شـــنويكا كـــەت د ئـــەمـــرێ خودێـــدا
بـــــلا تــــە زويكـــــا نـــــە كـــــوژن
هــــەڕۆ خــــوە بينـــــە د مرنێـــــدا
بـــــلا تــــە بگێـــــرن شـــــار و شـــــار
دا بكـــەڤـــێ د بـــەر گونـــە هێـــدا
ببينـــــە زارۆكـــــێن بـــــى بـــــاب
دلـــــى دايكـــــا ئـــــاگرى تێـــــدا
خـــر هێتيمـــا مـــافێ خـــوە دڤـــێن
كـــەســـوكارێن دبـــن عـــەردێـــدا
ئـــەو چـــالێن تـــە بـــو مـــە كـــولاين
بـــەس تـــو ب تنـــێ كـــەتـــێ تێـــدا
عـــودەى قوســـەى هـــاتن[٣] كـــۆژتن[٤]
جـــەگـــەر ل تـــە ســـۆت د زيندانێـــدا

---

[١] ل جهەكێ ديتر: حيلەبازى.

[٢] ل جهەكێ ديتر: چاكا.

[٣] ل جهەكێ ديتر: دوو كوڕ ل پێش چاڤێن وى.

[٤] كۆشتن.

چوون هەر دوو ژن ب عەرز و عەیال
خۆشیا نابینێ د خەونێدا
گێنجێن دەلال تە دان کوژتن
تو بەرپرسێ[1] د ڤێ چەندێدا
خوە دکر فرعەونێ ڤی چەرخی
یێ خوە دبینێ دەستێ کێدا
خەون خەیالێن تە خاڤ بین[2]
پیرۆز بت حالێ تو تێدا
چی ژ تە کێم بی هەی گونەهبار
تە خوە ئێخست د ڤێ تەلهێدا
بلا تو بچێ گور بە گور
د ناڤ مەزبەلا مێژوێدا
بۆشی تو کرێ عەبرەت
دا کەس دی نەدت دەوسێدا
دویڤەلانکێن تە هێش پێد ماین[3]
ئیرۆ شەریپانێ لێدا
سەرێ وان هات پەرچقاندن
کونەهبارن[4] د ڤێ ئاخێدا
حزبا[5] بەعس چوو ئەو ڕوخا
بی ئازادی د کۆمارێدا

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ئەو.بەرپرسە.

(٢) ل جهەکێ دیتر: مان خاڤ.

(٣) ل جهەکێ دیتر: د ماین.

(٤) ل جهەکێ دیتر: شیر حەرامن.

(٥) ل جهەکێ دیتر: پارتا.

صەدام هەی دورندێ چەپەل

یا تە كری چو ب ئاڤێدا

چەند گورستان ئاشكەرەبین

چ دلبی ل تە د بریارێدا

فەقیرو ژاربین بێ گونەهـ

خودێ ژبیر چوو د وێ ڕۆژێدا

چەند تۆلازا گوهـ لێ برین

بەژدار نەبین د وێ جەنگێدا

مرنا تە نێزێك بی صەدام

بی تەمغەك ڕەش دیرۆكێدا

دی ڤێجە هركە پرێزێ

كەسەك ناكەڤت دخەمێدا

# ژارەك وەك من پەریشان

ژارەك وەك من پەریشان
بێ جەنگ و بێ دل كۆڤان
ل وارى دوژمنا مین ڤەدان
بەركەفتم مام بێ خودان

من هەر دوو پیێن خۆ ژ دەستدان
ساخەك مریمە و بێ ژیان
تەنگ حالم و بێ سەمیان
ب خێزانم ئەزم مەزنێ وان

نەچار بیم من دەرگەهـ قوتان
ب دەیك و بابم ل وان بوورین دان
ژ كەد و كەسپا نەبی شیان
قەستا وە دكم مالا بارزان

خودان ڕەحمن پێشێن كوردان
ل دەردێ من هوین بكن دەرمان
كوردپەروەرم من ڕێ نەمان
ل ڕێبازا وە خۆ كم قوربان



Zakho Centre
for Kurdish Studies

# ئەم دل خۆشین ئەڤرۆ چەژنە

ئەم دل خۆشین ئەڤرو چەژنە
بگرنژینن خەملا ل بەژنە
بگور هەدارا دکین پیرۆزباهی
ژ رادیوا دەلال دەنگێ گەنجا

پیرۆزباهی بقەفتێن گولا
گول چیچەکا و قەرەنفلا
چەژن شەماله لمە هەلا
کەیف و شاهی گەت ناڤ دلا

بخێر بێت چەژنا خۆشی تێدە
بکەیڤن سەما دڤێ ڕۆژێدە
ئۆمێدەواربن سۆز و پەیمان
مە داخاز بگەهین ئۆمێدا

چەژن هات ڕۆژ ل مە هەلات
ئەم سەر فەرازبن ب تە وەلات
بۆ ڕۆژەك گەش دێ کین خەبات
دا ئازادێ بکین خەلات

بێ شاهی و گوڤەند ل واری
دگەل وە دا ڕێنین ب ئەڤینداری
ئەی گوهدارێن ڕادیوا گەنجا
گڕنژین سەر لێڤا باری

ڕادیوا دەلال دلڤەکەرە
جەژنە و بەرنامێ ئێك ب سەرە
شارێ زاخۆ بۆ وە فەنەرە
ڕازیبینا وە مە ل بەرە

پیرۆزکن جەژنێ ل هەڤالا
شارێ زاخۆ ل گەنج و کالا
ڕەڤین خەم و خەیالا
جەژن ب ڕەوشە بۆ وە دەلالا

## سالا نوی

سالا نوی هات ب گڕنژین
شەمالەك دی هلبی ل ژینێ
ل سالا بێت ئەم ئۆمێدەوارین
ئالا بەرزبین ل سەر خۆ بینێ

ل هەرێمێ ئارام تەناهی
ئیرۆ ل مە گۆڤەند و شاهی
ل سەر كردی دكین پیرۆزباهی
ڕێبەرە ل دۆزی و ڕۆناهی

دوو هەزار و ئێك ب خێر بێت
فیدرالی ئارمانجە و مەت ڤێت
ل ئێك شاهی بین ل هەر چار پارچا
دەستا بكین تێكدە ل وەلێت

دا پارێزین مافێ ڕەوان
ئاڤاكین وەلاتێ جوان
ل شێست مەلیونا خۆشكین ژیان
بلا سنۆر ب ئێك بان

## سالا نوى

ل مــــه جـــەژن و ســـەرســـالە
شـــاهى ل هـــەمـــى مالـــە
شـــەمالـــەك نـــوى هلبـــى
ل ژيـــێ مـــە و هـــەڤالـــە

ســـالا نـــوى ب خێرهـــاتى
ل وەلاتـــــێ ژێهـــــاتى
ل بـــــن ئالايــــا پـــارتى
پـــــارتى ديمقراتـــــــى

قـــەفتـــێن گـــولا دكـــين رێـــز
بـــۆ ســـەروكـــێ بـــەرێـــز
مـــــەســـــعوودێ بـــــارزانى
مـــا بـــێ كـــوردا دزانـــى

بريـــــار هـــــەرێمێـــــدا
كـــــونگره وان گرێـــــدا
ئۆمێـــــدا ئـــــەنجامـــــدا
تكـــــا بينـــــا چارێـــــدا

# کورد مانە ژار

مخابن کورد مانە ژار
کەس ل حالێ ناکت پسیار
پەلاتە بین، بین بەندەوار
دەربەدەرین لێ سۆتن وار

گوند کاڤل بین بێ ڕەوش مان شار
زارۆك مرن هزار هزار
ئاخ چ ژەهرە بێ مە ڤەخوار
هەر سال دبێژین خوەزیا پار

سەرهلدانا پیرۆز هاتی
مە زەند هلدان براتی
پێخوەش حالبین ڤی خەلاتی
ل کوردستانا هۆ ژێهاتی

مە هوین دەینان ب سەرۆکانی
سۆتەمەنی ل مە بی قاتی
دی هۆ ب ڕێڤە بن وەلاتی
بی جهێ داخێ بجه نەهاتی

دوژمنی ئاخ بەردا و ڕەڤی
کێشا کوردی خست سەردەڤی
هەڤ پەیمانا هەست لێ ل ڤی
ئەم پاڕاستن ڕوح بزڤی[١]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ڕوح تێر نڤی.

ئاڤەدان بین گوند و زەڤی
محەیڤ ئیرۆ ل مە هەڕفی
ل مە بین خەون چوون ل گەل شەڤێ
کوردو چ جا پێش ناکەڤێ

ئەندامێت مە دولار دیتن
فەقیر و ژار دویر ئاڤێتن
خوین ل مللەتی هات مێتن[1]
وا دیارە نێ ئەم شێتن

بەنکێت وانا ژ دەرڤە تێن[2]
چێلا وان نێ هەر دێ زێتن[3]
تەنگە زاربین وان هۆ دڤێتن[4]
بلا دوژمن دیسا بێتن

چ فەرمانە مرنا ب ژاری
دیسا دونیا ل مە بی تاری
مە دەست پاقژکر ب دیواری
بێ هێزکرین دان بەرباری

بمرن نابینین[5] ڕزگاری
مە بۆ وان کر وانا خوار پاری
بەهرا مە بی ژەهرا ماری[6]
فرۆتین دانە ب دولاری

---

(١) ل جهەکێ دیتر: خوینا مللەتی وان مێتن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: بەنك تژینە ژ دەرڤە تێتن.

(٣) ل جهەکێ دیتر: چێلا وان دێ دیسا زێتن.

(٤) ل جهەکێ دیتر: مر گوهـ دان مە وان هۆ تڤێتن.

(٥) ل جهەکێ دیتر: کا دێ مرین چوو.

(٦) ل جهەکێ دیتر: دل مانە ب کول زەحمەت تاری.

کوردێـــت ڕەڤـــن ل هـــەمـــی ئـــالا
مللـــەت چـــۆل بـــی نـــێ مـــا ڤـــالا
دل لـــێ پـــەقـــین ژبـــەر دەجـــالا
مـــە چـــاڤ ڕانـــابن ب هـــەڤـــالا

کـــــانێ خوینـــــا ڤـــــان دەلالا
دوژمنـــــا ئـــــەم دان بـــــەر پـــــالا
ئـــــاپۆ[١] و ســـــەدام[٢] و جـــــەلالا[٣]
مێـــــــژوو ئـــــــاڤێتن زەبـــــالا

---

[١] عەبدوڵلا ئوجەلان، ناڤدار ب ئاپۆ.

[٢] سەدام حسێن تکریتی، هەر ژ (١٦ تەمووزێ ١٩٧٩)ێ هەتا (٩ نیسانا ٢٠٠٣)ێ سەرۆک کۆمارێ عیراقێ بوو. ل سالا (٢٠٠٦)ێ هاتە سێدارەدان.

[٣] جەلال تالەبانی، ناڤدار ب مام جەلال.

# نەورۆز

ئادار مەها شۆڕەشا
خۆشمێرا کر گەنگەشە
ئارمانج ڕزگاریا گەلی
ل هەرجار پارچا دل خۆشە

بیست و ئێک بی سەرهلدان
کاوەی زەند و بەند هلدان
ئازاد کرین ژین دەستان
ئاخ نەهێلان بێ خودان

مێژوو دیرۆک خەملاندی
سەرێ مە پێ هلاندی
ل مابێ خودێ بین شڤان
کوردین ل دلا چاندی

نەورۆز جەژنە پیرۆزە
دێ پارێزین ل مە سۆزە
جەژن و سەر سال نەورۆزە
پیرۆز بت ل کوردا دۆزە

# نەورۆز

مە پرس کربی ژ باب و کالا
ژ دیرۆکڤانا ل هەر چار مالا
ل نەورۆزێ کاوەی ڕۆهنکر دۆز
ل گەل کێ جەژن و سەرسالا

نەورۆزێ جەژنا بەهارێ
بیست و ئێکی ئادارێ
ئاشتی و ئازادی هات خوارێ
ل مافێ ڕەوان خزمەتکارێ

بخوینێ کاوەی مێژوو نەقشاند
نەورۆز کر بیک تێدە خەملاند
ب تلیلی ڤە و ب شاهی و دیلان
کر دیاری ل مە کوردا شاند

نەورۆز ل چاڤا سیناهی
مە ل هەڤدوو کر پیرۆزیاهی
دۆزتاریبی بێ ڕۆناهی
نوی ڕۆژهەلات ل مە بی ساهی

## نەورۆز

بیست و ئێکی ئادار هات
نەورۆز جەژنە و ڕۆژهەلات
کاوەی ب خوین دۆز خەملاند
بەرپەر ل دیرۆکێ نەخشانت(١)

ئازادکرین شبن دەستی
ب کێشێ ڕۆناهی خوەستی
پاش ڕۆژەك نوی ب سەربەستی
مایێ ڕەوان پاڕاستی

ل مێژووێ ئەم ڤەکۆلن
بدە هارییە ڕێ پێپ(٢) شۆلن
بارزانی(٣) و قازی(٤) و سەعید(٥)
ل دوژمنا ڤەکن تولن

---

(١) نەخشاند.

(٢) پێ ب.

(٣) مەلا مستەفا بارزانی ل (١٤ ئادارا ١٩٠٣)ێ ل گوندێ بارزان هاتیە سەر دونیایێ ب ناڤدارترین و مەزنترین ڕێبەرێ تەڤگەرا ئازادیخوازا کورد دهێتە هژمارتن، گرنگترین خال د ژیانا بارزانیدا چوون و زڤڕینا وی ژ ڕووسیا (١٩٤٦-١٩٥٨)ێ و ڕێبەریا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)ێ بوو، ل سالا (١٩٧٩) مالئاڤایی کر.

(٤) قازی موحەمەد، دامەزرێنەرێ کۆمارا کوردستان (١٩٤٦)ێ بوو، ل (٣١ ئادارێ ١٩٤٧)ێ ل مهاباد هاتە سێدارەدان.

(٥) شێخ سەعید پیران ل سالا (١٩٢٥)ێ، دژی حکوومەتا تورکیا شۆڕەش کر، د هەمان سالێدا هاتە سێدارەدان.

نەورۆز بیرهاتنەك خوەش
ل چار قورنەتا ئاگر گەش
كۆچكێن دۆژمنا مان ڕەش
ل سەر دفنا وان بین ئێك لەش

# نەورۆز

بیست و ئێکێ ل تە ئاداری نەورۆزە
جەژن و سەرسال ل گەلێ مە پیرۆزە[1]
کاوێ ئاسنگەر ل دۆزێ ئەداکر سۆزە[2]
دیرۆک و مێژوو شاهدن نوی ڕۆژە[3]

دۆژمن قەد کورد قەبیل ناکن بندەستی[4]
چەند زەحاك ڕابن دێ خوبینن شکەستی[5]
هەرچار پارچە ئێك دلن ب خوین و هەستی[6]
شۆڕەش ڤان ل ئارمانجێ ئاشتی خوەستی[7]

گەلی کوردا باش پارێزن سنۆرا[8]
پەرێسن خاکا شرین دوژمن زۆرە[9]

---

(١) ل جهەکێ دیتر: جەژن و سەرسالا ئازادیێ پیرۆزە.

(٢) ل جهەکێ دیتر: کاوێ ئاسنگەر ل ژینێ شەمال هلکر.

(٣) ل جهەکێ دیتر: ل دیرۆك و مێژوویێ ڕۆهنکر بی دۆزە.

(٤) ل جهەکێ دیتر: دژمن کورد قەبیل ناکن بندەستی.

(٥) ل جهەکێ دیتر: هزار زەحاك ڕابن ناژکێنن هەستی.

(٦) ل جهەکێ دیتر: هەر چار پارچە ئێك دلێ پێ ناوەستی.

(٧) ل جهەکێ دیتر: ئارمانج ئێکە و زمان ئێکە ب درستی.

(٨) ل جهەکێ دیتر: گەلی کوردا ڕابن دەینن سنۆرا.

(٩) ل جهەکێ دیتر: پارێزن خاکا شرین دورمان دورا.

ڕوح و جــانێ مــە گــۆری تــە کوردســـتان[١]
ســەر و مــال دێ بــین زنجیــر دۆرمــان دورە[٢]

نــــەورۆز ســــەرهلدانــــە ئــــازادی بــــاری
کــەیـف و شــاهی و گۆڤــەنـدا کــوردا ل واری
مــە بخوینــا شــەهیـدێن خـۆ[٣] بــەرهــەم خــواری
ســـەر کـــاروانێ بـــابێ مـــەزن[٤] مللـــەت داری

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ڕوح و جانێ گوری تە کین کوردستان.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئەم کۆمارین دوژمنداریێ مە زۆرە.

[٣] ل جهەکێ دیتر: نەمر.

[٤] مەلا مستەفا بارزانی.

## نەورۆز

نـــــەورۆز هاتـــــە ب گولاڤـــــە[١]
چوونـــــە[٢] ليفـــــێ و شـــــيناڤا[٣]
ســـــەيـــران خۆشـــن ل شـــەرانشـــێ
ل كـــەشـــانێ[٤] ل بـــەر وان ئاڤـــان[٥]

نـــــەورۆزە جـــــەژن و ســـــەر ســـــال
بيرهـــاتنێ ســـاخ دكـــين هـــەر ســـال
ل بيســـــت و ئێكـــــێ ل ئـــــادارێ[٦]
ل كـــــــوردا ديرۆكـــــــا دەلال[٧]

نـــــەورۆز جـــــەژنـــا نـــــەتـــــەوى
ئـــــازادى تێـــــدا[٨] خـــــــەوى
قورتـــــال بـــــين ژ بنـــــدەســـــتى
پـــــــەرێ زۆردارێ تـــــــەوى

---

[١] ل جهەكێ ديتر: سەيرانڤە.

[٢] ل جهەكێ ديتر: ئەم چوون.

[٣] هەر دوو گوندێن لێفێ و شيناڤا سەر ب دەڤەرا سلێڤانەيانڤەنە.

[٤] كەشان، گوندەكە سەر ب دەڤەرا گوليانڤەيە.

[٥] ل جهەكێ ديتر: كەشانێ بەر وان ئاڤا.

[٦] ل جهەكێ ديتر: بيست و ئێكێ ئادارێ.

[٧] ل جهەكێ ديتر: ديرۆكا كوردين دەلال.

[٨] ل جهەكێ ديتر: ئازادى ل كوردا.

نـــــەورۆز جـــــەژنـــــا كوردانـــــە
هـــەر چـــار پارچـــە ب ســـەمانـــە[١]
دەولـــــــەت ئارمانجـــــــا وانـــــــە
كوردســـــــتان يـــــا ب خودانـــــــە[٢]

[١] ل جهەكێ ديتر: هەر چوار پارچە ب سەمانە؛چار پارچە لێ شەهيانە.

[٢] ل جهەكێ ديتر: مللەت نە بێ خودانە.

## نەورۆز

جەژنا نەتەوی نەورۆزێ
شرین ڕۆژێ ل مە[١] پیرۆزێ
کاوەی ئازادکر گەلێ ژار
ژ دەستێن زۆردارا ل ڤێ ڕۆژێ

کاوەی ل ڤێ ڕۆژێ کر خەبات
ئازادی بۆ مە[٢] کر خەلات
بێ کەیف و شاهی ل تە وەلات
وارێ ژێهاتێ[٣] ڕۆژهەلات

نەورۆز بویکا سەرهلدانێ
جەژن و سەرسالا کوردانێ
ل ڤێ بەهارا[٤] ب خەمل و ڕەنگینێ
مێژوو خەملاند ب تێکوشانێ

هەر چوار پارچا ئەم برانە
ناڤ مە گۆڤەندە و دیلانە
نەورۆزێ ئاگر نیشانە
دەولەت ئارمانجا کوردانە

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ل کوردا ب مبارەك.

[٢] ل جهەکێ دیتر: کاوەی ئازادی.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ل کوردا نەوروزێ.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ل گەل بەهارەك.

# نەورۆز

بویرهاتنێت مە هەزارن
کورد ل جەژنێ ئەڤیندارن
نەورۆز بویکە و کاوە زاڤا
مللەت ل شاهیێ بەشدارن

نەورۆز ژینە و سەرهلدانە
جەژن و سەرسالا کوردانە
وار خەملی و لێ سەیرانە
ل ناڤمە گۆڤەندە و دیلانە

قەفتێن گولا و پیرۆزباهی
بۆ هەر چوار پارچا ب تەباهی
کاوەی مزگینی دا کوردا
وی چەسپاند ئاشتی و تەناهی

هلکن شەمال و خەتیرا
ئاگرا هلکن سەرێ زویرا
هات جەژنا باب و باپیرا
بویرهاتنە و مە هەر ل بویرا

# نەورۆز[1]

جەژن و سەرسالێ نەورۆزێ
ل کوردا بویرهاتن پیرۆزێ
هلکن شەمالا و خەتیرا[2]
نیشانا گەشبینا دۆزێ[3]

کاوەی دەست و زەند وی هلدان
زۆردار کوشتن ل گەل نەمەردان
کوترێن ئازادیێ فڕدان
دەینان سەر چیاییێن کوردان[4]

نەورۆز هاتی ب پیرۆزباهی[5]
ئاشتی چەسپاند و تەناهی[6]
هەر چار پارچێن کوردستانێ[7]
نەورۆزێ شەڤ کر ڕۆناهی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/١/٢٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن، ل جهەکێ دیتر: (٢٠٠٦/٢/١٢).

[2] ل جهەکێ دیتر: فەنەرا.

[3] ل جهەکێ دیتر: کاوەیە ڕێڤنگێ دۆزێ.

[4] ل جهەکێ دیتر: هنداڤ چیاییێن کوردان.

[5] ل جهەکێ دیتر: نەورۆزێ جەژنا بەهارێ.

[6] ل جهەکێ دیتر: ئاشتێ و ئازادی هات خوارێ.

[7] ل جهەکێ دیتر: هەر چوار پارچا ل مە نازدارێ.

ئـــــەم خـــــورت و قيـــــز ســـــەيرانينـــــە
ب جلـــــو بـــــەرگـــــا خـــــەملاندينـــــە
ب كوڤـــــەنـــــد و كـــــەيـــــف شـــــاهينە
ژيـــــۆ كـــــوردا نـــــەورۆز مزگينـــــە[1]

---

[1] ل جهەكێ ديتر: ل جەژنێ مە پيرۆزباهييە.

## نەورۆز[1]

جـــەژنـــا بـــەهـــارێ نـــەورۆزێ
چـــەژن و ســـەر ســـالێ پیـــرۆزێ
كـــاوەی خـــەتیـــرە بلنـــدكر
مزگینـــی دا مـــە[2] ل ڤـــێ ڕۆژێ

نـــەورۆز نـــوی ڕۆژە ل مـــە هـــەلات
ئـــازادی بـــۆ مـــە كـــر خـــەلات
بخوینـــە عـــەگیـــدێن تـــە وەلات
ئیـــرۆ ســـەربـــەســـتین و ئـــازاد

نـــەورۆز تیكوشـــانا مـــەیـــە[3]
مللـــەتـــێ كـــورد ئامـــادەیـــە
هـــەر چـــوار پارچـــە دێ بـــین بـــرا
دەولـــەت بـــین ئارمانجـــا مـــەیـــە

نـــەورۆز د نـــاڤ جـــەژنـــا دە گـــولبی
د مێژوویێـــدە بنـــاڤودەنـــگ بـــی
مـــافێ ڕەوا ل مـــە مـــوكم بـــی
ئـــالا مـــە بـــەرز و بلنـــد بـــی

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٣/٣١)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(2) ل جهەكێ دیتر: ل كوردا بی جەژن.

(3) ل جهەكێ دیتر: نەورۆز هات و جەژنا مەیە.

# نەورۆز[1]

نەورۆز بیکا سەرهلدانا
جەژن و سەرسالا کوردانا
مە ل ئێکدوو کر پیرۆزباهی
دناڤ مەدە شاهی و دیلانا

بیرەوەریا مە ڤەگەرا
ئەم هەر چار پارچەیێن برا
نیشانا ئاشتیێ ئاگرە
خوینا عەگید و نەمرا

کاوێ ئاسنگەر زاڤایە
نەورۆز بیکا دبن پالیایە
بیست و ئێکێ مزگینی هاتا
تولڤەکرنا نەیارایە

ژ ناڤ چوو زەحاکێ دوڕندە
هلکێ شەمالا و ئەلندا
ئالا مە بەرزە و بلندە
ڕزگار بی مللەتێ کوردا

بهار خەملی ڕەنگ و ڕەنگ
نەورۆز هات و جەژنا قەشەنگ[2]
مە ل جیهانێ دا ناڤودەنگ
ئەم مللەتەکین ب هێز و سەنگ

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠١٠/٣/١٤)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) جوان.

پیرۆزبـــاهی بقـــەفتـــێن گـــولا
نـــەورۆز مێـــژووە ل نـــاڤ دلا
ئارمانجـــا مـــە دەولـــەتبوونـــە
مـــە ل دوژمنـــا ڕوح کـــر بـــەلا

ئاهـــا جـــەژنـــە و نـــەورۆزا هـــات
ڕزگـــاری بـــوو مـــە کـــر خـــەلات
بخوینـــــــە دێ پـــــــارێزین وەلات
نـــــەورۆزێ ڕۆژا مـــــە هـــــەلات

# نەورۆز[1]

مەها ئاداری ب دیرۆکە
بیست و ئێکێ نەورۆز بۆکە
کاوێ ئاسنگەر زاڤایە
زەحاک کۆژت[2] ل گەل ڕەشۆکە

فندا هلکن و شەمالا
نەتەویا باب و کالا
بندەستیا چەندین سالا
ئازاد بین جۆتیار و پالا

نەورۆزێ جەژنا بەهارێ
د ناڤ جەژنا دە هلبژارێ
ڕزگاربوونا مللەتێ ژار
کەیفێ و خۆشیێ لێ د بارێ

جەژن و سەرسالێ نەورۆزێ
هەر چار پارچا لێ پیرۆزێ
کاوە بێ ڕێبەرێ دۆزێ
سەرفەراز کرین ڤێ ڕۆژێ

سەرێ چیا ئاگر هلبین
نیشانیا کورد ئێک دلبین
شاهینە و گۆڤەند ل وارێ
نەورۆزێ بتە سەربلندین

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٣/١٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) کۆشت.

نەورۆز تە ئازادی ڤەهاند
مە بۆ تە بەژنا خۆ تەواند
کوردستان مە ب گولا خەملاند
ڤینا تە مە دلی دە چاند

## نەورۆز

نەورۆز شەپالە[١] و ڕەندە
جەژنە و سەرسالا کوردا
هەی بیکا ئازادیێ
کاوەی ب خوینێ قەلەندا

بیست و ئێکێ نەورۆز هات
ڕۆناهی کەتە وەلات
ڕۆژەك نوی ل کوردا هەلات
کاوەی بۆ مە کر خەلات

پێکڤە هلکن ئاگرا[٢]
ل گەل خەتیرا[٣] و چرا
هەر چار پارچێن وەلاتی
ئارمانج ئێکین بین برا[٤]

بیرهاتن ل مە بی شاهی
ل ئێکدوو دکەین پیرۆزباهی
ل دۆزا مە بی ڕۆناهی
ل مە دامەزرا تەناهی

---

[١] ل جهەکێ دیتر: شۆخ.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئەم دێ هلکین ئاگرا.

[٣] ل جهەکێ دیتر: خەتیران.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ئێك ئارمانجین و برا.

# سەرۆکێ مە[1]

دێ پێ بێژین سرۆدە
سەرۆکێ مە مەسعۆدە[2]
ئاخا پیرۆز ئازادکر
پێ ل دەوسا بابێ خۆدە

خیڤەتەک مەزن ڤەدا
کورد هەمی خستنە بلندە
پەرلەمانی بریاردە
ناڤدارکر ئالا کوردا

ب خوینا شەهیدێن نەمر
ئازادی ل مە پەیداکر
ل گەل حکمەتەک پێکهاتی
دەولەتینی ب رێڤەبر

نوی رۆژێ ل مە هەلاتی
سەرۆکەکێ ب خەباتی
تاجا سەرێ وەلاتی
ل مێژوویێ بێ سەرهاتی

---

(١) مەبەست مەسعوود مستەفا بارزانی یە.

(٢) مەسعوود مستەفا بارزانی، سەرکردە و رێبەرێ گەلێ کورد، رۆلەکێ باش د هەر دوو شۆرەشێن ئەیلول (١٩٦١-١٩٧٥)ێ و گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ دا هەبوو، د ناڤبەرا سالێن (٢٠٠٥-٢٠١٧)ێ سەرۆکێ هەرێما کوردستانێ بوو، نوکە وەک مەرجەعێ سیاسیێ کوردان دهێتە هژمارتن.

## ئاخا بارزانێ

ئاخا بارزانێ زێڕه
جهێ خۆشمێر و شێره
ل چل و شەشێ[1] شۆڕەش هات
دیموقرات بێ ناڤ دێره

شازدەی تەباخێ گەشبی
بابێ مەزن ڕێبەر بی
ل بن سها ئالا زەر بی
شێر بی ل چیا گەربی

وی بۆ مە چاندن سێدار
ئیلون و تەباخ و ئادار
ئاڤدان ب خوینا شەهیدا
ئیرۆ مە بەرخوەر ژی خوار

گیانێ خوە وی ل سەردا
مەسعوودی ڕێ نەبەردا
فیدڕالی ل دلی دەردە
ل جیهانێ دۆزێ دەنگدا

---

(١) ل سالا (١٩٤٦)ێ، پارتی دیموکراتی کوردستان هاتبوو دامەزراندن.

# پەرلەمان

پــــەرلـــــەمـــــان هـــــات دامـــــەزرانـــــدن
ئـــــەنـــــدامێن قـــــەنـــــج هـــــەلبـــــژارتن
ل هـــــەولێـــــرا پایتـــــەختـــــێ کـــــوردا
کوچـکـــــا وەزیـــــرا ســـــەربـــــەســـــتن

بریـــــار هـــــاتن دانـــــێ ب تونـــــدی
شـــــلۆڤەکـــــرن پـــــەروەردی
ل ڕۆژنامـــــا جیهـــــانێ خـــــوەنـــــدی
بـــــارزانی پـــــێ ســـــەربلنـــــدی

یـــــەکـــــەمـــــین داخـــــواز ئاشـــــتیە
پاڕاســـــتنا هاولاتیـــــە
پشـــــتەڤانیـــــا پـــــڕۆژا بکـــــن
ئاســـــایش لـــــێ ڕۆناهیـــــە

مـــــافێ شـــــەهیـــــدا بـــــەرچـــــاڤکن
کوردســـــتانێ ئاڤـــــەدانکـــــن
جۆتیـــــار و پـــــالا تـــــەرخـــــانکن
قوتابیـــــا هـــــوین هشـــــیارکن

# ئالا مه

ئالا مه يا چار ڕەنگه
يا هێژايه و قەشەنگه
ناسناما مللەتێ مه
بۆ كوردا بناڤودەنگه

ڕزگار بين ل بن منەتان
نه كێمترين ژ مللەتان
دەولەتا مه كوردستان
خودان ئالا و پەرلەمان

ڤێ ئالا گەلەك شرين
جيهانێ ئەم ناسكرين
مللەتەكين ئاشتيخواز
دێ هەر هەبين نامرين

هەردەم بەرزه ئالا مه
هەبوونه و ناسناما مه
چار پارچا يەكبوونا مه
ئەو نيشانا گەلێ مه

## ئالا مە

دێ بلندکم ئالا خۆ
دێ بەرزکم ناساما خۆ
ئالا ڕەنگین شرینە
دێ ب وێ ناسکم خاکا خۆ

خاکا باب و باپیرا
دیرۆك ژ مێژدا دیرا
ئالای دکم خەتیرە
مە دەولەتبوون ل بیرە

# ئالا کوردا

ل رێڤەبەریا نالە بەرز بی
بریارا پیرۆز مە بەستبی
ل چەرخێ بیستێ بی مێژوو و دۆز
ل دەولەتینێ ژ مێژا هەستبی

گوفتوگو هاتن ئەنجامدان
سەرخوەبوون مافە بۆ کوردان
بەرهەمێ تەیە سەرهلدان
ب قەلەم و چەك ب خوینا مەردان

کوردۆ رابە چاڤا ڤەکە
بەرەڤانییێ ژ مافێ خوە بکە
وەلات دایکا دلۆڤانە
ژ باب و کال دە هەتا نوکە

تە پارێز زێرێن ئاخێ
لێ قەرزارێ هندی ساخێ
پێش نەکەڤت جهێ داخێ
بۆ ژین نەکێ تو ژێ ناخوێ

# ئاخا زێڕین کوردستان

هەولێر و قامیشلۆ وان
مەهاباتا[1] ناڤ دێران
وارێن باب و باب کالان
لێت[2] ژین جۆتیار و پالان
ئێزدی و فلە و مسلمان
ئاخا زێڕین کوردستان

رێبەرا شاندن کاروان
ل عێراقێ مالا بارزان
ل سۆرێ کورێن بەدرخان
ل ترکا شێخ سەعیدێ پیران
خەباتا قازی ل ئیران
ئاخا زێڕین کوردستان

هەر چار پارچە ل هەڤ مان
بین پێشمەرگێن قەهرەمان
خاك پاراستن ژ دەجالان
شاخ و گر و نەوالان
یان سەربەستی یان نەمان
ئاخا زێڕین کوردستا

---

(1) مەهاباد.

(2) لێ د.

ســــــووند بخوينــــــا شــــــەهيــــــدان

نــــــەبــــــەرديــــــن ڕێبــــــازا وان

پــــــــــارێزين مــــــــــــافێ ڕەوان

دەســـــــتپێك ئيلـــــون[1] و گــــــولان[2]

بيكـــــــێن شــــــۆڕەشــــــێن جــــــوان

ئاخــــــا زێـــــــڕين كوردســــــــتان

---

[1] شۆڕەشا ئەيلول (١٩٦١ ـ١٩٧٥).

[2] شۆڕەشا گولان (١٩٧٦-١٩٨٨).

# دوژمن بزانە کوردم

دوژمن بزانە کوردم
خاکا خۆ ئەز نابەردم
دێ پارێزم جان قوربان
ڕوحێ و جانی دا ل سەردم

سووند ب گوڕا شەهیدا
وان خۆش مێرا و عەگیدا
خوین بدت سەر جوکیدا
تولێ ڤەکین د وەختی دە

دوژمن ئەم خودان دۆزین
ب مێژوو دیرۆک پیرۆزین
ئێ ل سەر تانێ مەدە بێت
دێ ب ئاگری وی سۆژین

دوژمن چاڤێن مە ڤەبین
نامرین دێ هەر هەبین
هەر دێ ل سەر سۆزا خۆبین
کەلەم ببن ل چاڤێن تەبین

# ئەی وەلات

ئەی وەلات و ئەی وەلات
چەند نەخۆشی ب سەردەهات
ژبیرا مە ناچن ئەنفال
ڕۆژێن هەلەبچا میرات

ل هزرا مەیە شێخ سەعید
کا دولەتا مەهاباد
بابێ مەزن بێ شەهید
کوردینی ل دلێ مە چاند

ل مێژرویێ ئەم ڤەکولن
هێژ ژمێرا پێپ[١] شولن
ڤێ دارا رهدا هێلان
بچی ڕوی دوژمن دێ کولن

کوردستان ناڤ شرینە
ل چار پارجا وار زێڕینە
کەرکووك بیکە ب خەملینە
بارزانی بۆ مە بینە

---

(١) پێ ب.

# محەیفا تە بابێ مەزن

بابێ مەزن بی شۆڕەشڤان
سەرکێشی کر ب دلەك کۆڤان
سووندخوار ب ئاخێ لێ بت شڤان
ل ما بێ ڕەوان بی بەڕەڤان
ل چل و شەشێ هزر لێڤەهان
شۆڕەش توندکر وی کر کڤان

بی سەرکردە و دەست دان خەبات
دۆز غەونی ل چار پارچە وەلات
قازی بەرسڤ دا ل مەهاباد
بابێ مەزن ل هاوارێ هات
جهێ داخێ ڕۆژ نە هەلات
کۆمار ڕوخا ب سەرێك دەهات

ل هەر چار پارچا ئالا زەربی
محەیفا تە زوی وەغەربی
مللەت هەمی ل توربێ خڕ بین
ب شین و زیمار خۆلی ب سەربین
چو شاخ نەمان ناڤ ل سەر بی
کا کیش بەربی تو نە ل بەربی

ئیدریسی ژك خاتر خوەستی
مەدو جارا دل ما شکەستی
دوعایەك مە ژ خودای خوەستی

شـێر هـات وەلات چـەكـا ل دەسـتی

جهـێ تـە گـرت وی دۆزا ڕسـتی

ئیـرۆ ئـازادی ل مـەبـەسـتی

# سەرکردە بارزانی

سەرکردە و شۆڕەشگێر ل سۆژێ وەلاتی[1]
ل خەباتێ مێژك زێڕ نوی ڕۆژ لێ هەلاتی[2]
جێگرێ بابەك شێر ل پارتا دیموکرتی[3]
پایتەخت تەکر هەولێر حوکمەتا پێکهاتی[4]

ل جڤاتا وەزیرا ل کوچکا پەرلەمانی[5]
ل مللەتی سەرکێش پیرۆز بت شڤانی[6]
زارۆکێن شەهیدانێ تو بابێ وانی[7]
خوینا وان عەگیدا تویێ دل کۆڤانی[8]

بژیت بابێ مەنسوور ژیەکێ بێ زێدە[9]
ل باکوور و باشوور یەك بین تە ئۆمێدە[1]

---

(١) ل جهەکێ دیتر: سەرکردە و شۆڕەشگێرێ ڤی وەلاتی.

(٢) ل جهەکێ دیتر: جێگرێ بابێ شێرێ تو ب خێرهاتی.

(٣) ل جهەکێ دیتر: هەی ڕێڤەبەرێ پارتا دیمکراتی.

(٤) ل جهەکێ دیتر: پایتەخت تەکر هەولێرا کەلهە دێرین.

(٥) ل جهەکێ دیتر: ل ناڤ جڤاتا وەزیرا ل پەڕلەمانی.

(٦) ل جهەکێ دیتر: تو سەرکێشێ مللەتی لێ شڤانی.

(٧) ل جهەکێ دیتر: زارۆکێ شەهیدا بابێ وانێ.

(٨) ل جهەکێ دیتر: ل خوینا عەگیدێن نەمر دل کۆڤانی.

(٩) ل جهەکێ دیتر: بژیت بابێ مەنسووڕی ل مە پێ خودان، بژیت بابێ مەنسووڕ دێ هەڕە پێش.

کابینـــا ســـی و چـــوار ب ئـــەنجـــام تـــە گـرێـــدان[٢]
دکـــن خزمـــەتـــێ ب گـــوزاری مللـــەت کـــەت خۆشـــێدە[٣]

پالـــــدەرێ ئاشـــــتێ لایـــــەنـــــا هـــــەڤـــــالی
ڕێکـــــا ئـــــازادیێ ســـــتریا تـــــو ژێـــــت مـــــالی
کۆمـــــارەك ســـــەربخـــــۆ ل هـــــەریمـــــێ فیـــــدرالی
کـــاك مـــەســـعوود ســـەرۆکـــێ دەولـــەتـــا خۆمـــالی

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ل باکوور باشووری بۆ تە دەنگدان، ل باکوور و باشوور توێ سەرکیش.

[٢] ل جهەکێ دیتر: کابینا سی و چوارێ تە گرێدان.

[٣] ل جهەکێ دیتر: دکن خزمەتێ ب گوزاری نەمان ئارێش.

## ئاشتی باری

ئاشـــــتی بـــــاری شـــــرین واری
بـــــین ڕۆنـــــاهی ڕۆژێـــــن تـــــاری
پێکڤـــــه دێ ژیـــــن برایـــــەتـــــی
هـــــات هـــــەڕەشـــــاند ســـــەرێ مـــــاری

کـــــورد و عـــــەرەب ئاشـــــتیخوازین
ل ئـــــازادیێ ئێـــــك ڕێبـــــازین
ل خاکـــــا عراقـــــێ شـــــەهنـــــازین
ســـــەر بلنـــــدین ســـــەرفـــــەڕازیـــــن

ڕۆژا نـــــوی یـــــا ل مـــــه هـــــەلاتـــــی
دێ ئاڤـــــەدانکـــــین وەلاتـــــی
خوینـــــا شـــــەهیـــــدا ژبـــــویر نـــــاکین
ب خێـــــرا وان ل مـــــه بـــــاری ئاشـــــتی

ئاخـــــا پیـــــرۆز شـــــاهده دیـــــرۆك
هـــــەولێـــــر و ســـــولەیمـــــانی و دهـــــۆك
مویســـــل دەیکـــــا دوو بـــــەهـــــارا
بویکـــــا دەســـــت بخـــــەنـــــا کـــــەرکـــــۆك

## سەد ئاخ و داخ

سەد ئاخ و داخ دل نەخۆشین  چەند مینن ساخ ئەم ئێك لەشین
ئێك كاروانین پێكڤە د مەشین  نابت جەژنەكێ بگڕنژین

سۆرانی یان بەهدینی  دهوك، هەولێر، سولەیمانی
مەسعوود بت یان تەلەبانی  هەر دوو قوتابیێن بارزانی

بەسە تێرین ژ دەنگێ تەڤا  مەژێ مە چەند هشكە و ڕەقە
هەتا ڕزگاربین ژبەر شەڤا  شنویكا دەینن ئێك دوو بلەقا

محەیڤ ئاگر مە ل هەڤ بەستی  ئۆمێد نە ئەڤە بی مە خوەستی
مە گۆت دێ ژین ب سەربەستی  هەوار نەشكێنن ڤی هەستی

برینێت مە كوردا كویرن  بهێلن ساخبن هێش وێت[1] زویرن
ب هەزارا قوربانی مە دان  دەربەدەری وەنە ل بیرن

بۆچی برا برای بكۆژت  نە مخابن خوین بڕژت
كێ بێت كۆژتن[2] دلت سۆژت  بەس دوژمن ل مە د گڕنژت

ئێدی بەسە برا كوژی  بجڤینن مەشكی و مەژی
ئەم خیارێت ئێك بنێینە  ئەوە ڕەزڤان باشە خۆشكت ژی

مە بڤێت نەڤێت ئێك ئارمانجین  ب زارەكێ شرین و كرمانجین
ل پاش ڕۆژێ ل مافی موحتاجین  ئەم وێت[3] بین كەو ل دوڤێك ناچین

---

(١) بێت.
(٢) كۆشتن.
(٣) بێت.

مە خوین وا ڕێتی ل سەر ئاخێ     مە هێش مێویژ وێ ل مشتاخێ
کوردۆ ژارۆ هاش[1] خۆ هەبە     ب ڕویێ دانا بەرهەمی ناخوێ

دەستا بکن تێکدە براتی     ئاڤەدانکن ڤی وەلاتی
ڕۆژەك گەش وا ل مە هەلاتی     ئاشتێ ل مە نەکن قاتی

دهوی بی جانتە ل ملا بین     پتر دل سۆژێن کوردا بین
نانەك هشك خوارنا مەبی     ل ڕەژیمێ دەرد و بەلابین

عالەم گەهشتن عەزمانە     بخوەندنێ زانین دەرمانە
ل ناڤ مەدە کەرب و دل مانە     تێناگەهین چو ئەزمانە

ئاشتی داخوازا مللەتا     هۆ ئازادبین چەند نەعمەتە
دەستی ب سەرێ ئێك دەینن     دا قورتال بین ژین منەتا

چ زوی مە ژبیرکرن ئەنفال     ب هەزار چوون لاوێن دەلال
حەلەبچا ڕەش ما بێ شینوار     پێنج هەزار کەس خورت و تفال

چی سەبەبە ڤێ لێکدانێ     هێش ئۆمێد مە وا ل مەیدانێ
مە زەند هلدان ل سەرهلدانێ     مە هوین ئینان مە دەنگدانێ

---

(1) هاژ.

# کورد مللەتن

ئەرێ گەلو ما گونەهە
ئەم ژك بگەهین مللەتا
مە گەلەك تەحلی وابری
بندەست كرین بێ مروەتا

داخوازە مە سەرخوەبوونە
فیدرالیێ مە ماپ[1] ڕوونە
خانقین كەركووك و شنگار
شێخانا میرا وارشوونە

مەندلی و حەمرین سنۆرن
گوند و بازێر دورمان دۆرن
ئاخا مە یە دوژمن نەیار
هوین نەشێن ل مە بكهۆرن

تەعریب نەكن ئاخا كوردا
ل مە نوی نەكن كول و دەردا
ژبیر ناكین حەلەبچە و ئەنفال
خوینا وان عەگید و مەردا

---

[1] ما ب.

# سەرۆك

سەرۆكێ هێژا و خۆشتڤی
تو ژ دلێ مە دەرناكەڤی
پێتڤی رێز و تەقدیر
ل هەمی داستانا بەرهەڤی

سەرۆك گولا باغێ بارزان
دلدارێ گەل و نیشتیمانی
پیشمەرگێ ئیلول و گولان
هەلگرێ ئالای كوردستان

ل ژێر كاودانێت تێكوشانێ
سەرۆك تە چاڤ دان جیهانێ
گول شینبین ل ئاخا بارزانێ
ب شۆڕەشا هاتێ ئاڤدانێ

ژ باغێ بارزانی گولا زەر
كورێ شێرێ ئاسن جەگەر
برایێ ئدریسێ هزر جوان
سەركردە و ل گوردا مەفەر

زانا ژ قوتابخانا بابێ
مللەت فەند و دێ چرابێ
ل زارۆكێت شەهیدا بابێ
ل هەر چار پارچا ل ناڤ دلا بێ

# وارێ من

وارێ من هەی ئاخا شرین
دایکا من مللەتێ دێرین
ڤینا تە یا د دلێ مەدە
رێز و تەقدیر د گرین

ل هنداڤی مە تو خیڤەتێ
سەمیان ل هاوارا مەتێ
ل بەر دلێ مە پڕ هەیبەتێ
ئەم ژ تە دویر بین گریا مە تێ

ئەڤیندارێت ئاخێنە و وار
ڤین و ژینا مەنە شوینوار
ژیار بی ل باب و باپیرا
ل سەر تە مە نان ب خوینێ خوار

گۆری تە بین وارێ دەلال
ڤان کویستانا و کانیێت زەلال
ل باغچا گول بەیبین و هەلال
مێرگ و چیمەن و چاییێن خۆمال

## دهۆك

دهـــــــــــۆكێ جـــــــــوانێ
ڤـــــــــين ژيــــــــــانێ
وارێ داســــــــــــــــــنيا
بـــــــــاب وكـــــــــالانێ

بويكـــــــــــا وەلاتــــــــــــى
ل كـــــــوردا خــــــەلاتــــــى
ڕۆژێ و هــــــــــــەلاتــــــــــى
گـــــــــــولا ژێ هــــــــــاتێ

ســـــــــنجەقـــــا شـــــــــارا
وارێ ديلــــــــــــــــــــــدارا
ب چيــــــــا ناڤــــــــــــدارا
مــــــــەتـــــــين و گــــــــارا

دهــــــــــــۆك شــــــــــــــرينە
شـــــــــەكــــــر و هنگڤينـــــــــە
ڕەوشـــــــــــا بــــــــــەهدينـــــــــە
ديــــــــــــرۆك زێڕينـــــــــــــــــە

# خاكێ پیرۆز[١]

هەولێرە پایتەختێ كوردان
شارێ عەگیدانە و مەردان
بیكا بەهدینایە و سۆران
بابێ مەزن لێ بی خودان

مەهاباتا[٢] ب خاكڤە زێڕین
شارێ قازی خەمل دێرین
ئەگەر ل مێژوویێ بزڤڕین
دلێ كوردا بكۆلە و برین

ئامەدا جوان شۆڕەش گێران
سەركردە بی سەعید پیران
توركا ڕێبەر ل سێدارەدان
ئامەدە لاندارا شێران

دێرك و قامشلۆ و عەفرین
مللەتی لێكر ڕاپەرین
دۆزا كوردا ل وان ما شرین
مافێ ڕەوا خەملاند بخوین

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٨/١/٣)ێ، ل باژێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] مهاباد.

## بەرپرسینۆ[1]

بەرپرسینۆ دڤێت بزانن    ئەگەر سەرکێشێن کوردانن
کیە برسی و کا کی تێرە    ئەگەر ڕاستە هوین شڤانن

ل تێرێن حال خۆش دکن خودانی    ژار وێ د مرن ژ بێ خودانی
ژارا ل ئاخێ دان قوربانی    دەربەدەری و مال وێرانی

چەند کەسا شێلاندن کانی    ڕویڤیا ل شێرا دەوس هلانی
کا چەپەرێن وان شکاندین    ب خێرا ژارا وێ دخون نانی

کا ل کێ کرنە بەرەڤانی    نە هوسانە دلوڤانی
ئەگەر ئاگر بەربی خانی    فەیدە ناکت پەشێمانی

ب هەزارەها کورد وێ د ڕەڤن    ل ناڤ بیانیا ڕۆژ لێ شەڤن

نە موخابن وار مان ڤالە    کا ڕەوشەم بیر جۆتیار و پالە
حەیفا کێنجا وان دەلالە    سەرکەفتن خەم و خەیالە

بەرسڤ ژ پرسێ دیارە    بەرپرسا مللەت دان پارە
ب قەسر و قوسیر و سەیارە    ل فەقیرا دلبرین دارە

دەرفەت زێڕین بی و گول گەشبین    جارەك دی دێ بینن هشك بین
وە فەقیر پالدان بۆ مرنێ    وە ئەم هێلان لەو بندەست بین

کێم و کاسی ب وە خوەش بین    لەو مللەتی دل ژ وە ڕەش بین
خوینمێژ ل مللەتی زۆربین    ئەم فرۆتن ژ پارا تێر بین

---

[1] ل جهەکێ دیتر: بەرپرسین و دڤێت بزانین.

دوهی بی جانتە ل ملا بین      نانەك هشك د بنی دابین
زكەك تێر و دەهێن برسی      پتر دل سۆژێن كوردا بین

ل دوژمنا دەرد و بەلا بین      هەر ئەم ئەوین لێڤە نابین
كشت مللەتا ماف دیار بین      ئەم پاشڤەمان و تەنا نابین

كەلەخ كەتن تەیر مشە بین      ئەرێ گەلۆ هوین ل كویڤە بین
كورد ل ناڤ ئاگری دسۆتن      كی بەرپرسی خەم بۆ هەبین

هوین ل تەناهیا د لەیزین      پاریەك زۆر دەرمالە بین
نە ترس نە برس نە مال وێران      ناڤ بۆ وە ما و ئەم بەرزەبین

ئیرۆ چاڤێن كوردا ڤەبین      دێ بین كەلەم ل چاڤێن وە بین
مە پەیداكر ئازادی ب خوین      ل حەلەبچە و ئەنفالێن ڕەش بین
كەسەك ژ وە ل ناڤ مە نەبین      مە كر و هوین وێ پێ دكن ژین

د سەرە وێ دكن خەلەتیا      لێ نا پرسن كا ئەو كینە
دویڤ چون بۆ ڤێ چەندێ نینە      زێدە كاڤا چو دل نینە

مە ژین بووراند ب تەنگەزاری      ل وە ڕۆژهەلات ل مە بی تاری
دێ ژ وە خوازین هاریكاری      مە پاشڤە دبن ب شەهمزاری

دێ مەجبوور بین یان دێ ڕەڤن      یان دێ ژ برسا مرن ل واری
نە هوسانە كوردەواری      وە ئیسانی دا ب دولاری

# بابێ هێرشی[1]

خــــۆ ل ب نــــاڤێ شـــــەهیـــدەك هێژایــــە
موحـــەمـــەدێ شـــەفیـــق ســـەعدولایـــە
کوردپـــەروەربـــی ل بیـــرا مـــە هـــەمیایـــە
خــــەباتـــا وی هــــەردەم پـــێش چاڤایــــە

ئـــەم پـــێ ســـەربلنـــدین و شــــانازین
بـــۆ وی بـــەهشـــتێ ژ خـــودای دخــــازین
ب تێکوشـــانا وی ئـــەم ســـەرفـــەڕازیـــن
ســـۆزدارین پشـــتی وی لـــێ ب ڕێبـــازین

مــە خــۆ ل دامــەزرانــد ب نــاڤێ شــەهیــدی
بــابێ هێرشــی خــۆش مێــری و عــەگیــدی
گیــانێ خــو ژ دەســتدا ســەر خاکــا پیــرۆز
دلـــێ مـــەدە هـــەر دێ مینـــت زینـــدی

ســەد ئــاخ و داخ بــۆ تــە ئــەی فــەلــەکــێ
کــێ گــۆت دەلالــی ل مــە هنــدا بکــێ
بــەس بــۆ مــە ب تنــێ تــو یــا چــەلــەنگــێ
گــری و ڕۆنــدکا بــەهــرا مــە بکــێ

ڕەحمـــەت ل گـــۆڕا بـــابێ هێرشـــی
مــە بنــاڤێ وی خــۆ ل ڤــەکــر یــا وەرزشــی
بهاریکاریــــا هــــەڤــــال و دۆســــتا
دێ خــول پــێش کــەڤــت بشــادی و خۆشــی

---

[1] موحەمەد شەفیق سەعدوڵلا زاخۆیی ناڤدار ب (بابێ هێرشی).

کــــورێ خـــابیرێ زاخۆکـــا شـــەپـــال
رێـــز و حۆرمـــەت بـــۆ تـــە ژ پـــرا دەلال
ئـەم قـەد تـە ژبیـر نـاکن چـەند بوورن سـال
ب تــازی و زیمــارن خــر دۆســت و هــەڤــال

# شەهیدان

ڕێزگرتن بۆ شەهیدانە
ئازادی بەرهەمێ وانە
خاك پاراستن ب خوینا پیرۆز
ڕەحمەت ل توری و گوڕانە

خورتا سینك دان تیكوشانێ
ئارمانجا مە دڤێت گەهانێ
دۆز بەلاڤبی ل ناڤ جیهانێ
شەهید تیرۆژكن ل ژیانێ

سەركردێ كاروانی كیە
بابێ مەزن بارزانییە
ل گەل ئدریسی هەردەم زێندی
ب وان سەربەرزین ئازادیە

شەهید نەمرێ و نامرێ
ناڤ ل دیرۆكێ ئاگرێ
ژ هەمی پەیڤا مەسترێ
دەم ل دەمی هلگرێ

## دەنگدان مافە[1]

بیســت و پێنجـــێ حــەفــت ژڤانـــە
بـــەرهـــەڤــبن پێکڤـــە دەنگدانـــە
پـــــەرلـــــەمـــــانی هلبژێـــــرن
پێنجـــی و چـــار لیســـتا کوردانـــە

شـــــار و گونـــــدێت کوردســـــتانێ
دل خـــــــۆش ڕۆژا دەنگـــــــدانێ
ســـــەربلنـــــدین ب تێکوشـــــانێ
کوردســـــتان بــــەرز بـــی ل جیهـــانێ

دەنگـــــــی بـــــده ب شـــــانازی
ب ئـــــازادی و ســـــــەرفــــەڕازی
مـــــافێ شــــەهیـــدێت نــــەمـــرن
دەنگـــــا بـــــدن بـــێ جیـــــاوازی

هـــــەبوونـــا مـــــە دەنگـــێ تـــەیـــە
چـــەنـــد پـــێش بکـــەڤــن هــەر بـــوو مـــەیـــە
کـــورد و دەنگـــدان ئـــەرکـــێ تـــەیـــە
کوردســـــتان وەلاتـــــێ مــــــەیـــــە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٦/٣٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# دیاربەکر

دیاربەکر زۆزانە
پایتەختێ مە کوردانە
سونبلا کوردینیێ
تانجا سەرێ شارانە

دیاربەکر بەهشتە
دور[1] جیانە و هەم دەڤ تە
شۆڕەشگێرا یا مشتە
بۆ هەر چار[2] پارچا پشتە

دیاربەکر شرینە
خودان کەلهەك دێرینە
تەڤ کورد لێ ئاکنجینە
خەم خۆرێت ملەتینە

سەیرانە دیاربەکر
یا خۆشە و یا دلڤەکەر
مە قەستا شارێ خۆکر
کونبتەك مە تێدا کر

---

(1) ل جهەکێ دیتر: دورمان.

(2) ل جهەکێ دیتر: چوار.

## دوژمن کوردین

دوژمن کوردین ئەم ئارینە
خەباتکەرێن مللەتینە
گەنجین خورتین ئەم خوین گەرمین
پێشمەرگەنە و گلێرینە

سویند خارینە ب پەیمان و سۆز
دێ پارێزین خاکا پیرۆز
تیکوشانێ نابەردین دۆز
تا بین دەولەت نێزیک بی ڕۆژ

هەر چار پارچا دی دەین مزگین
ئیرۆ بەرز بی ئالا ڕەنگین
کوردین دەستا دێ کەین تێکدا
ئێک وەلاتین ئەم وێ لێ دژین

سەربەخۆنە و ئازادیە
مافێ ڕەوا پاڕاستیە
ئارمانج دەولەتا کوردیە
دوژمن خاکا مە بخۆیە

# ١٦ی تەباخێ[1]

١٦ی تـــەبـــاخ جـــوان داســـتانە
بیـــــرەوەریـــا مـــە کوردانـــە
تێکۆشـــــانا عـــــەگیدانـــــە
ڕیبـــــازا گشـــــت پارتیزانـــــە

بـــــابێ ڕوحـــــی ڕێبـــــەری کـــــر
چریســـــکا شـــــۆڕەشـــــێ هلکـــــر
ســـەرێ مـــە کـــوردا[2] بلنـــد کـــر
ئـــــازادی بـــــۆ مـــــە دابـــــین کـــــر

١٦ی تـــــەباخـــــا تێکۆشـــــەر
پـــارتی زانـــا خـــوین[3] دەینـــان ســـەر
بـزەنـد و باسـکێن چـاك خـۆش مێـرا
شـــۆڕەش کـــرن فنـــد و فـــەنـــەر

مللـــــەتـــــێ کـــــورد ئامـــــادەیـــــە
دەولـــــەتبـــــوون ئارمانجـــــا مـــــەیـــــە
کـــاك مـــەســـعوود ســـەرۆکـــێ مـــەیـــە
ئـــــەو تانجـــــا ســـــەر ســـــەرێ مـــــەیـــــە

---

[1] (١٦)ی تەباخا سالا (١٩٤٦)ێ ڕۆژا دامەزراندنا پارتی دیموکراتێ کوردستانە.

[2] ل جهەکێ دیتر: سەرێ گەلێ مە.

[3] ل جهەکێ دیتر: پارتیزانا مەرگ.

١٦ی تـــەبـــاخ ل مـــە بـــی خـــودان
خـــۆ د چـــەمیـــنن ژبـــۆ شـــەهیـــدان
دارا ئــــــازادیێ بــــــەرهــــــەم دا
ئـــەی کوردســـتان دایکـــا کـــوردان

هـــــەر چـــــار پارچـــــا ئـــــەم بـــــین بـــــرا
ئاخـــــا شـــــرین ڕۆهنبـــــی ب چـــــرا
ئـــــەم ژبیـــــر نـــــاکین خـــــەباتکـــــەرا
بنکاریـــــا بـــــابێ نـــــەمـــــره[1]

---

[1] مەلا مستەفا بارزانی.

# ١٦ى تەباخێ[١]

مــەهــا تــەبــاخێ ل مــە هــەلات
شـــــۆڕەش ل ١٦ بـــــى[٢] خــــــەلات
ب زەنــد و بــەنــدێن وان عــەگـيـدان [٣]
بــين ئـــاخ پـــەرێســـێن تـــە وەلات[٤]

پيشــمەرگـێن مــە[٥] چــەپــەر گــرتن
تـــەفـــەنـــگ بڕنـــو وان هلـگـــرتن
بـــەرســـينگێ[٦] نـــەيـــارا گـــرتن
ژ ئاخـــا پيـــرۆز وان[٧] دەرخســـتن

ئـــەى شـــۆڕەشـــا شـــەنـــگ و[٨] دێـــرين
تـــە ل[٩] كـــوردا ســـاخ كـــرن بـــرين
بـــابێ مـــــەزن ڕێبـــەرى كـــــر
هـــزار ڕەحمـــــەت[١٠] ل تورپـــا زێـــڕين

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتى (٢٠٠٦/٨/١٥)ێ، هاتيە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەكێ ديتر: ل ١٦ شۆڕەشێ بى.

[٣] ل جهەكێ ديتر: ب زەند و بەندێن عەگيدا.

[٤] ل جهەكێ ديتر: بين ئاخ پەرێسێن وەلات.

[٥] ل جهەكێ ديتر: دلێرا.

[٦] ل جهەكێ ديتر: ڕێك ل نەيارا.

[٧] ل جهەكێ ديتر: ژ وارێ شرين.

[٨] ل جهەكێ ديتر: ئەو شۆڕەشا ناڤ.

[٩] ل جهەكێ ديتر: ل.

[١٠] ل جهەكێ ديتر: ڕەحمەت.

ئەی پارتی[١] زانێ نەتەوی
تو نەمری[٢] ل هزرا مەی
دیرۆکێدا سەرکردەی[٣]
مەسعوود ل ڕێبازێ خوەی

داستانا ١٦ی تەباخێ
بیرەوەریێ ل دلا ساخێ
مە کوردا خوین ڕشت سەر ئاخێ
کورد و ئازادیێ ب داخێ

---

(١) ل جهەکێ دیتر: پارتی.

(٢) ل جهەکێ دیتر: نەمری.

(٣) ل جهەکێ دیتر: مێژوو و دیرۆك هەر توی.

# ١١ى ئيلونێ[١]

١١ى ئيلـــــون تێـــــر[٢] مــــرازه
شـــــۆڕەشـــا پێشـــــکەفتنخـــوازه
ل [٣]ئارمـــانجێ کـــورد ســـەرفـــرازبين
ئـــالا[٤] و دەولـــەتبـــوون داخـــوازه

بـــابێ نـــــەتــــەوەى بـــارزانى[٥]
قوتابخانـــــا مــــــه کــــــوردانى
مامۆســــتا بـــى و شـــۆڕەشـــڤانى
ل ئـــاخێ تـــەکـــر[٦] بـــەڕەڤـــانى

ل گـــەل ئيدرێســـى زينـــدو و ســـاخ
ب ڕوحـــێ و جـــانى پاڕاســـتن ئـــاخ
بخێرهـــاتێ[٧] شـــۆڕەشـــا مـــەزن[٨]
بيرهـــــاتن دێ مينــــتن ســــاخ

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتى (٢٠٠٦/٩/١١)ێ، هاتيە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەکێ ديتر: ئەو.

[٣] ل جهەکێ ديتر: ب.

[٤] ل جهەکێ ديتر: ب ئالا.

[٥] ل جهەکێ ديتر: ئەى بابێ نەمر بارزانى.

[٦] ل جهەکێ ديتر: ل ئاخا پيرۆز،

[٧] ل جهەکێ ديتر: ب خێر بێتن.

[٨] ل جهەکێ ديتر: بلا بخێر بێت ١١ى ئەيلول.

١١ى ئيلون خۆزيا كوردا
دار بى ل ئازاديێ بەرهەمدا[١]
ب خوينا شەهيدا هات ئاڤدا[٢]
ئەم كورد ئازادكرين ژ دەردا

ڤێ بيرەوەريێ دێ ساخكين
شۆڕەشا مەزن ژبير ناكين
خەباتێ ب پينوسى كار كين[٣]
دا مللەتى ئاڤەدان[٤] كين

گەلى كوردا هلۆن ڕابن
دەستا بكن تێكدا و برابن
خۆشى بێ قوربانى نابن
چو جارا[٥] كورد ژێكڤە نابن

وەلاتێ خۆ دێ خەملينين
نێرگزا ب گولا ئالينين
ئالا ڕەنگين بەرز دێ بينين
دلێ نەيارا د حەلينين

بلا هەر بێژت جبۆرى
مالكى بلويرت وەك گۆرى
سەر دفنا وان دێ بين دەولەت
ئالا وان[١] ڕاناكين ب زۆرى

---

[١] ل جهەكێ ديتر: دارا ئازاديێ بەرهەمدا.

[٢] ل جهەكێ ديتر: ب خوينا عەگيدان و مەردا.

[٣] ل جهەكێ ديتر: تێكوشانێ ب خەباتكار كين.

[٤] ل جهەكێ ديتر: دا مللەتێ خۆئاڤا.

[٥] ل جهەكێ ديتر: چو جارا ئەم.

ل بـــن ئـــالايێ كـــورد قـــەلانـــدن
كێميـــا ل مللـــــەتـــى بارانـــــدن
ئـــەنفـــالێن ڕەش ئـــەم هـــەژانـــدن
دل ڕەشـــى د نـــاڤ مـــەدا[٢] چانـــدن

بـــلا چاڤێـــت خـــۆ ئـــەو ڤـــەكـــن
چـــەنـد ســـەر هشـــكن و مـــەژى ڕەقـــن
مێـــــــژوو پاشـــــــڤە نـــــــازفڕت
ب ئێـــك بريـــار دێ خـــۆ ژ وان ڤـــەكـــن

صـــەدام چـــوو دێ بـــن دويڤـــەلانـــك
فـــەيـــدە ناكـــت مـــر تـــەيمورلانـــك[٣]
ديســـا دڤـــێن جاشـــا كورتـــان كـــن
دا ل كـــوردا خـــرابكن عـــەلانـــك

١١ى ئيلـــــون هاتـــــە ب گـــــولاڤ
دنـــاڤ داســـتانا دا گـــەش بـــى نـــاڤ
شـــۆڕەشـــێ ل مـــە ڤـــەكـــرن چـــاڤ
هـــــــزار پيرۆزبـــــــاهى و ســــــلاڤ

---

[١] ل جهەكێ ديتر: وە.

[٢] ل جهەكێ ديتر: برا كوژى ل ناڤ مە.

[٣] تيمورلەنگ (تيمورلانك) (١٣٧٠ ـ١٤٠٥ز) دامەزرێنەرێ دەولەتا تيموريان.

## ئەم كوردین

ئــــەم كــــورد مللــــەتــــەك ئارینــــە
خــــــودان ڕەوشــــــتەك دێرینــــــە

دیمــــەن و سرۆشـــــت[(١)] خـــــەملینـــــە
ب دۆل و برجیـــــا و فــــەراشـــــینە

مـــە وارێـــن[(٢)] بـــەهشـــتا بـــەرینـــە
د بـــــاب و كـــــال دە ئاكنجینـــــە

ب تیكوشـــــانێ مـــــە نـــاڤ ئینـــــە
ل دویـــــــڤ ڕێبـــــازا بارزانینـــــــە

هنـــدی ســـاخ بـــین ئـــەم پارتینـــە
ئـــــاخ پـــــەرێســـــێن ڤـــــێ وارینـــــە

خزمـــــەتكـــــارێن مللـــــەتینـــــە
د بـــــەرجـــــەوەنـــــدا[(٣)] وەلاتینـــــە

كوردســــــتانا [(٤)] خـــــاك زێڕینـــــە
ئـــــاخ[(٥)] ل مـــــە كـــــوردا شـــــرینە

---

(١) ل جهەكێ دیتر: ب دیمەنن شرۆشتەك.

(٢) ل جهەكێ دیتر: مە وار.

(٣) بەرژەوندا.

(٤) ل جهەكێ دیتر: مە كوردستانا.

(٥) ل جهەكێ دیتر: خاك.

ئارمانج دەولەتا کوردینە

ب سەرکردەنە ل مە بخوینە[1]

خودان مافەکێ هەژینە

ئالا مە بەرزە و ڕەنگینە

چاك[2] عەگیدن خاك مێرینە

شەهیدێن مە بەهشتینە

پێشمەرگێت مە فیدائینە[3]

زێرەڤانێت سنۆرینە

چاڤێت وان هەردەم ڤەبینە

ئەم کوردین کورستانینە

ب ژن و مێرڤە ئەم گۆرینە

قەد نامرن و نە مرینە

دوژمنا وار ل ناڤ مە نینە[4]

---

[1] ل جهەکێ دیتر: ب سەرکردەیەك نەتەوەینە.

[2] ل جهەکێ دیتر: ئەم.

[3] ل جهەکێ دیتر: پێشمەرگەنە و گلێرینە.

[4] ل جهەکێ دیتر: دوژمنا وان چو وار نینە.

# ئاكرێ

ئاكرێ گولا شارایه
شارێ قەنج و مەردایه
ب كویستان و فەڕاشینه
سەیرانگەها دلایه

ئاكرا من شرین واره
ژ دیمەنا هلبژاره
یا ب نێرگزا ناڤداره
بێنڤەدانا دلدارا

ئاكرێ ڕوحا دلا
ب ڕەز و چیمەن و گولا
دگەل ئاوازێن بلبلا
ژ جوانێ بەهار ژێ نسلا

# ئارمانجا کوردا کۆمارە

ئەرێ گەلۆ ما گونەهە　ئەم کورد بێن ڕێزا مللەتان
خودان مافین وەلات پەروەر　دا ڕزگار بین ژبن منەتان

فیدڕالی مافێ ڕەوایە　ب خێرا خوینا شەهیدانە
بۆ هەر چار پارچێن کوردانە　کیش واری بن کورد برانە

ئێک ئارمانجن ئەم ئێک دلن　ل ناڤ جیهانێ ئەم هەر گولن
زێرەڤانێن وەلاتینە　دەستا ل دوژمنا دێ بڕن

دێ ئاڤەدانکین وەلاتی　ئیرۆ ڕۆژ یا ل مە هەلاتی
ب هاریکاری و دەستهەلاتی　دێ پارێزین ڤی خەلاتی

ئەی دلسۆژێن ڤی وەلاتی　ئێدی بەسە خولامەتی
دەستا بکن تێکدا ب براتی　پارێزن خاکا ژێهاتی

مللەت چوون سەر هەیڤێ و ستێرا　پێشکەڤتن یا د زانینێڕە
نە محەیف بین پالێن پویشی　مە نیشتمان زیڤ و زێڕە

ل چوار وەلاتا ئەم بەلاڤین　ل دلێ ڕۆژهەلاتا ناڤین
ب ئێک زمانی وێ د ئاخڤین　هەتا کەنگی ئەم دێ نڤین

کوردۆ ڕابن ژ خەوا گران　چاڤا ڤەکن بن زێرەڤان
دەرفەت زێڕینە و ژ دەست نەدەن　کۆمارە ئارمانجا کوردان

بلا بەرز بت ئالا ڕەنگین　هەر پێنج بارێن گەهێن دێرین
سنور ب شنگال و چیایێ حەمرین　هەتا مەندەلی و خانەقین

## ئەم پارتینە

ئـــەم پارتینـــە ل دیـــڤ ڕێبـــازا بارزانینـــە
کـورد پـەروەریـن ئـەم قـەرزارێت ڤـێ خاکینـە
دەنـك بـۆ لیسـتا پێنجـی و چـار و ژمـارە دوازدە
ڕامـان پـێ هـەبوونـا مـەیـە و خـۆش مزگینـە
ئـەم پالـدەرێـت ڕۆژا گـەش یـا[1] مللـەتینـە
ژ نوو مێرڤە پالە و جۆتیار پێکڤە ب هیڤینە
ئانـــدەزیـــارێن ڕەوشـــەنبیـــرین قوتابینـــە
دێ پـەرلـەمان خزمـەتکار بـت ل هـەمـی چینـا
مەسعوود سەرۆکە و سەروەرە و کەس دی نینە
دەنگـدان بـۆ مـافێ شـەهیـدێت ڤـی وارینـە
بـەرهـەمـێ خینـا وان مـە سـەرکـەفتن ئینـا
ئارمانجـا مـە سـەرخـوەبوونـە و دەولـەتبوونـە
داخـــــازا مـــــە ئازادیـــــە و گرنژینـــــە
ئـەی کوردینـۆ دەسـتا بکـن تێکـدا براتـی
خزمـــەتکـــارین دا ئاڤـــەدانکـــین[2] وەلاتـــی
یـــەکـــەتیـــا نیشـــتمانی ل گـــەل پـــارتی
ئەم دێ بین ستری و کەلەم ل چاڤێت دوژمنینە
دێ پـــارێزین مـــافێ ڕەوا ڕۆژ یـــا هـــاتی
قوتـــابیێن بـــابێ مـــەزن بارزانینـــە

[1] ل جهەکێ دیتر: بۆ.

[2] ل جهەکێ دیتر: ئاڤەدانکن.

بــلا پشتڕاســت بــت مللــەت ســەرکــەفتینــە
هــەڤــالینۆ کوردســتان چــەنــد یــا شــرینە
خــاك پــەرســن ژ نــەتــەویڤــە ئــەم ئارینــە

# زاخۆكا من[1]

زاخۆكا من ڕەند و جوانێ
تو ب خابیرڤە ڕوح و جانێ
سنجەقا شارا هەمیانێ
بەهشتێ خۆشیا دلانێ

وارگەهێ باب و كالانێ
ب پرا دەلال دیرۆكڤانێ
ب ئاشێ جەمی گولستانێ
ل بەهارا بویكا نیسانێ

خەمل و ڕەوشا بەهدینانێ
ب هاڤین گەهێ ل بێهنڤەدانێ
خۆشیا شەرانشێ و كەشانێ
شكەفتا بهێرێ و لێڤانێ

ل بێتاسێ و كانیا بێزالێ
ئەم چون شیناڤا سەیرانێ
دوو كەزیێن تە ل سەر ملانێ
چیایێ سپی و خامتیر حەیرانێ

د مێژوو دە وارەك بەیانێ
ل جویدێ مرادا جویرانێ
باب و كال دە ل مە ب ژیانێ
شارێ جۆتیارا و پالانێ

[1] تەڤایا ئەو دەڤەرێن د ئەڤێ هەلبەستێدا هاتین سەر ب دەڤەرا زاخۆڤەینە.

وەرن زاخۆ ل کوردستانێ
مەیز بکن ڕەوشا جیهانێ
یێ ئێك جار بێت سەرەدانێ
دێ کۆڤان بت ل ڤەگەرانێ

# زاخۆکا من[1]

زاخۆکا من بیکا شارا
د باب و کالدە کەڤنە وارە[2]
سنجەقا شارێن بەهەدینا
ب پرا دەلال یا ناڤدارە
زاخۆکا من

سلاڤ ژ جویدی و خامتویری
ژ جیایێ سپی و خابیری
بۆ تە ئەی زاخۆکا ڕەنگین
شار هێژایێ مە تولبویری
زاخۆکا من

زاخۆ بیکا مە بەهەدینا
ب هاڤینگەهێن پڕ هەژینە
کەشان و شەرانش و بهێر
ل شیناڤا سەیرانی روینە
زاخۆکا من

وارگەها ب دیلان و گۆڤەند
ل سیپیانێ و کورنێش و رەوەند
گەریانا پرێ دلڤەکەر
شرینێ زاخۆکا لەوەند
زاخۆکا من

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/١٢/٢٤)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: د باب و کالدە یا ناڤدارە.

# زاخۆکا من

زاخۆکا من ناڤ دارا
ل بەهدینا شرین وارا
ل بەر خابیر شەنگ و شۆخ
دێرینا هەمی شارا

زاخۆ شارێ دیلدارا
مەسکەنێ دۆست و یارا
چیایێ سپی ب دار و بارا
لێ خوەندکە وا ل نزارا

زاخۆ بیکا وەلاتی
بۆ مللەتی خەلاتی
جویدی لێ کر سلاڤە
ل گەل خامتویری ژێهاتی

دیتنا زاخۆ شرینە
ب جۆرێن گولا خەملینە
بلبل چێکە هێلینە
ئاوازێت خوەش ڤەهینە

## زاخۆکا مه شرینه

زاخۆکا مه شرینه
ئەوه ڕەوشا بەهدینه
پرا دەلالێ ب ناڤدار
چورانا مەم و زینه

بیکا شارا هوین دزانن[1]
بەهشتا دبل دارانن
هیزل و خابیر گۆهارن
سەرگەر ده نیده تیارن

چیایێ سپی ل گەل خامتویری
زیرەفانێ خابیری
شکەفتا بهری[2] ڕوینن
ته نه ڤێت هۆ بێن شویری

چیایێ جویدێ مراده
جویرانێ ب زاخۆ شاده
مێڤانی هات سەرا ده
زاخۆ ب جەژن و ئازاده

---

(١) تو د.

(٢) شکەڤتا بهێرێ دکەڤیته دەڤەرا سندیان.

# ئەو خەونن مالکی[١]

خــەونێــت تــە خــاڤن مــالکی[٢]
نــەشێ کــەرکــووکێ ژ مــە ڤــەکــی
کــەرکــووك دلــێ مــە کوردایــە
هشــیار بــە خــۆ خــەلــەت نــەکــی

شــیعا و ســـنا ژێکڤــە نــەکــە
پێگریــــێ ل یاســــایێ بکـــە
قــاتێ ســەدامــی ل بــەر نــەکــی
ئــەو بلــیلا تــە پــێ د گــۆت شــکەست

دوژمنـــا ل کـــوردا خرنـــەکـــی
بریـــارا تـــەڤلیهـــەڤ نـــەکـــی
مــادێ ســەد و چــل ژبیــر نــەکــی
کــورد دەولــەتــن گــەفــا نــەکــی

مــە چــاڤ بــۆ تــە نــە کلدانــە
خاکـــا مــــە نـــەبـــێ خودانـــە
ئێــك بوســت ئــاخ ب خوینــا کوردانــە
کــەرکــووك و شــنگال و شــێخانە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠/٥/٢٠١٢)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) نوری کامل موحەممەد ئەلمالکی، دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٦-٢٠١٤)ێ سەرۆك وەزیرێن عیراقێ بوو، هەروەسا ژ سالا (٢٠١٤)ێ هەتا (٢٠١٥)ێ جێگرێ سەرۆك کۆمارێ عیراقێ بوو، نۆکە ئەمینداری گشتییێ پارتا دەعوەیا ئیسلامی یە.

خانقین و مەندلیا جوانە
مە ب هزارها شەهید وێ د داین
ئەڤ بەرهەمە خوینا وانە
خوینا عەگید و مەردانە

ب چی رِوی دبێژی کورد بێ بەهرن
تو ل کیڤە بی ل سەرهلدانە
هەر کوردین شرین داستانە
مە سەنگەر کەفر و چیانە

ل رِیبازا پیرۆز ئەم رِشدین
ب شانازی پێ سەر بلندین
دەستا ژ کەرکوکێ نا بەردین
زەند و باسکا دێ بۆ هلدین

ئەم دێ گیانێ خۆ ل سەر دین
بۆ بابەگورگور ئەلندین
سەر ڤێ خاکێ ژ مێژدا ب دەردین
بەعسیا کورد[١] نەجەماندین

تو دێ چ ل مە کی ئەفەندی
دێ ئاڤێ ل سەرێ تە وەردین
گەر دوژمنبی ئەم دورندین[٢]
بێژە[٣] لانکو ب ماف و عەردین

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ئەم.

(٢) ل جهەکێ دیتر: سێهرە بەندین.

(٣) ل جهەکێ دیتر: پێشە.

پێنخواس[١] و ئاقلی بجڤینه
سیاسەت شولا تە نینه
مادێ سەد و چل بجهـ بینه
پەپێك كورد نەبێ خوینه

ل چوار پارچا ئەم ئاكنجینه
كوردا ئارمانج دەولەت بینه
كورد[٢] ستێنگن، مە نە ئارهینه
دێ ب تە ڤەدین تێر ژەهرینه[٣]

مەمنونین و مە نە لڤینه
مە سنوور چیایێ حەمرینه
جانفیدایێن ڤێ خاكینه
وە دیارە تە هاش[٤] خۆ نینه

---

(١) ل جهەكێ دیتر: مالكی.

(٢) ل جهەكێ دیتر: ئەم.

(٣) ل جهەكێ دیتر: دێ بتە ڤەدین قەد خەم نینه.

(٤) هاژ.

# کوردستانم

گۆتنە من ڕۆژێ
من گۆتە وان نە
نە خوە تو هەیڤێ
دیسا من گۆت نە

ئەرێ تو کیی
و ژ کیش مللەتی
چەند یا هەژی
هیڤی و خۆزی

ئەز کوردستانم
ب چار کەزێت جوانم
ب کراس و فستانم
ل کوردا ب خودانم

لاندکا عەگیدا
دایکا شەهیدا
خاک پیرۆزکم
خوینم د دلیدا

# کەرکووک

کەرکووکێ ئەم نابەردین
ڕوح و گیانی دێ ل سەر دین
خاکا باب و باپیرا
دوژمن بزانە کوردین

کەرکوکە دلێ کوردا
شارێ عەگید و مەردا
کوردا خوینا خو ل سەردا
دوژمن دەستا ژێ بەردا

کەرکووک و بابەگورگور
کەلهە ل کوردا بی شەکر
مە ئالا زەر پێڤە کر
دوژمن دێ ل تە کین ئاکر

# سالا نوی[1]

سەرسال هات و بگڕنژینێ
شەمالەك نوی هلبی ل ژینێ
پیرۆزباهی ل تە ئەی وەلات[2]
شادیێ و ئازادیێ ببینێ[3]

دیلانن شاهینە و گۆڤەند
شەڤ بێرێن شۆخ و لەوەند[4]
بەژدارن ئەم چەند هونەرمەند
ل بیرهاتنا قەشەنگ و ڕەند

گول و گولچیچەك[5] دیاری
دێ پێ خەملینین ڤی واری
کەیف و سەما د سالا نویدە
ل گەل ئاهەنگا ب ئەڤینداری

ب هەلبەست و هۆزانێن شرین
ل گەل شەید ئاوازێن خەم و ڕەڤین
ل شارێ زاخۆکا وار دێرین
ب پرا دەلال و ل خابیرێ شین

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٧/١٢/٢٠٠٤)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: وەلاتی دکین پیرۆزباهی.

(٣) ل جهەکێ دیتر: خاکا ئازاد خۆشێ بینێ.

(٤) ل جهەکێ دیتر: هەلپەرینن ب فند و ئەلەند.

(٥) ل جهەکێ دیتر: قەفتێن گولا دکین.

هلكـــن شـــەمـــال و فـــەنـــەرا
بـــرەشـــینن مســـك و عـــەنبـــەرا[1]
بـــۆ كـــاك مـــەســـعوودێ خۆشـــتوڤی[2]
ســـەرۆكـــە و دەم ئـــەو رێبـــەرا[3]

پارتـــا مـــە یـــا دیمـــوكراتی
دەم ســـەركێشـــە ڤـــی وەلاتـــی
ســـالا نـــوی هـــات ل مـــە هـــەلاتـــی
ئـــەم كـــورد دێ ژیـــن براتـــی

---

[1] ل جهەكێ دیتر: مە پیرۆزباهی ل رێبەرا.

[2] ل جهەكێ دیتر: كاك مەسعوودە گولا زەرا.

[3] ل جهەكێ دیتر: وی دەولەتبینی ئەگەرا، دەستی دیدە ئالا زەرا.

# سەرکەفتن

سەرکەفتن سەربلندین
ب کەیف و شاهی و گۆڤەندین
ب خوینی خاك رزگارکرن
بوستەك ئاخا خۆ نادین

سنۆر هاتن پاڕاستن
ئالا رەنگین لێ بەستن
پێشمەرگەینە و ناوەستن
دوژمنا مرن خواستن

ب زەند و باسکێت دلێران
خاکا پیرۆز ڤەگێران
مژدە و مژدە و مزگینی
دوژمن شکەستن و نەوێران

پێگڤە دان پەیمان و سۆز
پاڕاستن خاکا پیرۆز
ئەڤرۆ ل مە رۆهنکرن دۆز
رێ ل دوژمنا ما ئالۆز

# لیستا پارتی

سەد و دەه لیستا پارتیە
ل پاشەڕۆژێ ڕۆناهیە
دەنگا بدنێ هەمی پێکڤە
سەرکەفتن بۆ مللەتیە

پالوڕاوا هلبژێرن
د لیستا پارتیدا ئەو ستێرن
ئەو خزمەتکارن دلێرن
مافێ ڕەوادێ ژ دیر نێرن

لیستا مە پارتیا بەرزە
ئەو نا تەوت ب چو تەرزا
دەنگا بدنێ گەلی کوردا
ئەرکە ل سەر ملێت مە فەرزا

پالوڕاون خزمەتکارن
چاڤێ مللەتێ هەژارن
دەولەتبوونێ هیڤیدارن
کورد د جیهانێدە کۆمارن

# شڤانێ حێشترا

هەی هۆ شڤانێ حێشترا     داری د سەر خورە نەبرە
سەر دەڤ تو دبێژی مە برا     د بنڤە ل مە هللدکی ئاگرا

تو دوژمنی قەد نابی دۆست     داهولکا تە د قوتا دریا
بەس بەرسینگی کوردا بکرە     کورد پێشمەرگەنە ل سەنگەرا

مە خاکا خۆ خوینی بال سەرە     سەربازێت خۆ بکێشە و هەرە
یان دێ ل وان سۆژێن جەبەرا     کەرکووك بۆ کوردانە فەنەرە

ج تە ڤین تو ل مەرا دچینی     بەس فتنا ل عراقێ دچینی
خۆ ڕاست بکە دا تو بمینی     تو نەشێ کوردا نحاسینی

برسا کوردا یا بەلاڤبی     ماتو ڕۆژناما ناخوینی
کێماسیێ بۆ تە ناکین     شاخێت خو ل عەسمانا بینی

نێزیکە و دێ بینە دەولەت     ل هەر حال پارجا دکین مزگینی
ڤێجە ڕوینە سەر دێمی خۆ     دا ڤالێیت خۆ نە ئالینی

ڕەبەنۆ خۆ ماندی نەکە     هەڤرکیا کوردا نەکە
برین کەڤن بین ل مە نوی نەکە     ئەم ڤایلین هویڤیا بکە

خۆ فرۆش و چاڤا ڤەکە     چاڤ ل جیرانێت خۆ نەکە
کراسێ کورت ل بەژنا خۆ نەکە     نێ دونیا چەرخ و فەلەکە

حەقێ کوردا بەرزە نەکە     دیرۆکا مە کوردا ڤەکە
چاڤ یێ پێشیا خۆ نەکە     شەلینێ ل حەفکا خۆ نەکە

# نوینەرێن خۆ هلبژێرن

هلبژارتنە و دەنگدانە
چارەنڤیسا کوردانە
فیدرالی داخوازا مەیە
شرین وەلات ل مە بخودانە[١]
نوینەرێن خۆ هلبژێرن
ناڤ د لیستێدە کارگێرن

ئەنجوومەنی هلبژێرن
دا ل دۆزا کوردی بنێرن
خاکا بندەست دێ ڤەگێرن
بدەستێن پێشمەرگا ئەو شێرن
نوینەرێن خۆ هلبژێرن
ناڤ د لیستێدە کارگێرن

دەنگدان نوی رۆژە و سەرهلدان
دا خوەیا بت مافێ رەوان
ب هەزارەها شەهید مە دان
ل حەلەبچە و ئەنفالا وێران
نوینەرین خۆ هلبژێرن
دێ کن خەبات ئەو کارگێرن

---

[١] ل جهەکێ دیتر: وارێ شرین ل مە ب خودانە.

کـــەرکـــووك و شـــنگال و شـــێخان
بـــەدرا و جـــەســـان و مـــەنـــدەلـــی
خانـــەقینـــێ دێ بـــن ســـەمیـــان
ل دۆزێ و کـــەلار حـــەویجـــا جـــوان
نوینـــــەرێـــــن خـــــۆ هلبژێـــــرن
دێ کـــن خـــەبـــات ئـــەو کـــارگێرن

# پارتی زانم زاخۆیمه

خوانـــــدەڤامـــــه و قوتابیمـــــه
ژ پـــــەمانگـــــەهـــا بارزانیمـــــه

ژیـــــۆ مللـــــەتـــــی ڕۆناهیمـــــه
کوردپـــــەروەرم ئـــــەز ئاریمـــــه

گـــەنجـــم کـــوردم ئـــەز پارتیمـــه
ئـــــەز خورتـــــەکـــــی زاخۆیمـــــه

جـــــان فیـــــدایێ وەلاتیمـــــه
ئـــــاڤ ڤـــــەخـــــارێ خابیریمـــــه

چـــاڤ ڕیـــێ دەولـــەتـــا کوردیمـــه
زێـــــرەڤـــــانم هنـــــدی ب ژیمـــــه

ب ســـۆز و پـــەیمـــان ســـویندخاریمه
ل ڕێبـــــازا بـــــابێ ڕوحیمـــــه

## پیرۆزباهی[1]

پیرۆزباهی ل تە ئەی وەلات
سەرکەفتنێ مزگینی هات
شادی بەلاڤ بی ل وەلاتی[2]
رۆژا مە دڤیا ل مە هەلات

مە ل ئێکدوو کر پیرۆزباهی
د ناڤ مەدە بی کەیف و شاهی
کوردستانێ بی رۆناهی
بجە هاتی خۆزیا سوباهی

مەسعوود بارزانی رێبەرە
ئەو هلگرێ ئالا زەرە
رێبازا بابێ نابەردەت[3]
سەرکردەیە تێکوشەرە

دێ خەملینن وارێ پیرۆز
سەرکەفتن بی جەژن و نەورۆز
سویند ب خینا شەهیدا و سۆز
ئەم بەرنادین دۆزا پیرۆز

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەفتی (٢٠٠٩/٧/١٨)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: مللەتی.

(٣) ل جهەکێ دیتر: ل بەرە.

# ڕێبەرن مالا بارزان

من پسیارکر ژ دیرۆکڤانا
ژ ڕۆناکبیرا[1] و هزرڤانا
ژ باب و کالا و ئاقلمەندا
ژ چەندین ڕەهـ سپیا و زانا[2]

کی هێژانە بن سەرکردە
کینە مافێ کوردا دەستدە
ب دەنگەک بلند وان بەرسڤدان
گۆتن من مالا بارزانە

گەر مێژوویێ ئەم بنێڕن[3]
ئالا پەر ئال پەر ئەم وەرگێڕن
بەس مالا بارزان دلێرن[4]
کورد پەروەرن مالبات شێرن

چاک عەگیدن باش خوەش مێرن
هەر چوار پارچا پەز ڤەگێڕن
پیرۆزبت بۆ وان شڤانی
خاک پاڕاستن ب ڕوحێ و جانێ

---

(1) ل جهەکێ دیتر: ژ ئاقلمەندا.

(2) ل جهەکێ دیتر: ژ ڕەهـ سپیا و چەندین زانا.

(3) ل جهەکێ دیتر: ئەم ڤەکۆلن.

(4) ل جهەکێ دیتر: دەستانا دە نەقش گێرن؛ تێدە خۆیایە دلێرن.

بنكـــار ژبـــۆ كــوردا وان دانـــى
ئـــەون ســـەركێشـــێن كـــاروانى[1]
كۆڤانـــدار بـــين[2] بـــاب وەغـــەر بـــى
مـــەســـعوودى خـــەون بجهـــ ئـــانى

وى ل هـــەرێمـــێ كـــر ســـەميـــانين
بـــێ داخبـــارێ نيشـــتمانى
هـــەولێـــر كـــر پايتـــەختـــێ كـــوردان
بـــى ســـەركـــردە ل گـــەل نێچيرڤـــان[3]

ل دۆزا ڕەوا بـــى[4] بـــەرەڤـــان
ئاشـــتى تـــە خواســـت كـــوڕێ مـــەردا[5]
پرســـا كـــوردا دەنگـــدا ل جيهـــان
دارا ئـــازاديێ بـــەرهـــەم دان

ب خوينـــا شـــەهيـــدا و نـــەمـــران
تـــە جـــوانكر ســـەرێ كـــوردا
ڕێكـــا بـــابێ خـــوە[6] نـــە بـــەردا
هـــزار ڕەحمـــەت ل گـــۆڕ و توربـــا

يـــەكبوونـــا كـــوردا مـــا دلـــدە
لـــێ چيكـــين[1] قـــەدەرێ حالـــدا

---

[1] ل جهەكێ ديتر: سەرۆك هەريم سوبە كۆمار.

[2] ل جهەكێ ديتر: لێ مخابن.

[3] ل جهەكێ ديتر: ب پيرۆزياهى بى سەركردە.

[4] ل جهەكێ ديتر: ل دۆزا كوردا بين.

[5] ل جهەكێ ديتر: ڕزگار كرين كوڕێ مەردا

[6] ل جهەكێ ديتر: وان.

شـــەڤ و ڕۆژا بـــێ بـــێهن ڤـــەدان
ئـــەی شـــۆڕەشـــڤانێ[٢] دلوڤـــان

ل تـــەبـــاخێ و ئـــەیلـــول و گـــولان
ل ســـــەرێ چیـــا ل دۆل و مـــلان
ل بـــەر ســـینگێ تـــە[٣] دوژمـــن حـــەلان
تـــە ل وان ڕوخانـــد[٤] چـــەنـدین پـیلان

مـــەســـعوود بـــێ ســـەرۆك و ڕێبـــەر
وی خـــەبـــات کـــر ل بـــن ئـــالا زەر
ئـــەی جـــەنگـــەوارێ ب هێـــز چـــەپـــەر
چـــەنگـــێن نـــەیـــارا تـــە بـــرین

شـــێرێ چیـــا ب دل و جـــەگـــەر
دوژمنـــا چـــاڤ لـــێ هـــاتن دەر
نـەشـیان مـە ژ ڤـێ خـاکێ بکـن دەر
کـــوترێن ئاشـــتیێ فـــڕین

هنـــداڤ کوردســـتانا ڕەنگـــین
مزگینـــێ دان وارێ دێـــرین
هـــەولێـــر و ئامـــەدا شـــرین
مـــەهابـــاتێ و شـــارێ عـــەفـــرین[٥]
دێ بـــین کۆمـــار نێزیـــك بـــێ حـــین

---

[١] ل جهەکێ دیتر: لێ چبکن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: شۆڕەشڤانێن.

[٣] ل جهەکێ دیتر: وان.

[٤] ل جهەکێ دیتر: لێ ڕۆخاندن.

[٥] ئیدریس مەلا مستەفا بارزانی، ڕۆلەکێ باش د هەر دوو شۆڕەشێن ئەیلول (١٩٦١-١٩٧٥) و گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨) دا هەبوو. پشتی مالئاڤایا مەلا مستەفا بارزانی، وەك ڕێبەرێ پارتی دیمۆکراتی کوردستان- عراق هاتە هلبژارتن و ل سالا (١٩٨٧)ێ، وەغەرا داوییێ کر.

# جەژن

جەژن هاتۆ ب کەیف و سەما
کوردستان عاشقێ تەمە
پیرۆزباهی ل مللەتێ مە
ب ئازادی بژی هەمی دەما

دایکا کوردانە کوردستان
ب شاهینە ل تە جەژنا فتران
جەژنا بێت دەولەت بین ل جیهان
پێشەوا مەسعوودێ جوان

ئەوە رێبەر و سەرکردە
بۆ مە ساخ بی کورێ مەردا
رێبازا بابێ نەبەردا
هەرە پێش ئەم کورد ل گەل تە

# كاك ئيدريس

كاك ئيدريس نەقش دانەر
شۆڕەشگێڕێ ب دل و جەگەر
ڕوح ل دوژمنا كر بەلا
گیانێ خۆ ل خاكی كر چەپەر

هەر دوو شۆڕەشا بەژدار بی
خاكا پیرۆز ئەڤیندار بی
د جەنگادا ئەو ئاندەزیار[١] بی
پێشمەرگەیەك ب كار و بار بی

بەرە دامەزراند ب هزر
شۆڕەش ل كوردا كر شەكر
دۆزا بابێ خۆ نەبەردا
خۆشی ل دۆژمنا كر كەسەر

شێرەتكار بی ب دلوڤانی
دگەل بابێ ل مەكر شڤانی
وی ل دۆزێ كر بەرەڤانی
حەیفا بابێ نێچیرڤانی

---

(١) ئەندازیار.

# کوردستان

تە خاک زێڕینە کوردستان
وارێ دێرین هەی ڕۆح و جان
هەی شینوارێ باب و کالان
ب ڕۆح و جانڤە ببین قوربان

وەلاتێ من کوردستانە
تانجا سەرێ وەلاتانە
سەرۆک مەسعوود لێ سەمیانە
ئاشتی و ئازادی نیشانە

زێرەڤانین ب بەڕەڤانی
دێ پارێزین نیشتیمانی
مە سووندخار ب خوینا شەهید
یان دەولەتبوون یان قوربانی

# وەلات

وەلات دایە وەلات بابە
ڤین و ژینا مە هەمیانە
ئەو جڤاکا وەلات نەبیت
خاکا وەلاتی بەهایە

وارێ باب و باپیرایە
وەلات گولا ل ناڤ دلایە
نائێت کڕین نە ب زێڕ و نە ب زیڤ
حەژێ دکین هندی ڕۆح مایە

سویند ب ئاخی ب پەیمان و سۆز
دێ پارێزین خاکێ پیرۆز
وەلات دلە پێدکین ژیان
خامل و ڕەوشا مەیە هەر ڕۆژ

ئەم بۆ وەلاتێ خۆ ب ناڤین
ب ڕۆناهی بۆ وەلاتی ب چاڤێن
لێ ئەم چبکین ئەم بەلاڤین
ئەی وەلاتۆ بتە ب سلاڤین

## مزگینی

مزگینـــــی و ســـــەد پیرۆزبـــــاهی
مللـــــەتـــێ کـــورد ب تابـــــاهی
لیســتا هــەڤپــەیمـانی ب ســەرکــەڤـت
وەلاتـــــی بـــــی کـــــەیـــف و شـــاهی

مـــە ســـەرکـــەڤـــتن مســـۆگەر بـــی
کانیـــــــا ئـــــــازادیێ دەر بـــــــی
ئـــــالا کوردســـــتانێ بـــــەرز بـــــی
بـــدەســـتێ مـــەســـعوودی بلنـــد بـــی

مـــە وەلات خـــــەملانـــد ب گـــــولا
حاســـــــل بـــــــی مـــــــرادا دلا
بژیـــــــت پـــــــارتی دیمـــــــوقراتی
خزمـــــەتکـــــارا ڤـــــی وەلاتـــــی

## گونەهبار كورد نامرن

گونەهبار كورد نامرن
كورد ژ مرنێ مەسترن
ئەم گوهـ نادین كێمیا تە
ئەم ئاسن و ئاگرن

دێ بین كەلەم ل چاڤێن تە
مرن یا چوو ژ بیرا تە
خاڤ تین ئەو خەیالێن تە
كراس كورتبی ل بەژنا تە

تە گەلەك دا بەر داسی
تێر تو مای ئاسی
دێ چ بێژی دادوەری
عەوری ڤەدا بی ساهی

ب چەند خوینا تو خوینداری
د مێژوویدە پرسیاری
شاهدا سویند یا خوارین
بۆ هندە بێ باوەری

ها صەدام رۆژا تە هات
ل مرنا كوردا دكر خەبات
هزرا پاشەرۆژێ نەدكر
زیندان ل تەبی خەلات

عـــەلـــى كيميـــاوی[1] و دەســـــتەك
ل ئـــەنفـــالا كـــوژتن گـــەلـــەك
گـــەنـــج ل مـــە بـــەرزەكـــرن
وەريســـــى ل ســـتوا بـــى خـــەلـــەك

[1] عەلی حەسەن ئەلمەجيد تكريتی (١٩٤١ ـ ٢٠١٠) ل دەڤ كوردان ب (عەلی كيميايی) ناڤدارە.

# مه سەرکەڤتن مسوگەر بی

مەسەرکەڤتن مسوگەر بی
کانیا ئازادیێ دەربی
لیستا هەڤپەیمانی ب سەرکەڤت
یا مە دڤیا ئەڤ ڕۆژەبی

کوردستانێ تو هەژیێ
ل ئێك دوو دکین پیرۆزباهیێ
مللەت شاد بی ب مزگینیێ
ب کەیفە و سەما ب ئازادیێ

دێ خەملینن وارێ ب گولا
حاسل بی مرادا دلا
گڕنژین هات پشتی خەما
ئازاد بین وەك هەمی گەلا

شاهیا و گوڤەندا ب گێڕینن
جۆرین بەرگا خۆ بخەملینن
ئالا زەر هوین بهەژینن
کوماری ل کوردا بچەسپینن

# ئەز کەچم کوردستانیمە[1]

ئەز کەچم کوردستانیمە
سەرکەفتنێ یا ب شاهیمە
پیرۆزیاهی ل هەر چار پارچا
ل دەولەتبوونێ یا ب هیڤیمە

پەرلەمان هات دامەزراندن
مافێ ڕەوا هات پاراستن
سەرۆک هات هلبژارتن
ل دلا خۆشی هاتە چاندن

من مزگینی دا ئامەدێ
وانێ و مێردینێ و سەرحەدێ
شاهینە[2] ل جزیزا بوتا
شەرنەخێ هاتن گوڤەندێ

قامشلۆ دێرک و عەفرین
حەسەکا و عامودا ڕەنگین
هەست ب سەرکەفتنێ دەربرین
مەهاباتێ گەهشت مزگین

دەنگ و باس ل وان خەلات
خاکا پیرۆز بی ئێک وەلات
کوردستانێ سەرخۆبوون هات

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٧/١٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[2] ل جهەکێ دیتر: سەما کەت.

# ئەز کەچم کوردستانیمە[1]

ئـــەز کـــەچـــم کوردســـــتانیمە
مـــەرگ حـــەیرانـــا[2] ڤـــی خاکیمـــە

پاشـــەڕۆژا گـــــەش ب هیڤیمـــــە
خزمــــەتکـــــارا مللـــــەتیمـــــە

کـــەچ و نـــەڤیـــا شـــەهیدیمـــە[3]
ســـــــەر بلنـــــــدا وەلاتیمـــــــە

ب ئـــالا ڕەنگـــین خـــەملاندیمـــە
بـــۆ مـــافێ خـــۆ یـــا ب گازیمـــە

ئـــەز ل زاخـــۆ[4] مێڤـــان داربیمـــە
ب دیتنـــا وێ پـــڕ شـــاد بیمـــە

ژ مێـــژدە ل زاخـــۆکێ بخۆزیمـــــە
ئـــەز ژی کـــەچـــا خابیریمـــــە

ب پـــرا دەلال هـــەیبـــەت لیمـــە
هونـــەرمـــەنـــدا ڤـــێ واریمـــە[5]

ب[6] چیاییێـــت خـــۆ یـــا ســـپەهیمـــە
ئـــەز کـــەچـــم کوردســـــتانیمە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٧/٢١)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[2] ل جهەکێ دیتر: گوریا.

[3] ل جهەکێ دیتر: ئەزم کەچا شەهیدیمە.

[4] ل جهەکێ دیتر: زاخۆکێ.

[5] ل جهەکێ دیتر: هونەرمەندم گلێریمە.

[6] ل جهەکێ دیتر: ئەز.

## جانێ ژ کوردستانا باکوور

جانێ ژ کوردستانا باکوور
مێڤانی هاتمە باشوور
پڕ خۆش حالم ل ئازادیێ[١]
پێشکێشکم گولێن زەر و سۆر

پیرۆزباهی ل تە ئەی وەلات
سەرکەڤتن بۆ مە بی خەلات
ڕۆژا گەلی ل باشوور هەلات
سینی پارچێن دی مزگینی هات

ئەز یا هاتیم ب هونەرمەندی
سەلام بۆ وە ژ چیا جودی
چاڤەڕێنە دەمەك نێزیك
سەرخوەبوون و دەولەتا کوردی

---

(١) ل جهەکێ دیتر:

## کوردم ئەز ئاریمە

کوردم کوردم ئەز ئاریمە
دلسۆژێ ڤی وەلاتیمە

ل ڕۆژهەلات مەهاباتیمە
ڕۆژئاڤائی کوبانیمە

ل باکووری ل ئامادێ بریمە
ل باشووری ئەز هەولێریمە

ل چار پارچا ب دەولەت خۆزیمە
ئەز سۆرامە و بەهدینیمە

فەقیێ سەرکردەك هەژیمە
تا بمرم ل ڕێبازا ویمە

پارێزڤانێ ڤی گەلیمە
ئەز ئێك کەلهم ب چار دەریمە

ل خاکا خۆ ئەز جان گوریمە
ئاخ پەرێسێ ڤی خاکیمە

## شارەوانی

هەر هەبی شارەوانی
ڕەوشا هەمی شارانی
دل سۆزا مللەتێ کورد
خۆشیا ژینا هەمیانی

شارەوانی ب جوانکاری
د پڕۆژادە بەژداری
شەڤ و ڕۆژ خزمەتکاری
ل کوردا نویژەندکێ واری

شارەوانی چەلەنگی
د شارادا بناڤودەنگی
ئەم سوپاسیا ل تە دکین
هاوارا ڕۆژێت تەنگی

شارەوانی یا ب خاسی
ل کارمەندا دکین سوپاسی
پاک و تەمیزێ[١] دخوازی
خر شارا تو هەناسی

---

(١) پاقژی.

# گوندێ مه

گوندێ مه سنجەقا گوندا
ل بەر بێخێری ب کەڤر و گەندا
شالیل و کەو وێ لێت[1] خوینن
دێ لێ ژین سەر پێ بلندا

پشتا گوندی کوزیا وانه
پەز لێ چەراندن شڤانا
نارۆنك گۆتن بێریڤانا
وارگەهێ باب و گالان

گوندێ مه بیکا بەهدینا
ل دۆبانێ ب دەشت و زەڤینا
جۆتیارا جۆت لێ گرێدان
ئاخەك بخێر و زێرینا

ناڤێ گوندێ مه هاجیا
بەردە دەشتە سەر دە چیا
خەملا گەلیا دار بەرویا
مخەلێ پەزین گویڤیا

---

(١) لێ د.

## هەولێر

هەولێر كەلها دێرین وارە
هەولێر ڕەوشا هەمی شارا
شارێ عەگید و خۆشمێرا
ژ مێژدە ل دیرۆكێ ناڤ دارا[1]

هەولێر هەولێر

هەولێر پایتەختێ كوردان
شارێ شێران و مەردان
كانیا ژینێ و سەرهلدان[2]

هەولێر هەولێر

هەولێر وارێ باب وكالا
هەولێر خەنا چەندین سالا [3]
ئاشتی دامەزرا شینوارا
بخوینا شەهید و هەڤالا

هەولێر هەولێر

شەهید تو ڕابە ژ گوورێ
مەیزكە ئازادیێ ل باشوورێ
ڕەڤین كوترا ژ هەولێرێ
مزگینی وان دانە باكوورێ

هەولێر هەولێر

---

(١) ل جهەكێ دیتر: مێژوو دیروكێ ماف دارا.

(٢) یا دیار هەلبەستڤانی ب ڤی شێوەی ب داوی ئینایە.

(٣) ل جهەكێ دیتر: هەولێر خەنا چەندین سالا.

کـــا شـــێخ ســـەعیـــدێ پیرانـــی
قـــازی و موســـــتەفـــا بـــــارزانی[1]
دردێ دلـــــــێ کوردســــــــــتانێ[2]
هـــەولێـــری مـــەهـــەباتـــا جـــوانی
هـــەولێـــر هـــەولێـــر

---

[1] ل جهەکێ دیتر: بابێ مەزن جو دوز دانی.

[2] ل جهەکێ دیتر: خەونا کوردا بجهئانی.

# هەولێر

هەولێره پایتەختێ کوردان
دهۆك بووكا[1] بەهدینان
زاخۆ وارێ عەگیدان

مەهاباتا خاك زێڕین
بۆ دەولەت ل کوردا شرین
ئەم ل سەر مان و دلبرین

ئەی ئامەدا شۆڕەشڤان
ل مافێ ڕەوا ببن شڤان
خەباتکەرن دلۆڤان

دێرك و قامشلۆ و عەفرین
کوترێن ئاشتیێ لێ فڕین
کوردینێ ل دلا ئەڤین

مە ئارمانج دەولەت بوینە
ئێك دلن ئێك خوینە
سەر خاکێ دل سۆتینه

---

(١) بیكا.

# خودایێ هیژا

ب ڕۆژینە و دێ کین نڤێژا
ژبۆ تە ئەی خودایێ هێژا
تو گونەهێت مە ب غەفرینە
ڕەحما خو د سەرمەدا بڕێژا

بانك هلدا و دا بچین مزگەفتێ
ژ دەست خو نەکین ڤێ دەرفەتێ
پەیداکین خۆشی ئاخرەتێ
هێلانە و مرنا ل پایمەتێ

دێ کین زکری و تەڕاویحا
سونەتا دگەل تەسبیحا
قورئان خواندن سپێدەهیا
کەلامێ خودایێ موریحا

دێ ئەداکین فەرزێت خودای
حەج و زەکات د مالیدا مای
دا شادبن بەهشتا بەرین
ئەم ژبیر نەکین هەر دێ مرین

## خودايێ من

خـــودان عـــەرش و ســـەنتـــەتـــەتـــی ڕەحمـــانی تـــو
تـــو زێـــدە ب ســـەهـــم و هـــەیبـــەتـــی قـــادری تـــو
تشـــتێ تـــە ڤیـــا دێ بێـــژی کـــون فـــەیـــەکـــون
کـــەســـدی نینـــە ژ غـــەیـــری تـــە خـــودای تـــو

بـــابێ مـــە ئـــادەم تـــە ئافرانـــد زۆریـــەتـــین ئـــەم
دێ بـــۆ تـــە کـــین عبـــادەتـــی ل ژینـــێ هـــەردەم
ئـــەم پێتقـــی ڕەحمـــا تـــەنـــە ڕەبـــێ عـــەزەم[1]
مـــە قورتـــالکی ژ عـــەزابـــا خـــۆ ئـــەوە ئـــەهـــەم

شـــەڤ و ڕۆژا دێ کـــین زکـــری بـــۆ خـــودای
ل خـــۆ زڤـــڕین خێـــرا دێ کـــین ل ژیـــێ مـــای
ب پـــەشـــێمانی توبـــەداریـــن خـــودای مـــن
ئـــەم تێهنییێـــت ڕەحمـــا تـــەنـــە تـــوێ مـــەولای

مـــە ژ قـــەنـــج و باشـــا ڤـــەنـــەکـــی بوســـلمانین
مـە ژ ڕەحما خۆ بێ بەهر نەکی بارگرانین
تـــو مـــە نـــەبـــێ هـــەلاکـــەتـــێ[2] ل تـــە ب ئیمـــانین
دەریێ بەهشتێ ل مە ڤەکێ ل تە حەیران نین

---

[1] مەزن.

[2] ژناڤچوون.

## خێر و خێرات

خێرا بکە تو هەر ساخ نابی
دا ل ئاخرەتێ سەرفەرازبی
دەرفەتە بۆ تە بوسلمان
دا ل دەڤ خودای تو بەهابی

هەر خێراتن دەفع ل بەلا
خودا ئاگەهدارە ل دلا
فەقیر و ژار هەر دل کولە
هاریکار بە و بەرزکە پلا

بوسلمانێ خودان ئیمان
هێتیم و سێویا بە سەمیان
سۆز بۆ تە ب کەفیل و دەمان
تو ل بەهشتێ دێ بی مێهڤان

دونیا پیچە و هەر هێلانە
شەرتێ ئاخرەتێ ئیمانە
بەهشت یا خودان خێرانە
ڕۆژا حەشرێ یا گرانە

## دونیا پیچە

دونیـــا پیجـــە بـــێ مـــەفایـــە
هێلانـــــا ملکـــــێ خودایـــــە
مـــرن بـــەهـــرا مـــە هـــەمیایـــە
ئـــێ ڕۆژ لـــێ هـــات تچـــت[1] نـــەمایـــە

مـــال قـــەدایـــە گـــور بـــەلایـــە
ژنیـــا ل دنـــێ هـــۆ ب ئیزایـــە
بـــەهشـــتا بـــێ ئیمانایـــە
ئـــەو زینـــدانا موئمنایـــە

پێغـــەمبـــەر چـــوون شـــێخ و ســـەیـــد
مـــە عـــەبـــرەت ب خـــوە ژ وان نـــە دیـــت
ژ خـــودێ بترســـن دکـــم عـــەقیـــد
ڕۆژی و نڤێـــژا بکـــن ڕەصـــید

پێـل نـەفسـێ بکـن ئـاخرەت سـەعیـد
هـزرا خـوە بکـن پـەیـداکن قویـت
سـەرفـەڕازیـن پێنگاڤـا سـەدیـد
ئـەداکـین سـۆز ئـەمـن عـەبیـد

ڕاســـتە دونیـــا پتـــر لـــەزەتـــە
ژبیـــر نـــەکـــن ئـــاخرەت غوربـــەتـــە

---

[1] دچت.

مـــرن تـــەحلتـــرين شـــەربـــەتـــە
دێ ژيـــێ ڤـــەخـــوين بـــێ موهلـــەتـــە

ڕوحـــا مـــە نـــێ ئێمانـــەتـــە
ژی ل مـــە حـــەسـێبە ب ســـەعـــەتـــە
گاڤـا شـمە[1] خواسـت ئـەو فرقـەتـە
مـە و دونيـايى دەسـت ژێـك قـەتـە

---

[1] ژ مە.

# بگرن قەدرێ دەی بابا

کەس گوهـ نەدن خرابا
بگرن قەدرێ دەی بابا
ساڤا بین مەزن کرین
ماندیبین پێش چاڤا با

پاڕاستن ژ تاف و بەلا
ڕێزگرتن بۆ وان فەرە
بلا ڤین بچت دلا
بدن دەستا باقێن گولا

ب زارەك شرین باخڤن
دەنکی ب سەر وان نەئێخن
تەحلی و زەحمەت یا وان بی
دەی بابن مە ب سەر تێخن

دەی بابا ماف وێل ل دەڤە
ژخزمەتا وان نە ڕەڤە
خودا بێ ل مە دکت گەڤا
بەهشت ب وان بەرهەڤە

# ئەز ژ تە هویڤیدارم ژخودا

هویڤیا من ئەو بی ژ تە خودا
داڤێ ڕوحێ ژ من کێ جودا
نە ل ڤێ ژینێ بێ مراد بام
قەد من خۆشی نەدیت چو جا

ژین بی زیندان کەتم تێدە
فەلەکە ئاستەنکە وا د ڕێدە
بەختێ من وێ چەرخەك لێدە
یا من کری چوو ب ئاڤێدە

من نەسیب نینە[١] ل ڤێ دنێ
من بەلگ وەریا[٢] گو ل ما ب تنێ
تێنیبم دەریا ل من هشك بین
لەو دبێژم[٣] بخێر بێت مرنێ

هەویڤی ل گەل ئۆمێدا مرن
ناڤێ من ژك ل گەل خۆ برن
لەو من دوعا ژ خودێ کرن
دا کول و دەرد نەزڤڕن

---

[١] ل جهەکێ دیتر: بەخت ڕەشی.

[٢] ل جهەکێ دیتر: وەشیا.

[٣] ل جهەکێ دیتر: دێ بێژم.

## بکن تاعەتی[١]

تاعـــەتــــی بکـــــن بــــۆ خــــودای
ئــــەوی ئـــــەم ژ چوونــــەهیـــێ دای
دەولـــــەمـــــەنــــد و فــــەقیــــر و ژار
دانوســــــــــتاندنە شــــــــــولای

شـــــوکر دایــــم بــــۆ تـــــە خــــودا
ئــــەم وێ دبــــن نعمـــــەتـــێن تـــــەدا
هــەر ئـــەمـــین عـــەڤـــدێت گونـــەهکـــار
شــــــــەرمــــــزارین دونیــــــا تـــــــەدا

دوعاییێـــــــت مـــــــە تـــــو بحەبینــــــە
گونـــــەهێــــــت مــــــە بغـــــەفرینــــــە
داخـــــــــازا مـــــــــە لێبوورینــــــــــە
مـــە ژ غـــەیـــری تـــە کـــەس دی نینــە

عــــــەرد و عـــــــەزمانــــــا فـــــــاتری[٢]
هنــــــداڤی مــــــە تــــــو نــــــازری[٣]
حــــــەمــــد ژبــــۆ تــــە ئـــەم شــــاکرین
ئــــــەم کیڤــــــە بچـــــین تـــــو حــــازری

---

(١) ل جهەکێ دیتر: شوکر بۆ خودای.

(٢) ژ ناڤێن خودایێ مەزن و ڕامانا (چێکەر) ددەت.

(٣) جاڤدێر.

ئـــەی خـــودا ل تـــە ئۆمێـــدەواریـــن
تـــو ل مـــە بـــووره گـــەلـــەك ژاریـــن
ل ئـــاخرەتـــی[1] بـــێ كاروبـــارین
بوســـــــلمانین ئیمانـــــــدارین

(١) ل جهەكێ دیتر: لاوازین.

# موحەمەد (س)[١]

موحەمەد رۆونیا چاڤایێ
بابێ قاسمی و فاتمایێ
شرین خۆشتڤێ خودایی
رێبەر بۆسلمانایێ

ئەحمەد تو ل سەر سەرا تانجێ
رێڤنگێ ئیسرا و معراجێ
تە ئومەت گەهاند ئامانجێ
نەبیەك نۆرهە وەهاجێ[٢]

موستەفا تو ناڤ شرینێ
جبرائیل تێنت مزگینێ
کەلامێ خودایی دا دەستی
پیتە پیتە ڤەد حەجینێ

تاهایە[٣] قورەیشێ جەلەنگ
بەیرەق[٤] راکر رەنگ و رەنگ
ل غەزوا بەدرێ[٥] و تەبۆك[٦] قەشەنك
خەندەق[١] و حونەینێ[٢] دا دەنگ[٣]

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠٠٣/٨/١٥)ێ هاتیە ڤەهاندن.

[٢] پێغەمبەرەکێ خودان رۆناهیەکا زێدەیە.

[٣] ژ ناسناڤێن موحەمەد پێغەمبەری (س).

[٤] ئالا.

[٥] غەزوا (بەدر) ل سالا (٢ك/٦٢٤ز) رویدابوو.

[٦] غەزوا (تەبۆك) ل سالا (٩ك/٦٣٠) رویدابوو.

## موحەمەد (س)

موحـــەمـــەد ژ چاکـــا ب ســـاخلەتـــێ[٤]
دەڤ خـــودای ب قـــەدر و قیمـــەتـــێ
هــــــــاوار و بانگیـــــــا ژارا
تـــوێ شـــەفیعـــێ[٥] ئومـــەتـــێ

موحـــــەمــــەد تانجـــا ئـــەنبیـــا
ڕۆناهیـــــــا قـــــــورەیشـــــــیا[٦]
بـــابێ زەینـــەبـــێ[٧] هـــەژیـــە
خۆشـــــــتڤیێ[٨] خودایـــــــە

کـــا موحـــەمـــەدێ نـــاڤ شـــەکـــر[٩]
کـــا[١٠] ئـــەصـــحابی ئـــەبـــو بـــەکـــر

---

[١]غەزوا (خەندەق) ل سالا (٥ك/٦٢٧ز) ڕویدابوو.

[٢]غەزوا (حونەین) ل سالا (٨ك/٦٣٠ز) ڕویدابوو.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ب ناڤێ ئیسلامێ دەینا جەنگ.

[٤] ل جهەکێ دیتر: موحەمەد ب ڕێز و حورمەتێ.

[٥] بەڕەڤانکەر.

[٦] ل جهەکێ دیتر: ژ پێغەمبەرا دوماهیا، نورهەی ل ناڤ قورەیشیا.

[٧] ل جهەکێ دیتر: بابێ قاسمی.

[٨] ل جهەکێ دیتر: خۆشتوڤیێ.

[٩] ل جهەکێ دیتر: موحەمەد تە دین بەلاڤکر.

[١٠] ل جهەکێ دیتر: دگەل.

کـــا[1] عومـــەر و عـــەلـــی و عوســـمان
هـــەر چـــارا بـــاوەری ب تـــەکـــر

ئـــەی موحـــەمـــەد تـــو ئـــەمینـــێ
ژ مـــەکـــەهـــێ چـــووێ مـــەدینـــێ
نـــاڤ بوســـــلمانادا د ڕوینـــــێ[2]
نـــامێ ب مزگینـــی دگـــەهینـــێ

---

[1] ل جهەکێ دیتر: دگەل.
[2] ل جهەکێ دیتر: د ڕینێ.

# عەزیزوڵلا

عـــەزیـــزوڵلا تـــو پادشـــاهی و دلوڤـــانی
عەرد و عەسمان شەش ڕۆژا تە ب نەخشی دانی
ئیـــنس و جـــن و گیانـــەوەر تـــە ئافرانـــدن
دابـــۆ تـــە بکـــن عیبـــادەتـــی تـــو پـــێ دزانـــی
خـــودانێ (٩٩) ناڤـــا ئـــەو صـــەمـــەدە[1]
داروبـــــەر و دۆل و چیـــــا زکـــــرێ تـــــەدە
یاســـا بـــۆ مـــە دیـــارکر قورئانـــا خـــوەدا
دونیـــا و ئـــاخرەت ئـــەو گوســـتیرن دەســـتێ تـــەدە
دونیـــا و ئـــاخرەت ئـــەو مـــولکێ رەبـــێ ئـــەحـــەدە
دونیـــا نـــەمـــا بـــۆ ئـــەولیـــا و پێغـــەمبـــەرا
کـــەس نامینـــت جـــەبـــار ئـــەوە خـــودان ئـــەمـــرە
جـــەهـــنم تـــەدا ژبـــۆ مورتـــەدا و کـــافرا
بـــەحشـــت دانـــی ژبـــۆ قـــەنجـــا و ئیمـــان دارا
ڕەحمـــانێ مـــه ئیلاهـــێ مـــه
حـــەمـــد و شـــوکر هـــەر بـــۆ تـــەنـــە خـــودایێ مـــە
هـــەمـــی تشـــت ئیـــرادا تـــەنـــە یـــەزدانـــێ مـــە

---

[1] صەمەد: ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا (ئەوە یێ کو چ کار بێ وی نەهێنەکرن) ددەت.

دانوســـتاندن كـــارێ تـــەيـــە ســـولتانێ تـــو

دونيـا هــەمــی نــەخشــێ تـەيـە عــەزيــزێ مــن

ڕەحــم و عــەزاب كــارێ تــەيــە خــالقێ[١] مــن

خـــودايێ مـــن

---

[١] خالق: ژ ناڤێن خودايێ مەزن و ڕامانا (چيكەر) ددەت.

# ڕۆژیگر

خودا ڕۆژێت مە قەبیل کت
بەهشتا خۆ مە شاهی کت
گوهـ بدین ئەمرێ خودای
ئەو دێ مە ژ گونەها دیرکت

هزرا خۆ بکین هەر دێ مرین
دا بگەهین ئارمانجا شرین
دا ل داویێ ئەم نەگرین
ڕەحما خودای ئۆمێدوارین

توبەکین هێش وەخت نەبووری
بەرێ خۆ بدین ڕەبێ ژووری
ڕۆژیا بگرین و نڤێژا بکین
تاعەت و زکرێ غەفووری

خودا دەرگەهێ هیڤیابێ
بۆ خۆ نەکت خەم دونیایێ
گەر ژی بووری ئیدی نابێ
دا ئەم نەکەڤین بەلایێ

# ڕەمەزان[1]

ڕەمەزان هات ل مە مێڤانە
هەیڤا خێرێ و خێراتانە
ڕۆژیا بگرن و بکن نڤێژ
شاهیە ل ناڤ بوسلمانا

فترە و زەکاتا ئەداکن
قەرێ خودای سەر خۆ ڕاکن
قوتێ ئاخرەتێ پەیداکن
هەر هێلا نە و ئەم دێ بارکن

قورئان ل ڤێ هەیڤێ نازلبی
یاسا بۆ دینی موکم بی
تاعەتی بکن شەڤا قەدرێ
ژ هەشتێ و هەشت سالا پتر بی

ب تەراوحا و زکر و تەکبیر
دا ڕەحما خودای نەچیت ژبیر
بخوینە قورئانێ بێ تەخسیر
ل قەبرێ تاری دێ بت خەتیر

[1] ئەڤ هەلبەستە ا ڕێککەفتی (٢٠٠٩/٨/٢٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# ڕەمەزان

ڕەمەزان هەیڤا خێرانێ
هەیڤا تاعەتی و ئیمانێ
گرتنا ڕۆژی و نڤێژا
دا ڕێکا ئاخرەتێ بزانێ

جبرائیل بریسک و تەیری
ل شەڤا لیلەت و لقەدری
مزگینی دا پێغەمبەری
قورئان دا دەستێ ب دیاری

ڕەمەزان سەبڕ و هەداری
دناڤ هەیڤادە یا دیاری
ل بوسلمان توبەداری
ل ڤێ مەهێ قورئان هات خواری

## هەیڤا ڕەمەزانێ

هەیڤا ڕەمەزانێ
ڕۆناهیە ل ئیمانێ
هات خواری ل ڤێ هەیڤێ
پیرۆزێ قۆرئانێ

خودا دلۆڤانە
گەلی بۆ سل مانە
هەیڤ هەیڤا خێرانە
تالی هەر نەمانە

شوکری ژ خودای بگرن
شەڤێت هەیڤێ ب قەدرەن
شەڤ ب هزار هەیڤا
بەهشت بۆ ئێ ب سەبرن

ڕەمەزان پیرۆز
ب تەقدیرە و شرین دۆز
ب هاتنێ ئەم شادین
ب لەز دێ ئەداکین سۆز

ڕۆژی و نڤێژ تاعەت
ب صەڵەوات و قامەت
فترێت سەرا و دانی
دێ کین قویت بۆ ئاخرەت

ڕەمـــــــەزان فـــــــەنـــــــەرە

بـــــۆ دینـــــی مـــــــەفـــــەرە

رۆژەك هـــــــــەر وەغـــــــــەرە

مـــــــە مـــــــرن وا ل بـــــــەرە

# خودا

ئانــدەزيــارى خــودايێ مــە خــودان نــەقشــى
پەتشاهى ب شەش ڕۆژا ڕينشتى سەر عەرشێ
تــە ئافرانــدن ئيــنس و جــين و گيانــەوەر
تو ئـەحـەدى ل دونيـا و ئـاخرەتێـدا ب ڕەوشـێ

خـــودايێ دانوســـــتاندنێ خـــودايێ مـــە
تــە ئــەم دان دێ مــە مرينــى پــەتشــاهێ مــە
مە مەحروم نەكە ژ ڕەحما خۆ عەزيزى مە
تــو مــەفــەرى ب غــەفرينــە گونــەهێت مــە

## قورئان

دســـتوریَ ئومـــەتـــا ئیســـلامیَ قورئانـــە
گۆتنـا خودایـە هـەی گـەلـی بوسـلمانە
دێ ل بـن سـیبەرا وێ بـین ڕۆژا ئـاخرەتـێ
بـاوەری بێهنـات هـەمـی خـودامن ئیمانـا

گـەلـی بـرا قورئـان خوانـدن پیـرۆز کـارە
مـەهـدەریَ دکـت ڕۆژا حـەشـریَ ئیمانـدارا
پاراســـتییە ژلایـــێ خـــالقێ جـــەبـــارە
دەرمانـــدارە ســـەر هـــەمـــی ئێشـا نـوژدارە

قورئـــان فـــەنـــەر و چرایـــە دبیـــت ڕۆنـــاهی
بخوینـــە فـــەجـــر و ئێڤـــارا و ســـوباهی
قـویتێ ئـاخرەتـێ دابینکـە ئـەی بوسـلمان
ب ڕێکا قورئـانێ بـەهشـتێ بکـە ئاڤـەهـی

قورئانـــا پیـــرۆز یاســـایە ل نـــاڤ ئومـــەتـــێ
دەســـتکەفتیـــا ئـــاخرەتیـــە ل قیامـــەتـــێ
بوســـلمانا قورتـــال دکـــت ژ زەلالـــەتـــێ
خـودا تـو مـەبـێ بـەهرنـەکـی ژ هدایـەتـێ

## خودا مەزناهی بۆ تەیە

خــــودا مــــەزنــــاهی بـــۆ تــــەیــــە
دلوڤــــانی و ڕەحـــــم یـــــا تـــــەیـــــە
هــــەر تــــوی یــــەزدانـــێ مــــەزن
حــــەمــــد و شــــوکرا مــــە بــــۆ تــــەیــــە

خــــودا هــــەردەم ئـــێ مــــەدینـــی
گونــــەهێــــت مــــە بغــــەفرینـــی
نــــۆت و نــــەهــــ ناڤێــــت شــــرینی
تــــە ئــــەم دان دێ مــــە مرینــــی

دانــــەرێ عــــەرد و عــــەزمانــــا
خــــودانێ مــــولکی رەحانــــە
تــــە نــــەعمــــەت دان شــــوکردارین
داخــــازا مــــە شــــتە[1] ئیمانــــە

ئــەم دێ دەســتا ســەر ئــەڤــرازکین
ب دوعـــا خـــۆ مـــوحتـــاجی تـــە کـــین
کراســـێ ئیمـــان ل بـــەر کـــین
قـــویتێ ئـــاخرەتـــێ پـــەیـــداکین

---

[1] ژ تە.

# ژ مللەتا ڕابین پێغەمبەر

ژ مللەتا ڕابین پێغەمبەر
خودای ڕێکرن ڕێبەر
خودای ب خەلکێ دان نیاسین
ل دینێ شرین ئەو بین فەنەر

چوار پێغەمبەر هاتن ب پەرتووك
موحەمەد و عیسا و مووسا و داوود
قورئان و ئنجیل و تەوڕات و زەبوور
ئیماندارا وان خودان دوور

یاسا بجههات پیرۆزیاهی
ل تاڕیستانێ بی ڕۆناهی
دناڤ مەدەبی کەیف و شاهی
پێغەمبەرن ل مە سیناهی

وەلام ژ دەڤ خودای ئینان
مە باوەری پێ هات ئیمان
کی هات ل مللەتی بی خودان
سلاڤێت خودای ل سەر وان

# گولا زەر

گولا زەر هەی گولا زەر
من هێش ژمێژا دلێ ل سەر
چنینا تە بەهرا من
كەس ژ دەستی نا ئینت دەر

گولا زەر هیش بژگۆڤە
لێ نەدا چو بارۆڤە
چو سەرما ئو شلۆڤە
شڤانم ئەزێ ب دویڤە

گولا زەر خەم ڕەڤینە
ساڤایە و عەشق ئەڤینە
نوبەدارم باغچەڤان
من پاڕاستی ژ جڤینە

چەند هێژایی گولا زەر
بێن خوەشێ مسك و عەنبەر
شەنگ و شۆخ ئەو خەملا ل بەر
دلی ب ئاخین كەتبی سەر

# دایێ[1]

ئـــەڤینـــداریێ تـــەمـــە دایـــێ
ڕۆناهیـــــا ڤـــــان چاڤـــــاییێ
چـەنـد حـەشـتە بـکـم هـەر یـا کێمـە
تـــو شـــــرینێ و هێژایـــــێ

دایـــێ مـــەفـــەرێ ئـــاخرەتـــێ
مــن سـەبــر و هــەدار ل دەڤ تــە تــێ
خـــودا ل تـــە بکـــت ڕەحمـــەتـــێ
بـــەرامبـــەری وێ زەحمـــەتـــێ

دایـــێ قـــەدرێ تـــە دێ گـــرم
ب نـــازداری ئـــەز مـــەزن کـــرم
ڕۆژێـــت درێـــژ و شـــەڤێـــت تـــاری
بلایـــێ لایـــێ هـــاویش دکـــرم

دایـــێ تـــو بـــۆ مـــن ســـەمیـــانی
بـــۆ ژینـــا مـــن دلوڤـــانی
خۆشـــیا و نـــەخۆشـــیا شـــڤانی
گـــوری تـــە دکـــم ڕوحـــێ و جـــانی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١/١٠/٢٠٠٩)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# دایێ

ل بەر لاندارا من بی دایێ
ل سەر من نەخۆش تکەهایێ[١]
ژ برس و ترسێ[٢] قورتالکرم
ژ هەمی بەلایێن دونیایێ

شیرێ سپی من ژ بەردن خاری
خودانکرم ب ژیر و ژاری[٣]
ل ڕۆژێن درێژ شەڤێن تاری
ل ئێش و نالێت من نوژداری

خودای قەدرێ دەینای زێدە
ل قورئانا پیرۆز ناڤ تێدە
دەست و پێن تە ل سەر ڤان چاڤا
ڕازی بینا تە ئۆمێدە

ل ڤان تەحلیا نان ب خوێمە
چەند حەشتە بکم هێژ یا کێمە
ڕێز و تەقدیر ل تە بگرم
قەرن ل سەر من هەتا بمرم

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ل سەر من نەخۆش تکەهایێ.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ژ ترس و برسێ.

[٣] ل جهەکێ دیتر: خودانکرم ب تەنگەزاری.

## دایێ

بدەستێن زێڕین لاندك هەژاند
ئەز نڤاندم ل من خەت لوراند
ژ برس و ترسێ قورتال كرم[1]
ڤینا خۆ ل دلێ من دە چاند

كوهداری[2] گۆتنا خودێ مە
چەند حەژ تە بكم هێش یا كێمە[3]
ب گەردەن ئازادكرنێ بڕێ مە
پێتڤی ڕازی بی نێمە

هەی دەرگەهڤانا بەهشتێ
ل سەر جەگەرێ دل برشتێ[4]
دەست و پێێ تە ل سەر ڤان چاڤا
تەقدیر و ڕێز ل من خوەشتێ

تاجا ل سەر سەرێ من دایێ
تو بینەهیا چاڤایێ
بتە سەربلندم ل دونیایێ
ل پاشەڕۆژا من مەفایێ

---

(١) ل جهەكێ دیتر: قورتالكرم ژ ترس و برسێ.

(٢) ل جهەكێ دیتر: دایكێ ل گەل.

(٣) ل جهەكێ دیتر: چەند حەش دایكا بكن كێمە.

(٤) ل جهەكێ دیتر: جەگەر ل گەل خۆ بر كر بشتێ.

## دایێ

دایێ من تو تێر نەدینی
ب زارۆکینی ل من دل سۆتی
دوو هەیڤی بیم خاتر ژ من خواست
کەس نەبینت یا من دیتی

تە هێلام ب تنێ بێ سەمیان
ب سیویانی من بووراند ژیان
بیم شەش سالی هێش بێ شیان
ژن باب هات ل من نەبی خودان

پەریشان بیم ژ بێ کەسی
زکەك تێر و دەهێن برسی
کەتم بەر جك و منەتان
بەر دەستێ ژن بابێ بترسی

بابێ دەینام بەر خواندنێ
چاڤ نەدا من ژ حوکمێ ژنێ
مەزن بیم من فەهم کر ژ دنێ
بین بەهرا من تەحلی ب تنێ

پشتی تە دایکێ مام هەژار
بیرهاتنا ئەز مام داخبار
وێنێ تە دایێ ما ل پێش چاڤ
زارۆك بیم هێلام بێ بندار

کـــافر نـــەمیـــنن بـــێ دایـــك
سـێوی مـــام هێتیمــی کـەت نـك
مـــن بـــێ شــیان بووراند ژیـــان
ئـــەز گـــەهشـــتم ئاسـتەك گرنـگ

ئـــەڤینـــداری تـــە دایكێمـــە
چـەنـد حـەژ تـە بكـەم هـەر یـا كێمـە
ڕازیـــێ ئـــەمـــری خودێمـــە
قـــەدەر بـــی و هاتـــە ســـەرێمـــە



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

# دایێ[١]

دایێ چەند ڕەحما دلیدا
ئەز حەژ تە دکم گەلەك زێدا
ب تە سەربلندم ل ڤێ دنێ
ژ من ڕازیبێ ل من ئۆمێدا

دایکێ هەی دلوڤانێ
سەر من تو دل ب کۆڤانی
ل تە جەگەرم ل من شڤانێ
ل ژینا من تو زێرەڤانی

فەرە قەدرێ تە بگرم
ب زارۆکینی خودان کرم
خودانا دلەك مەزنێ
ل تە قەرزارم هەتا بمرم

دایکێ گەلەك تو هێژایێ
ژین و ڤینێ ل ڤێ دونیایێ
شەمال و فەنەرێ دایێ
ڕۆناهیا ڤان چاڤایێ

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی (٢٠٠٤/٤/٢٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# سەبرا دلا[١]

سەبرێ هەی بەژن شرینێ
رندێ و شەپالێ و تورینێ
شۆخ و شەنگێ و نازەلینێ
فەنەرێ و شەمالا ژینێ

هەر دوو رێین تە سۆرگولن
دەڤ و لێڤێن تە شەکرن
ژ جوانیا تە گول بەلک لێ د وەرن
جیران ژ قەهرادا دحەلن

مێرگ و چیمەنن سینگ و بەر
دوو سێڤێن ئالی سۆرێن ل سەر
روح سڤکا تێکدا گەهوەر
چەند هێژایە گەردەنا زەر

بەخت و باوەر گەلەک جوانی
نوژدارا کول و دەردانی
وەك زینا مەمێ ئالانی
تو تانجا سەرێ ژنانی

نازکێ بوژکۆژا[٢] گولا
خوینا دچت هەمی دلا

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠١٠/٦/١٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[٢] بوشکۆژ.

ل تـــه داخبـــارن حـــەجـــی و مـــەلا
ل خـــورت و پیـــرا یـــا بـــی بـــەلا

دل حـــەلینـــێ هـــەمـــی دلبـــەرێ
دچـــــــێ دلادا و نـــــــائێ دەرێ
دلخۆشـــا دلـــێ بکـــه ســـەرێ
ســـەد خۆزیـــا بـــێ ل بـــەرام بـــەرێ

# سەبرا دلا

ئـــــەڤینــــــداریَ وان چاڤامــــــە
نــە ل گـــەل مـــن بـــێ ئــەز هندامــە
مـــن حـــەژ تـــە کـــر دلـــی پالـــدام
ب نـــۆڕ و تـــەلهـــا ئـــەز ڤـــەمامـــە

ژینـــا مـــن یـــات[1] وان چاڤـــا دە
هـــویڤی گـــەهشـــتن مـــرادە
دەریـــێ دلـــی ل مـــن نـــەدارە
ڤینـــا ل گـــەل تـــە دل پـــێ شـــادە

ڕۆژا مـــن چـــاڤ ب تـــە کـــەتـــی
دل ژ ســـینگێ مـــن دەرکـــەتـــی
مـــن نـــەمـــا حـــال بـــیم ئێخســـیر ژار
نـــەکـــە ل گـــەل من بـــێ مـــروەتـــێ

حـــەژێکرنـــا مـــن یـــا ژ دلـــە
یـــا مـــت[2] ڤێـــتن بوژکـــۆژ[3] گولـــە
دێ ل مـــن ســـاخ کـــت مـــن دل کولـــە
دا بشـــێم بـــژیم ســـەبـــڕا دلا

---

(1) یا د.

(2) من د.

(3) بوشکۆژ.

## دلێ بریندار

دل مام بریندار
بیم ئێخسیر و ژار
مام بێ خەمل وار
لێ نەهات بەهار
گول لێ ڤەنەبین
دوژمنا نەیار

باخچێ بێ خودان
لێ بی زڤستان
ژینێ مام ب تازی
ل خودای دکم گازی
دەردێ بێ دەرمان
نوژدار بۆ نەبین

من دل ما شکەستی
قەی تو بێ هەستی
ل دلی بیم شڤان
هێلام نقستی
کفن ل من بەستی
من مرن خوەستی

# دلێ بریندار[١]

دلێ بریندار
نێ تی هێلا ژار
هەی جانا نازدار
کەسەر بین هەزار
من ژین نەما
بووری ب خەما
ل خۆشیا بێ بار
من ژی بووری
جان بی گۆری
ل من نەکر پسیار
کار بی گری
ل دلێ مری
بێ وار مام هاوار
تە ب خوە حەساندم
ل دلێ خۆ چاندم[٢]
ل هویڤیا نڤاندم
ئیرۆ مراندم[٣]
تە دل قوتا

---

[١] ل جهەکێ دیتر: دلی مری.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئاراندم.

[٣] ل جهەکێ دیتر: نێ تەمراندم.

من ل ته ڤەکر
مێرگ و چیمەن
بێ ڕەوش دیمەن
لێ نەهات بەهار
باغچێ(۱) جوان
مان بێ خودان
ژ سەیرانێت هەر جار
کار بی گری
ل دلێ مری
بێ وار مام هەوار

کراس ته کەرکر
ب دەستێن خودوری
من شینوی ل بەر خۆکر
بۆ خۆ ژ من ڤەکر
تەدل فرۆت
ب ئاگری سۆت
چەند کول و کۆڤان
ل دلێ من دە مان
هەر دوو چاڤێت جوان
بۆ کێ ته هێلان
بێ هویڤی بی
ته ل من کر ئێڤار
چاڤ مان تاری

---

(۱) ل جهەکێ دیتر: باغچێن.

کــــــــــــاری گــــــــــــری

ل دلــــــــــــێ مــــــــــــری

بــــــــێ وار مــــــــام هـــــــــەوار

## دلێ بریندار

دلو بریندارێ
کەس نائێت هاوارێ
خوەش ڤیانە شویکر
بۆ هندە هەژارێ

دلو برین کویرە
کەس ناکەت تەکبیرە
خوەشتڤیا تە دویرە
لو هندە ئێخسیرە

دلو برین زەر بی
کەسێ تو نە ل بەر بی
خوەشتڤیا تە برن
بێ دەرمان و دەرد بی

دلو برین جۆتن
کەس لێ ناکەت گۆتن
خوەشتڤی ل تە فرۆتن
دوو دل ئەوان سۆتن

## بخێر بێ دلبەر

هاتنـــا تـــە ل ســـەر ڤـــان چاڤـــا
بخێـــر بـــێ دلبـــەر کـــەتبـــا داڤ
ل ڤـــێ ســـــەرەدانـــێ دل شـــادم
دل وێـــب کـــەســـەر و کولاڤـــا[١]

گاڤـــا مـــن دیـــت دل لـــەرزی[٢]
ل مـــن ئـەزمـان شـکەسـت ژار و ئـەزی
ژ مێـژا مـت[٣] خواسـتن[٤] ئـەو خـۆزی
ل دلـــی مـــراد حاســـل بـــی زوی

دلبـــەر دیتنـــا تـــە ل مـــن دەردە
چـــاڤ ڕەشـــا دەســـتا ژ مـــن نـــە بـــەردە
ب شـــــەڤ و ڕۆژێ دلێـــت ســــۆژێ
مـــن تـــەبـــات نائێـــت ل چـــو ئـــەردە

ســـلاڤکر مـــن ب شـــرین کـــەنـــی
بـــەرســـڤا مـــن دا دل ســـەکنـــی
ئـــاگرێ ڤینـــێ ل مـــن غـــەونـــی
ســـاخبم نـــەمـــرم تـــو بـــۆ منـــی

---

[١] ل جهەکێ دیتر: خەریبم و دل وێب گولاڤا.
[٢] ل جهەکێ دیتر: کوزری.
[٣] من د.
[٤] ل جهەکێ دیتر: ژ مێژا من دخواست.

## دلمان

دلمان تویَ خۆزیا مت[1] ڤێت
ئەو ڕۆژ نێزیکە دێ هەر ئێت
دا پێکڤە بکەهین مرادێ
یان دێ ل سەر ڤینا تەبم شێت

دلمان کۆڤانداری تەمە
تو ژ من دویر بێ من ژی نەما
دیتنا تە کول و خەمە
تە نەبینم ئەز بەرزەمە

دلمان ئەز وێ کەتیم داڤا
حەیرانم ئێخسیرێ چاڤا
ڕەحمێ بکە ل دلێ بریندار
ژبیرا من ناچێ چو گاڤا

دلمان کا ئەو هویڤی و خۆزی
ل تەبیم مرید زار و ئەزی
نەگەهی من دل دەرزی
ڤینا تە ل دلی ئالزی

---

(۱) من د.

## دل کولم برین

دل کولم برین
ژێ تێت ئاڤ و خوین
تە ئەز حەلاندم
نەشێم بکم ژین

مرن کر خۆزی
ل من بەلەنگازی
چەند ڤین ئالۆزی
ژ من دویرکە تێ زی

تەز[1] هێلام ب تنێ
ل ڤێ دارێ دنێ
ژ خودێ نا ترسێ
دوژمنا منێ

هەریا دوهی بی
ب خۆزی و هویڤی بی
ڤین ل دلی بی
ئیرۆ دو ڕوی بی

---

(۱) تە ئەز.

# بۆچی سلێ

تو خۆزی بی ل بەر ڤی دلی
من زانیبا بۆچی سلی
مراد ئەو بی من باخێڤێ
ڤینا تە ل دلێ مت[1] کەلی

ئەز بکرێ چاڤێت تەما
تە نەبینم من ژین نەما
من نەکە کۆڤانی خەما
خۆ ئێک دلکەچارە نەما

ئەرێ بۆچی تو دەم دەمێ
وەناکێ بەرێ خۆ بدەمێ
تە دیتن یا ل من بی خۆزی
وەک زینا ل بەر دلی مەمێ

دل گرانێ ب گڕنژە
مب[2] دەردێ خۆ تو نەکوژە
ل ڤێ دلمانێ نێ دل هەژا
برینداره خوین ژێت[3] ڕژا

---

(1) من د.

(2) من ب.

(3) ژێ د.

## بۆچی سلی

سل بینا تە ل دلی دەردە
حەیفا ژینا ل گەل نەمەردە
بۆ تە خاپاندم چاڤ ڕەش
مخابن تە ئەڤین بەردە

ل ڤێ دل مانێ ئەز مامە شاش
بریار تە دایی بەروڤاژ
گێ گۆت ڤێ ل من کێ کچا باش
ژینا خۆش من بووراند بەلاش

نێ تو بی تە دل ئاراند
حەژێکرنا خۆلی چاند
سەبەب چبی هێلام ب تنێ
ئیرۆ بەرسڤێ ل من نادی

ڕۆژ دێ ئێتن پەشیمان بی
هەتالاۆ بێ بەها بی
دێ شنوی زانی کی مەفا بی
کا باش بیم یان تو خرابی

# بۆچی سلی

بۆ من بێژه بۆچی سلی
تە ئاگر بەردا ڤی دلی
خەمل و ڕەوشا ژینا مت[١] بی
ڕەحمێ ببە ل من دل کولی

حەژێ کرن بێ دل مانە
ئێ ل ڕێ بچن نە پەشیمانە
نوژدارە ل دلا دەرمانە
ل ڤێ سل بینێ چرا مانە

دوهی بی ل گەل من گڕنژی
ئیرۆ چاڤ ژ ڕۆهنکا تژی
دکێ گلە و گازندا و گری
نێ تو دێ من هوسا کوژی

ئاشت بینا تە هویڤی و خۆزی
ژ من دویربێ من دل دەرزی
بلا بمرم نێزیک و زوی
سەرخاترا چاڤێن مام بزی

---

(١) من د.

# بۆچی سلی

من زانیبا بۆچی سلی
تە ئاگر بەردا ڤی دلی
تو خوش ڤیا دلێ مبی[1]
چ دلمانە و ل من دکێ و گلی

دێ چا وا من هێلێ و دێ چێ
کفنێ ڤینێ ل من وەر پیچێ
تو ل من نەکەڤێ سەر پێچێ
هەی دل کوژێ ب چو ڕوی دێ چێ

سۆز و پەیمان من هێش ساخە
بێ مروەتی شاهد چاخە
بلا هێش زوی تە گۆتبا من
نەهۆ دل دابە بەر داخە

کەسەر تە هێلان دلیدە
ئەڤین شێخە و دل مریدە
چ ل بی بنی ل ژینێ ڕویدە
ب کول و دەرد مام دل پوسیدە

---

(١) من بی.

# دل ب داخم

دل ب داخـــم تـــو ژ مـــن دویـــری
هنـــدی ســـاخم مـــن تـــو ل بیـــری
دەردێ تـــە ئـــەز كـــرم ئێخســـیر
مـــن ژیـــن بوورانـــد ب ژار و ژویـــری

ئـــەز دل نـــازكم بـــێ مـــراد
مـــن ژینـــا خـــۆ ب خـــەمـــا ڤـــەهانـــد
ژینـــا شـــرین ل مـــن كـــر زرانـــد
تـــە دل كـــەركـــەر نـــێ تـــە حـــەلانـــد

مـــن دل نـــەمـــا ل مـــن بـــووری ژیـــن
ئێـــدی نـــەشـــێم پێـــپ كـــم[1] ئـــەڤـــین
تـــە ئـــەز هـــێلام ل هویڤیـــا خۆزیـــا
مخـــابن تـــالی ژێكڤـــەبـــین

ل هـــەمـــی دەردا دەرمـــان هـــەبـــی
یـــا مـــن ل گـــەل تـــەبـــێ فـــەیـــدە بـــی
ل دلـــێ بـــرین نـــوژدار تـــو بـــی
وا دیـــارە نـــەســـیب نـــەبـــی

---

[1] پێ بكم.

# خەون و خەیالێ ل دلێ من د ئالێ[1]

خــەون و خــەیــالێ ل دلــێ مــن دئــالێ
شــوخ و شــەپــالێ هــەی ڕەوشــا مــالێ

دل برینـــــدارم لـــێ ئـــێش و نـــالێ
مــن شــەڤ درێژیــێ تــو هــزرەتــێ ل بــالێ

هــەی دێــم ســۆرگولێ گــەردەن زەلالــێ
تـــو ڕوی نـــازکێ شیشـــا پـــەیـــالێ

کــوژتم وان چاڤــا وەك یــێن غــەزالــێ
تـــو زێـــرێ زەری ل ســـویکا بـــەهـــالێ

تـــو ڕینـــێ ڕنـــدێ تـــو چـــەنـــد دەلالــێ
فــەنــەر و فنــدێ ب شــەوق و شــەمــالێ

چــەنــد ئــەز نــەســاخبم بــۆ مــن نــوژدارێ
هێژایـــێ و مـــەردێ هـــێش تـــو تفـــالێ

تــە نــادم کــەســێ بــۆ مــن خۆمــالێ
ب دەردێ مــن دحــەســێ هــەی کچــا خــالێ

فێقیـــێ دلـــێ مـــن تـــو پرتـــەقـــالێ
بخــودێ ئــەز دزانــم وەك مــن بــێ حــالێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٧/٢٦)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## دل ئاسنێ

دل ئاسنێ من ناحەسێ من دل نەما
نەبێ دلی نادم کەسێ ب کۆل و خەما
وێ ڕۆژا ئەز تە نەبینم ب کەسەرم دل
خەو ب چاڤێت من ناکەڤن د هزرا دەما

بخودێ لاو ئەز دزانم چ مەرەدە
دل ب کۆلم ب ئێش و ژانم ژ دەردێ تەدە
ئەوێ گاڤا ئەز تە دبینم د مالا خودە
نە مێڤانێ تە ئەڤ دلە دخۆشیا ڤەدە

# بۆچی فەلەك مراد نەبی

فەلەك مرادا من نەبی
دەریێ ئاستەنگا ل من ڤەبی
دلبرین دارە ژبەر خەما
دەردێ من دەرمان بۆ نەبی
بۆچی فەلەك مراد نەبی
هەی هەوارە مراد نەبی

ئاگرێ ئەڤینێ هلنەبی
تە دل مراند تو سەبەبی
خۆشی هەمی ل من بەرزە بین
چاڤ ژ ڕۆنكا زوها نەبین
بۆچی فەلەك مراد نەبی
هەی هەوارە مراد نەبی

فەلەكێ دەربەك وەشاندی
ئالۆزكر تەڤنێ ڤەهاندی
هویڤی و خوەزی ئۆمێد نەمان
سوعید ڕەشكر هێلام ماندی
بۆچی فەلەك مراد نەبی
هەی هەوارە مراد نەبی

فەلەكێ هندە خرابی
تە كر ئاخرەت وا ل من ڕابی

تـــو ســـــەبـــــەبـــێ دوو دلا بـــــی
شـــمن[1] فـــەبـــی یـــارێ هنـــدا یـــی
بـــۆچی فـــەلـــــەك مـــراد نـــەبـــی
هـــــەی هـــــەواره مـــــراد نـــــەبـــی

[1] ژ من.

# ئەگەر مرم

ئەگەر مرم گەلۆ ئەرێ
ب تنێ جوبیم ڤێ ئوغەرێ
ئەگەر مرن هات بێ مەفەر
فەرمان دا ژین نائێ دەرێ

هزار سالا ل ڤێ دنێبێ
ب زێڕ و زینەت مال خنێبێ
وەك من هوسا دێب ب تنیبێ
دێ هەر محتاجی خودێ بێ

ل سەر من نەکن تازی و گری
ڤەبر تژیبی ژ ئاگری
شین و ڕەشا ل بەر خوە نەکن
کەس نەبێژن بابۆ مری

دەستێ من و وە ژێك قەتان
کەیف و خوەشی نێ من هیلان
ئۆمێد پڕ بین ل دلێ دە مان
ئەز چووم خێرا گونەهـ ڤەمان

فوئاد بابۆ تو جهگری
ل گەل دەیکا خوە ببە سەری
ئەمانەت تو خووشك و برا
دەستی خوە دەینە سەرسەری

ب كفن و كورگن مال پڕ مێرن
ب رێز و حورمەت من ڤەشێرن
ئاخەك پیرۆز هلبژێرن
دا هەر وەختێ ل من بنێرن

فوئاد بابۆ دلی ڤەكە
هزرا خووشك و برا بكە
حەسێب نەكە نە ل ناڤ وەمە
دەیكا كۆڤان تو ژبیر نەكە

مامێ ئەوێ مای ب تنێ
پێكڤە هەمی گوهـ بدنێ
خوەشی و نەخوەشیا بیژنێ
دێ سەر فەراز بێ ب گۆتنێ

ئەمانەك ئەزمانەك شرین
دێ بوورینێ خۆشترین ژین
دەرمان بە بۆ هەمی برین
دلڤەكەر بە بێ كەرب و كین

فوئاد رۆناهیا مالێ
ب پسمامێ و دۆست و ب هەڤالێ
غەریب قەریب تو مەحبوبێ
یا مت[1] ڤێت بابو تو هۆ بێ

قەبرێ تاری مالا مەیە
مال و زینەت بێ فەیدەیە

---

[1] من د.



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكولینێن كوردی

ب خـــوازە قـــەنجـــی و تاعـــەتـــەك چـــاك
دابگـــــــەهــــــی ئارمانجـــــا خۆیـــــە

دونیــــــا پیچــــــە و هــــــەر هێلانــــــە
مــــــال ژك قرێــــــژا دەســــــتانە
ئــــــاخرەت مــــــالا مــــــە هــــــەمیانــــــە
مــــــرن حــــــەقــــــە بــــــێ دل مانــــــە

## فوئاد

فوئـــاد کـــەکـــو مـــە دل کۆلـــە
نـــاڤ ل کـــوردی ڕامـــان دلـــە

تـــو خـــوین بـــی ژ دلێـــت مـــە ڤـــەبـــی
دێ چـــاوا ژیـــن نـــە ل گـــەل مـــەبـــی

ئـــەم ب شـــەڤ و ڕۆژ د هـــزرا تـــەدە
مـــە جـــەژن هـــات نـــە دنـــاڤ مـــەدە

ب تـــازی و گرینـــە هـــەی هـــەوار
فوئـــاد دویـــر بـــی ل مـــە ڕەش بـــی وار

مـــە چـــەنـــد نـــاڤێ تـــە تـــێن ب وێـــرێ
دەرد و کـــۆلێ تـــو ل دلا د زویـــرێ

هـــەچـــکـــو ژ نویـــکـــا خـــاتر خـــوەســـتی
بـــەلـــێ چبـــکـــین بـــرا دویـــرێ

ڕۆهـــنـــدکێت چاڤـــا بـــارین ڕێـــز ڕێـــز
وێ تـــێن خـــوارێ دل مـــاین بـــێ هێـــز

ل چوونـــا تـــە عـــەزیـــزێ بـــرای
چ بریـــار بـــی هـــۆ بلـــەز تـــە دانـــی

# لاڤین

لاڤینێ گول نەسرینێ
خوشتوڤیا من شرینێ
ئەو ڕۆژا تە نەبینم
نەشێم بژیم ل ڤێ ژینێ

لاڤینێ ڕەوشا مالێ
شۆخێ و شەنگێ و شەپالێ
ب شەڤ و ڕۆژێ تو ل بالێ
ڕندی خەونێ و خەیالێ

لاڤینا من هێژایە
بۆ من فندە و چرایە
ژ جانیا خۆ یا ب بەهایە
لاڤین ڕوحا دلایە

لاڤین بابو حەشتە دکت
ئەو کەیفا خۆ ب تە ڤەدکت
جهێ تە ل دلێ خۆ دکت
هەردەم تە ل ملێ خۆ دکت

# ئەسمەرێ

ئەسمەرێ ڕوح سڤکێ
تووش[1] جانیا خۆ بێ شکێ
خولام دەقا ل ئالەکێ
عەمرێ من هەمی ل نکێ

ئەسمەرێ خوین شرینێ
خوین شەکرێ و هنگڤینێ
تە ڕست تەشیا ئەڤینێ
دەرمانکە ڤێ برینێ

ئەسمەرا چاڤ خویساری
خۆناڤ ژ ڕوییات[2] باری
ڕۆژەکێ ل من بە مێڤان
خەریبیا دل وێ خواری

ئەسمەرێ دێم سۆرگولێ
نوژدارا دلێ گولێ
ب کوڤانم عەردێ تولێ
ل ژینێ فەنەرێ و هلێ

---

(١) تو ژ.

(٢) ڕویا د.

## ئێش و نالین

ئێش و نالین ب دلی ڤەمان
نەخۆشم بۆ چاڤێن جوان
بی سال تەمام د ڤی حالیدە
نە پسیار و نە سەرەدان

حەژێکرنا شیر و شەکر
چو زوی یارێ تە بەرزەکر
یا دلی دگۆت تە وەنەکر
برینەك کویر تە لێڤەکر

ل هویڤیا تەمام تو نە هاتێ
ڕۆژێن جەژن و عەرەفاتێ
چەند گونەهە تە ئەز هێلایم
کی دێ ل دل کت تەباتێ

جەژنا خەلکی ب کەیف و شاهی
کی دێ ل من کت پیرۆزباهی
عەزمان ب خەمە نەما ساهی
ژین ما تاری چوون ڕۆناهی

# لاوكێ سلێڤانی

وەرە مالا مە ب مێڤانی
كورِ و لاوكێ سلێڤانی
من بخوازە ژ دەی بابیت من
دا بزانی تو دلوڤانی

كەتم دەشتا ڤێ دوبانێ
ل تە پسیارا دكم تە مال كانێ
تو حەكیمێ تو لوقمانێ
تو دەردێ دلێ من زانێ

وارێ دۆبانێ بەهشتە
سەردە چیا بندە دەشتە
سینگ و بەرێ من زۆرانن
ئەقن دیاری و گەهشتە

دەشتا دۆبانێ خوەش وارە
لاوێ من تێدە جۆتیارە
من دل كەتێ ئەڤیندارە
ل سویكا دلێ من بەژدارە

# بێ تە نکارم

تــو بكــێ شــڤانی ئــەز بێریڤـــانم
ئــەور بــێ ل عــەزمــانی باران ژێـت بــارم
وەرزێ ش بهــارێ ش[1] مــەهــا نیســانم
تــو باغچــەڤــان بــێ گــول ڕیحـــانم

خوە بكێ ئاغا و بەگ هەر ئەزم خانم
چــەنــد هۆزانڤــان بــێ یــا دلــی دزانــم
بریــنــدار بــێ ژار لــێ ئــەز دەرمــانم
تــو شــەڤ بــێ تــاری هــەیڤــا ل چیــانم

نێچیرڤـــان بـــێ یـــار كـــەتیـــە داڤـــانم
ب كـەیف و سـەیران بێ دەشت و زۆزانم
كوردەك دلسۆش بێ تـەز[2] كوردسـتانم
خـۆ بكـی پێشـمەرگـە جـەك ل ملانـم

تــو ڕیزگــاریخواز بــی گــوری تــە جــانم
ئــازاد بــی ژ بنــدەســت بهێــز و شــیانم
تــە دل نــەخــۆش بــت هــەر ئــەز ب ژانــم
مرنــا ئێكجــاری ل گــەل تــە مێڤــانم

---

[1] ژ.

[2] تە ئەز.

# من توبەیە

ئەگەر هوسا تو ش[1] من ڕەڤی
سۆز بت ئێدی من تو نەڤێ
من ئەڤینی ل گەل تە نەما
ئێدی ل گەل من نە ئاخڤێ

خوە بکێ ئاڤا ڤێ کەوسەرێ
ژێ ناڤەخوم رح بێت دەرێ
بلا ب ئارهن گوینێ بەرێ
چەند ڕۆژان دێ ژبیرکم ئەرێ

شمن[2] دویرکەڤە من توبەیە
ژێک ڤەبینا من و تەیە
بریار من سویندا خواری
ژێکڤەبینا من و تەیە

ئێک دی وەك من دێ مرینێ
دل ڤالایێ و دەرە وینێ
قەد ئێدی تو من نابینێ
هەڕە دوژمنا ئەڤینێ

---

(1) ژ.
(2) ژ من.

## بێخودانم ل من بە مەفەر

من چاڤ ڤێکەت دل کۆوزری
زوها نابن ژێ تێن گری
بۆچی هێلام ل سەر ڤان گولا
سۆزداری یا ل دەڤ تە مری

دلێ کۆڤان کول مانە ل سەر
پەریشانم ب ئاخ و کەسەر
بێ خودانم ل من بە مەفەر
تە ل من سۆتن دل و جەگەر

من حەشتە کر هێش تو ب شیر بی
تە ژبیر ناکم چەند شمن[1] دویر بی
ڤێ ژێکڤەبینێ مراندم
ژبەر هندێ دل زویکا پیر بی

بەس ڤان برینا ب ئارهینە
ژینا بێ تە تام تێنینە
وەرە خەما لێ ب ڕەڤینە
نوژداربە ل سەر ڤان برینە

---

(١) ژ من.

## بین ئێخسیر

بیم ئێخسیر کەتم داڤا
مە ئەڤینی ما ساڤا
دلێ د خەو تە هشیارکر
ب ئاورێن هەر دوو چاڤا

حەژێکرنا من ل دلبی
هەیڤا چاردێ کامل بی
شەمالبی ل ژینێ هلبی
ل باغچێ ڤینا من گول بی

وەك بهارا د گڕنژی
شەکر ژ لێڤا د ڕژی
ل گەل تە نەبم ئەز ناژیم
دێ ب ڤی کاری من کوژی

خەلك کەهشن مرادێ
ئەز و تو مانە پ ڕێڤە
فەلەك چەرخێ ل من بادێ
چوون خوەزی و هیڤی پێڤە

# باوەری مپ[١] تە نەما

دلـــێ مـــن تـــژی خـــەمـــە
بـــاوەری مـــپ تـــە نـــەمـــا
تـــە ئـــەڤینـــی زوی هـــێلا
لـــەویـــریم ژی ل باژڤـــەمـــا
تـــە دگـــۆت[٢] لاو بـــۆ تـــەمـــە
بـــۆچی ل مـــن بوورانـــد دەمـــە

یـــا تـــە کـــری نـــەکـــار بـــی
ئـــەڤ دلـــە ل ســـەر تـــە ژار بـــی
گازیـــەك بـــێ هـــەوار بـــی
نســـاخی ل مـــن دیـــار بـــی
هـــەر وەخـــت ل دلـــی بهـــار بـــی
گـــول چرمســـی نـــێ خـــوار بـــی

کـــا ئـــەڤینـــا ب سوســـداری
کـــا ئـــەو ســـووندێن تـــە خـــواری
مـــە نـــاڤ بـــەیـــن بـــی نـــەیـــاری
محـــەیـــڤ ل ژینـــێ بـــی تـــاری
نـــێ تـــو هـــەر یـــا دوهیبـــی
بـــۆچی ئیـــرۆ ب دوو ڕوییـــی

---

[١] من ب.

[٢] ژ مرنێ.

بـــەخـــت ل نـــاڤ دەریـــا مـــن ڤێـــدا

بـــــایی بـــــر بـــــاڕوڤێ لێـــــدا

بلـــــەرز و ترســـــت شـــــەڤێـــــدە

زەحمـــــــەت چووبیـــــــت ئاڤێـــــــدە

ئـــــەز هـــــێلام دخـــــەوێـــــدە

بـــــیم بـــــەفـــــرا د هاڤینێـــــدە

# دەربەردەربیم

دەربـــەردەربـــیم بـــۆ خـــاترا وان هـــەر دوو چاڤـــا
دل کــەســـەر بـــیم تـــژی کـــولین ژ دەردێ زاڤـــا
تـــە ژبیـــر نـــاکم مـــن ســـۆزادای لێڤـــەنـــابم
شکەربێت[1] خەلکی دێ تە خوازم ژ دایك و بابا

خـــەریـــبم یـــار چـــاڤ ژ ڕۆنکـــا زهانـــابن
ل بیرهـــاتنێ جـــەرگ و مـــێلاك تـــەنـــا نـــابن
کـــم و نـــا کـــم نـــەشـــێم دەســـت شـــتە[2] ڤـــەنـــابن
تـــو شـــمن[3] دویـــرێ هـــەی ئێخســـیر ســـەد مخـــابن

شـــەڤ درێـــژ بـــین چـــەنـــد دل ئێشـــبین ل بـــەنـــدەواره
چـــاڤێن بـــەلـــەك گلاڤێـــژبین مـــان شـــوینواره
ل هـــزر و تـــەخمینـــا دە گێـــژ بـــیم خـــەم و خـــەیالـــە
ژێکڤـــەبینـــە و چـــاره نینـــە و هـــەی هـــەواره

دلـــێ کۆڤـــان ڕهـــ لـــێ ڤـــەتـــان ژ ڤـــێ هیلانـــێ
چـــبکم یـــارێ مـــن ڕێ نـــەمـــان دیـــتن کـــانێ
دێ ل پشـــتێ کـــم بـــارێ خـــەمـــا بگـــەهـــم جـــانێ
خـــوەکـــم گـــوری دا بـــەژدار بـــین ل ڤـــێ ژیـــانێ

---

(1) ژ کەربێت..

(2) ژ تە.

(3) ژ من.

## بۆچی یارێ تو شمن[1] سلی

بــۆچی یــارێ تــو شــمن[2] ســلی
تــه خوینــا ڕشــتی ڤــی دلــی
پێشــچاڤ بکــه گونــەهــا مــن
دلــێ مــن ش[3] کــولا هلهلــی

ڤــێ دل مــانێ چــەنــد ڤــەکێشــا
ڤــەنــەبــی گریــا ئارێشــا
دویرکــەتنــا تــه دل ئێشــا
ڤــەکــۆلا ب دەرزی و درێشــا

دل مــاپ[4] کــەســر ئــاگر تێــده
کــولبی جــەگــەر تــه تیــر لێــدا
ساخ نـابن هنـدی شـمن[5] دویـر بـی
ئــەز هــێلام هویڤیــا مرنێــده

هێــز و شــیان تاقــەت نــەمــا
نــەشــێم ڕاکــم بــارێ خــەمــا
خــودا چــاڤ ل ڕەحمــا تــەمــه
نــەگــەهــێ ژی بــەرزەمــه

---

(1) ژ من.
(2) ژ من.
(3) ژ.
(4) ما ب.
(5) ژ من.

# ئەز تە نەبینم ڕوح شمن[١] جودایە

ئـــەز تـــە نـــەبیـــنم ڕوح شـــمن[٢] جودایـــە
تـــە ل گـــەل مـــن نـــەبـــێ ژیـــن بـــێ مـــەفایـــە
دێ کـــەزیـــا سـپیکم ل سـەر تـــە ڤـــەهیـــنم
سـۆز بـت ئـەڤ جانـه هـەر بـەهـرا تـەیـە

مـــــن تـــــو ڤیـــــایێ ب دلـــــێ خـــــۆ لاۆ
خواســـتم نـــەدامـــێ نـــاڤ ل ســـەرمـــاۆ
ژ کـــەریـــا نـــەســـاخم بلـــەرز کوتـــاۆ
چۆك ل مـن شکەسـتن وێت[٣] گـرتین باۆ

دیـــــار بـــــه لاۆ نـــــێ دل هـــــەژارە
بـــەرزە و هنـــدا و ل تـــە دکـــت پســـیارە
خـــەریبـــێ ئـــەزێ ل دیتنـــا تـــە بلـــەزم
ئـــاگرێ ئـــەڤینـــا تـــە چـــەنـــد دژوارە

ئـــەگـــەر ئـــەز مـــرم ســـەر گـــۆڕی خـــۆ دێ
ئـــەز بمیـــنم ســـاخ بکـــەهـــێ مـــەخســـەدێ
نـــه بـــێ شـــویناکم ژی بچـــتن ســـەدێ
خێلیـــا بیکـــانیێ ب دەســـتێ خـــۆ ڤـــەدێ

---

[١] ژ من.

[٢] ژ من.

[٣] ییێت.

## هیڤی گەهشتن

هیڤی گەهشتن نەیارا ژینێ
دل هات براشتن ب ئاگرێ ئەڤینێ
تو هاتی خوەستن چەنگێت من شکەستن
ئۆمێد تە کوشتن خودێ نابینێ

دێنکا کەزوانێ نە پشتە و نە بەر
دلێ تە کانێ ڕەحم نەبی ل سەر
بێ شك تو جوانێ تە خودان نەکر
زەڤیا ب زیوانێ خودان دل کەسەر

بێبەختا بێ سۆز ل من هنداکر دۆز
دگۆت من ب شەڤ و ڕۆژ بۆ تە پاوان کۆز
ئیرۆ تە چەراند شڤان مەندەهۆش
برین مان بێ نوژ شویل تە نە پیرۆز

خودێ تولا من ل تە ڤەکت بارێ
شویکرنا تە ڕۆنکا لێپ[١] بارێ
نەگێ مرادێ خۆزیا بکێ ل بارێ
ب ئاخینێ و نالین ل چاڤا تە مارێ

---

(١) لێ ب.

# کوشتم وان چاڤێن مام بزی

کوشتم وان چاڤێن مام بزی
برهـ و قەیتان شبتی دەزی
زێرەڤانن لێ بەڕەڤان
جۆت مارن ل سەر ملا گەزی

شەکر و هنگڤین ژ لێڤا تێن خوار
گەرەن شیشە و خال لێ دیار
تە سینگ باخچە وەرزێ بەهار
بلبل ئەزم لێت[1] خوینم یار

قەولێ من و تە ل ناڤ ڕەزی
ڕوینن ل سەر کانیکا تەزی
ب ئەڤینی سۆز مە ل گەل ئێکدان
دلێ من ل دلی ئالزی

خولامی وێ بەژن و بالێ
تو زینێ ئەز مەمێ ئالێ
سیامەندم خەج هەڤالێ
شرینا فەرهاد ل بالێ

---

(١) لێ د.

# من تو نەڤێ هەڕە

مـن تـو نـەڤـێ هـەرە
بـۆ خـۆ ل ئێـك دى بگـەرە
تـە دل وێ حـەلانـدى
پـڕ كـول و كـەسـەرە

ڤیـان نـەپ[۱] هویڤیانـە
نـە دیـتن و دەرمانـە
نـە سـلى و دلمانـە
ژێـك ڤـەبـین پـەیمانـە

ژ دلـێ مـن دەركـەڤـە
ل گـەل مـن نـە ئاخڤـە
تـە قۆنـاغ لـێ نـەمـا
ل كـەلیێـت كـوير نـەنڤـە

تـوت[۲] خـەو دە نـابینێ
ل گـەل مـن نـاكێ ژینـێ
نـەیـارا ئـەڤینـێ
سـۆز مـر دەرەوینـێ

---

(۱) نە ب.

(۲) تو د.

## دلێ ژار بریندارە

چبکم بارێ ئەو نەب خۆمە
دلی پالدام ل ڤێ رێ چوومە
نەشێم بژیم نە ل گەل من بی
شمن[١] نەکە گازندا و لۆمە

ئەڤ دلێ ژار بریندارە
دەرمانکە بار ئێش دوژوارە
شمێژەت[٢] زانێ ئەڤیندارە
بۆچی نائێ لێپکێ[٣] چارە

ل هویڤیا تەمام وێت[٤] بین چەند سال
من لێ دوربین خەم و خەیال
تینێ پێش چاڤ کونەها پار
هێلام بێ تالع و ئیغبال[٥]

بەختێ تەمە ئەی فەلەکێ
دەرگەهێ مرادێ فەکێ
مراندم ئەز چاڤ بەلەکێ
دێ ب دەستا کفنێ من کەرکێ

---

(١) ژ من.

(٢) ژ مێژە د.

(٣) لێ بکێ.

(٤) بێت.

(٥) ئەڤ چار دێرە د هەلبەستا (بێ ئیغبال)دا دووبارە بووینە.

## دوو دلێن سۆزدار[١]

کــوڕ:

ئـــەز کۆڤانـــدارێ چاڤێـــت بـــەلـــەکـــم
هنـدی ئـــەز ســاخبم قـــەد تـــە ژبیـــر نـــەکـــم[٢]
مـــــن ســـــۆز یـــــا دای و لێڤـــــەنـــــابم[٣]
نـــابێژم بمـــرم خـــۆ ژ تـــە ڤـــەنـــەکـــم

کــچ:

سـۆز بـت شـوی نـەکـەم ل مـال بـابێ ڕوینـم
ڤـان کـەزیـا سـپیبکم ب سـەر تـە ڤـەهیـنم[٤]
ڤینـــا تـــە لاو ل دلـــێ خـــۆ بچیـــنم[٥]
یـان ل گـەل تـە بـژیم یـان ژی[٦] نـەمیـنم

کــوڕ:

مـــن ژی[٧] دلبـــەرێ ســـویندەك یـــا[٨] خـــواری
ئـــەگـــەر تـــو نـــەبـــی شـــین نـــەکـــم واری

---

[١] ل جهەکێ دیتر: سۆزداری. ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٢/١٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: تو نە بێ یارێ ڤینێ ئەز نەکم.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ئەگەر سۆزداربی ئەز تە ژبویر نەکم.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ڤەهوینم.

[٥] ل جهەکێ دیتر: دچینم.

[٦] ل جهەکێ دیتر: یان ژك.

[٧] ل جهەکێ دیتر: من ژك.

[٨] ل جهەکێ دیتر: وا.

مـــن ڕوح بێــت[١] دەرێ بچـــم گـــوڕەك تـــاری
ژ ڤـــی دلـــی ڤـــەبـــێ ل مرنـــێ ب دیـــاری[٢]

کـــچ:

هـــــەی نیڤـــــا چاڤـــــا تـــــە دل وێ دزی[٣]
زەنبیـــــل فرۆشــــی ل خـــــاتینێ خـــــوەزی[٤]
ل تـــە ب ئـــەڤینـــدارم نـــە ب دەســـتێن منـــە[٥]
تـــا نـــوو پاژانکـــــە شـــویرها ڤـــی ڕەزی[٦]

کـــوڕ:

ل دلـــێ دەلالـــێ بـــاش[٧] زێـــرەڤـــانم
هـــەر دوو چاڤێـــت ڕەش ئـــەز[٨] لـــێ بخـــودانم
یـــا خـــودێ حـــەســـکەت[٩] چـــو ژێ نـــەزانـــم
بـــەس بمیـــنم ســـاخ ل گـــەل تـــە ب ژڤـــانم

کـــچ:

دەســـــتێن مـــــە تێکـــــدا ل دۆزا ڤـــێ ژینـــێ
مـــــە ســـــۆز گرێـــــدا ب نـــــاڤێ ئـــــەڤینـــێ
ئـــەم لێڤـــە نـــابین خـــودا مـــــە د بینـــێ
مـــــە ل ڤـــێ مـــــرادێ زوی بگـــــەهینـــــێ

---

[١] ل جهەکێ دیتر: بێد.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ژ ڤی دلی ڤەبی ل تەبم. ب دیاری.

[٣] ل جهەکێ دیتر: لاو عەزیز تە دل یێ دزی.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ل خاتینێ خۆزی.

[٥] ل جهەکێ دیتر: وەرە دەرمانکە ئەڤی دلێ کۆل.

[٦] ل جهەکێ دیتر: داڤێن ڤینا تە ل دلی ئالزین.

[٧] ل جهەکێ دیتر: ل زەرێ دەلالێ ئەز.

[٨] ل جهەکێ دیتر: هندی ئەز هەمە هەر.

[٩] ل جهەکێ دیتر: یا خودای حەسکر.

## هوین وەنەكن

هــوین وە نــەكــن هــوین وە نــەكــن
دەســـتێ مـــن شـــیارێ ڤــەنـــەكـــن
هـــێش زارۆك مـــن حـــەژێكـــر
دوو دلا بـــێ مـــراد نـــەكـــن

ل مـــن نـــەگـــرن دەریـــن هویڤیـــا
مـــە هـــەر دووا ئێكـــدوو ڤیـــا
نـــە ل گـــەل مـــن بـــت دل مریـــا
بگـــەهـــێ ئومیـــد و خۆزیـــا

بـــۆچی نـــاهێلن بگـــەهمـــێ
ژ خـــودێ بترســـن بكـــن كـــەرەمـــێ
شـــمن[1] ڤـــەنـــەكـــن چـــاڤێن بـــەلـــەك
ل مـــە حاســـل كـــن ڤـــێ مـــەرەمـــێ

ئـــاگری نـــەبـــەردن هناڤـــا
هـــێش بجیـــك بـــی كـــەتـــم داڤـــا
ڤینـــا دلا نـــە پـــێش چاڤـــا
نـــە ئـــەو بـــی بیـــك نـــەبـــیم زاڤـــا

---

(١) ژ من.

## من نەهێلە ژار

مـن چـەنـد گـۆتی تـە دلـێ مـن بـۆ تـە
ڤـین نـە قـەبحـەتـە ل نـاڤ عـەدەتـە
ئاموشـــگارینە[1] ڤـــە چـــی ســـلبینە
تـــو ڤـــان برینـــا ل مـــن نـــە ئارهینـــە

مـن حـەشـتەکـر یـار مـن نـەهێلـە ژار
ل دلـی بـە نـوژدار ب کـول و بریـنـدار
ئـەڤـین شـرینە بـێ کـەرب و کـینـە
مێرگـــێ بجڤینـــە مـــن نـــەمرینـــە

شـەڤ و ڕۆژ یـارێ ل نـك مـن ئێـك دەمـە
کویسـتانێت سـار لـێ بـڕەڤینـە خـەمـە
ل دلـــێ بهـــاری زۆزانێـــت پـــارێ
تـو چـەنـد نـازدارێ نـێ مـن دل نـەمـە

دلـێن بـێ ئـەڤـین دیلـدار ژێـت ڕەڤـن
گولێن بـەلـگ وەرین ژ دلا دەرت کـەڤن
نـە ژ دل بـت سـلبین گـۆتن سـەر دەڤـن
واریـن بـێ ئـەڤـین کـەس لـێ نـانڤن

---

[1] ئاموژگارینە.

# گوين

یـــا مـــــت[۱] ڤیـــا بـــــازارکرن
ئـــەڤ دلـــە بـــێ هـــویڤیکرن
کـــرم پـــەپیکـــەکـــێ کـــوین
ئـــەز و یـــارێ ژێکڤـــەکـــرن

چـــەنـــد جـــارا مـــن خـــوە ســـتونەدان
دل هـــێلا کۆڤـــان بـــێ خـــودان
تیـــرێن ب ژهـــرێ ل دلـــێ مـــن دان
ژیـــن ل مـــــن کرنـــە زینـــــدان

مرنـــا مـــن ب دەســـتێ تـــە یـــارێ
گـــــەهانـــــدم دارێ ســـــێدارێ
دێ کفنـــی کـــەرکـــە ب وان تـــلا
ل ڤـــێ گونـــەهـــێ تـــو بـــەژدارێ

تـــەت[۲] شـــیا بێـــژی وان هـــەرن
دلـــێ ب خـــودان کـــەس نـــاکرن
ڤـــی دەرگـــەهـــی ل مـــن نـــەگـــرن
ماســـیێن بـــێ ئـــاڤ نـــێ دێ مـــرن

---

[۱] من د.

[۲] ته د.

# دلێ پڕ کەسەر

تە مراندم دێ وەرە
ژ گۆتنا دل پڕ کەسەرە
دڤێن من تە ژێك ڤەكن
وان بێ دین و باوەرە

ل بەندا خۆزیا حەلاندم
ل كول و دەردا نڤاندم
ب ئاگری دل كەلاندم
ب ساخی وان ئەز ڤەشارتم

من چو نەمایە د ڕێدە
ژ غەیری خەم و ئۆمێدە
گەلۆ مانە گونەهە
من ڤین ما دلێ وێدە

ژ مێژا من خۆ ل بەر ڤەنای
خودای تو وا بۆ من دای
وەرە دابچین دەڤ مەلایی
ب ڕەوش بێخین ڤێ ژینا مای

## نوژدارا دلی[1]

من دلێ خۆ ڤەکری
تو لێ مێڤاندار کری
دەلالا ل بەر ڤی دلی
ژ تە غەریبم گولپەری
گەر بمرم تو ئەگەرێ
بریندارم لێ نوژدارێ

نوژدارا دل گەڤر و بەر
ل من سۆتن دل و چەگەر
مام کۆڤان دار دل کەسەر[2]
بێ خودانم تو مەفەر
تو ل ژینێ فندێ و فەنەر[3]
قەد ژ ڤی دلی نائێ دەر
بریندارم لێ نوژدارێ

کەتم هزر و دومانە
دلێ ب کول پەشێمانە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (٢٠٠٤/٢/٢٨)ێ، هاتیە ڤەهاندن. ل جهەکێ دیتر: (٢٠٠٤/٢/٢)، ب دوو ناڤونیشانێن دیتر ژی هاتیە (بریندارم بێ نوژدار، بریندارم).

[2] ل جهەکێ دیتر: بێ خودانم تو مەفەر.

[3] ل جهەکێ دیتر: ل ژینا من فند و فەنەر.

نـــــــه پيتڤــــــــى لوقمانــــــــه
ديتنــــــــا تــــــــه دەرمانــــــــه
نويكــــــه[1] ســــــۆز و پــــــەيمانــــــه
ئــــــەڤينــــــى بــــــێ دلمانــــــه
برينــــــــدارم لــــــــێ نــــــــوژدارێ

---

[1] ل جهەکێ دیتر: نويكين.

## دەلالێ من

ل تـــــه داخبـــارم دەلالـــێ مـــــن
تــــه ئـــاگر بــــەردا دلـــێ مـــــن
خــــوین شـــەكــــرێ و هنكڤینـــێ
تـــه دلـــێ خــــۆ ب خۆشـــی دامـــن

مــــن حـــەشــــتەكــــر ژ نیڤـــا دلـــی
د نــــاڤ دەســــتێت منــــدا تــــو گـــولی
بــــۆ مــــن ئــــەڤینــــا عـــــەولـــی
ل ژینــــێ شــــەمـــالێ و تــــو هلـــی

جــــوانی بـــەس یـــا دۆســـتێ منـــه
ئـــــەو دل و مێلاكـــــــا منـــــه
ئــــەو ڕۆژا ئـــــەز تــــه نـــــەبیـــنم
ئــــەو ڕۆژه نــــه ژ عـــــەمـــرێ منــــه

چــــەنـــد شــــەپالــــه بــــەژنــــا شـــرین
مــــن تـــو ڤیـــای ب عــــەشــق و ئـــەڤـین
ل بیــــرا تــــه بـــم هـــەر وەخـــت و حـــین[1]
مــــــن نــــــەهێلـــــه دل ب بــــــرین

دلـــێ مـــــن پایتـــــەختـــێ تــــەیــــه
ســـــینك بـــــەرز و زانـــــا تــــــەیــــه

---

[1] دەم.

من چاڤێت ڕەش بو تە کلدان
هزرەتا من دیتنا تەیە

سەبرا دلی تو هێژای
هەر وەخت توێ دلیدای
تە چ ژ من دڤێت تو ئازای
دەرمانێ سەر ڤان دەردای

کەنگر زەرێ من دێ وەرە
دەستێ من بگرە و تو هەرە
بگەهم تە بۆ من ئەگەرە
من نەهێلە سەر ڤان کەسەرا

## محەیف چوو زی

هاتــەڤــە ل مــن زڤڕانــد چــەرخــا دنــێ
ئــەز چــبکم جــارەکــا دی مامــە ب تنــێ
پشتی چەند سالان دل پڕ بوو ژ ئەڤینێ
ئاخ فەلەك بۆچی هۆ خەم هاتن شوینێ

فەلەك تە ل من مراندن هویڤی و خۆزی
بۆ من ب تنێ چەلەنگی ل مت[1] ئالزی
ل قۆناغێ بی دەرەنگی محەیف چوو زی
دێ بهێلــە دا شــێن کــم کــەڤنــە ڕەزی

دیسا تە ل من ئاراندی دلێ ب گۆڤان
ل ئەڤان کول و کەسەرا کرم مێڤان
برینێــت کــول نــوژداری دیــتن دەرمــان
نێ گەهشتن مەبەست بێ ئۆمێد نەمان

کــا بیرهاتنێــت بــەرێ ل مــن بــین خــەون
بەهار لێ تێن بێ باران ل وارێن کەڤن
دین بێ ئەڤین تێن ژار زویکا دکەڤن
گولێن بەلگ وەریت سارن دل ژێت ڕەڤن

---

(١) من د.

## کەوا بەهارێ

تە ل دلێ من لاو ئەڤین لێ چاندی
من کوز پاوان کر تو لێ چەراندی
کەتیا داڤێن تە بیم نێچیرڤان تو بی
تە ڤین دژوارە بای دل هەژاندی

کلیلا دلێ من یات دەستێ تەدا
دەری لێ ڤەکە گولا ژێ ڕادە
ب ڕۆژێ تە نەبینم ب شەڤێ د خەونا دا
ئاکر بەر بی من هەوارە خودا

تە شیا من عەڤدالێ نێ ما نە ڕستی
چاڤ ل ڕێ قەڕمین دل ما شکەستی
ل من دیار بە لاۆ ئەز کرم هەستی
دلی دێ کم کول بچنە بدەستی

کرم کەف بەهارێ گێژا تەمە
خەم ژ من ڤەنابن ل دلی ڕێ نەما
کەزیا سپی دێ ل سەر تە ڤەهینم لاۆ
بمرم بۆ ئاخێ ساخ بم بۆ تەمە

# حەیرانۆکێت ب کەنی

کچ:

ناڤێ لاوێ من سەعیدە[1]
هەما هەر جێلی ل سەری بدە
کەسێ تو نەڤێ د بنیدە
خینا تە ناچت دلیدە

کوڕ:

کچکێ دینێ دەڤ لەگەنێ
سەر تەشیێ پێ لەڤەنێ
چوجارا مەتحێت خۆ نەکە
بچێ بەر عەینێ دێ بخۆ کەنێ

کچ:

کورکۆ دینۆ پیس چەپەلێ
سەر مەزنێ تو گوهـ بەلێ
کەس بۆ تە نابێژێت بەلێ
تو دێ ژ قەهرێت خۆدە حەلێ

کوڕ:

کچکێ کورتێ[2] سەر مەنجەلێ
تو بێ پرچێ سەر کەچەلێ

---

[1] ل جهەکێ دیتر: لاوێ مالێ ڕەش عەبیدە.

[2] ل جهەکێ دیتر: سارێ.

تــف تـــڤا مێـــژا ب دیـــڤ تـــەڤـــە
دێ د مــــالا بابێـــــدە[١] حـــــەلـــێ

کــچ:

لاوێ مــــــالێ هونــــەرمــــەنـــدە
هـــەڕۆ ب ژڤانـــە دگـــەل چـــەنـــدە[٢]
چاڤـــــا نقینــــــت ل گۆڤــــەنــــدە
کــێ پــێ بکــەنــت دبێــژت هنـــدە

کـــوڕ:

کچکــێ تــو ب شــکلێ مــەیمینکــێ
نـــەوە دەڤ مـــــن دێ مـــــن دینکـــێ
چـــــاڤ شـــــیحالێ کلمیشــــــوکێ
هشــیار بــی[٣] تــو نــەچــی ســویکێ[٤]

کـــچ:

لاوك یـــــێ ل بــــەر کـــــەمالیــــاتێ
خـــین تـــەحلــە ژ ڕویلـــێ[٥] و کێراتـــێ
دلێــــــرت وەك گــــــورگێ ســــــوباتێ
کـــەس نـــاکڕت ب ئێـــك قیراتـــێ

کـــوڕ:

کچکـــــێ دینـــــێ بـــــێ ددانـــــێ

---

[١] ل جهەکێ دیتر: بابێدا.

[٢] ل جهەکێ دیتر: چەندا.

[٣] ل جهەکێ دیتر: بە.

[٤] ل جهەکێ دیتر: سیکێ.

[٥] ل جهەکێ دیتر: ڕیلێ.

خين سارێ دفن باجانێ
يا تەحلێ[١] هەستی گرانێ
سەر بەختێ من تو نەجوانێ

کچ:

لاوێ مالێ مامۆستايە
د زکێ خودە ئەو ئاڤايە
ڕوحا وی وانا کچکايە
سەر قوتابخانێ بەلايە

کوڕ:

کچکێ دينێ نە مەرغوبێ
دفنێت[٢] تە وەك لوليا زۆپێ
چەند خۆ جانکێ[٣] هەر دێ هۆ بێ
تا مرنێ ل مالا[٤] بابۆی بێ

کچ:

مامۆستانە ب ڕێکوپێکن
مەساجا بۆ کچکا ب ڕێدکن
بەلا بۆ خۆ ل مالێ چێدکن
بەس ئەو د وانێدا[٥] حوبێ[١] دکن

---

(١) ل جهەکێ ديتر: چاڤ کەرمۆزێ.

(٢) ل جهەکێ ديتر: خمخمکێت.

(٣) ل جهەکێ ديتر: چەند خۆ لێك بدی.

(٤) ل جهەکێ ديتر: درێخت وی بەلا.

(٥) ل جهەکێ ديتر: هندەك د وانێدا.

کوڕ:

کچکێ دینێ هنێ منی
محەیف بێژن تە تو ژنی
ئالەك ڕەش پنی پنی
دێ ل ناڤ گلیشی سەکنی

---

(١) ئەڤینی.

## ژین نەما

ژینـــا تـــە ل گـــەل مـــن دەمـــدەمـــە
کـــول بـــی دلـــێ مـــن ژ خـــەمـــا
چـــاڤ ژ ڕۆنـــدکا زوهـــا نـــەبـــین
شـــمرنێ[(١)] پێڤـــە مـــن ڕێ نـــەمـــا

مـــن ئـــەڤ دلـــە بـــۆ تـــە ڤـــەکـــر
ڤینـــا تـــە لـــێ شـــیر و شـــەکـــر
داخبـــار بـــیم زیکـــا بـــەرزەکـــر
شـــمن[(٢)] دیرکـــەتـــی مـــن تـــام نـــەکـــر

ل کـــێ بکـــم و ل کـــێ گازنـــدا
فـــەلـــەك تـــە ئـــەس هـــێلام هنـــدا
ل دەربـــەك تێـــر ئـــاڤ تێهنـــی کـــرم
تـــە چـــەنـــد کـــول هـــێلان دلـــدە

ژینـــا بـــێ ڤـــین نـــەچـــو ژینـــە
گـــولا بـــێ بهـــێن بـــەهـــا نینـــە
دارێـــن بـــێ بـــەرهـــەم برینـــە
دلـــێ ب کـــەســـە نـــێ خـــەمگینـــە

---

(١) ژ مرنێ.

(٢) ژ من.

# ڕوی گول سۆسنا زناری

ڕوی گول سۆسنا زناری
نیشا من دا ئەڤینداری
تە هشیارکر دلێ هەژار
ب وان هەر دوو چاڤێن خۆیساری

من نەهێلە ڤین شەکرم
نە پوشمانم ل تە بزڤڕم
ل شرین ڕویا ئەز بکڕم
نەگەهم تە نێ دێ مرم

ئەزم ژین تو بۆ من بایێ
مەجریمم ئەز تو لەیلایێ
نەسیامەند و مەمێ ئالا
وەك من نەکەتنە بەلایێ

بەهارە ل بەر دلێ کۆڤان
خەم ڕەڤینێ ل من بە مێڤان
دا ئەم نویکین سۆز و پەیمان
دا بووڕینن ژینەك جوا

# غاين

بـــووری غـــاین[١] بـــلا مـــن حـــەش تـــە نـــەكربـــا
چـــەنـــد بـــێ ســـۆزی[٢] دلـــێ د خـــەو هشـــیار نـــەكربـــا
ئـــاخ هـــەی زاڵـــم چ دلـــە ل تـــە ژ ڕەحمـــێ ڤـــالا[٣]
تـــو دێ وەكـــێ ئـــەس خـــوە بكـــوژم ب خـــودێ[٤] ژ كـــەربـــا

نـــێ دوهـــی بـــی بـــویرا خـــوە بكـــە گـــەر دل ســـۆژێ[٥]
تـــە د گۆتـــە مـــن ئـــەس وێـــد ترســـم مـــن ب فرۆشـــێ[٦]
و تـــە ئـــەس هـــێلام دا بێـــژێ مـــن ســـەری ڕۆژێ
پـــەشـــیمانم ئـــەس نـــەوێـــرم و مـــن دئـــاڤیژێ[٧]

مـــن مـــراد بـــی جـــارەكـــێ ل گـــەل مـــن بـــاخڤێ
ئـــەس حـــەلانـــدم[٨] چـــەنـــد مـــن دبینـــێ تـــو ژ مـــن دڕەڤـــێ[٩]
ئـــەرێ بـــۆچی دل ئـــاســـن و ژ خـــودێ بترســـە
مـــن چ كـــرە تـــو دبێـــژێ مـــن، مـــن تـــو نـــەڤـــێ

---

[١] ل جهەكێ دیتر: ب ئاخ و داخم.

[٢] ل جهەكێ دیتر: غاین بێ سۆزێ.

[٣] ل جهەكێ دیتر: جەند زاڵمێ ما قەی تە دل نینە ڕەبەن.

[٤] ل جهەكێ دیتر: ژبەر تە.

[٥] ل جهەكێ دیتر: بینە بویرا خوە دهوییی كەلها سۆزێ.

[٦] ل جهەكێ دیتر: هێش تە گۆت من ئەز وێ ترسم چەند داڤ دۆزێ.

[٧] ل جهەكێ دیتر: ژبەردەیوزێ.

[٨] ل جهەكێ دیتر: من د حەلینێ.

[٩] ل جهەكێ دیتر: چەند من دبینێ من د حەلینێ تو ژ من د ڕەڤی.

دونیـــا د هـــەژت خـــراب نابـــت هـــەر هـــۆ نابـــت
هـــەتـــا بمـــرم خـــەم ژ ڤـــی دلـــی ڕانابـــت[1]
بـــاوەر نـــەكـــە ئـــەس ژ تـــە ڤـــەبـــم[2] ب خـــوە بـــەلابـــت
مـــن ســـۆزا دای[3] مـــەهـــرا مێـــرا ل مـــن حـــەرام بـــت

غـــاینێ بێبـــەخـــت چ دلـــە ل تـــە ژ ڕەحمـــی ڤـــالا
چ زی ئـــەز چـــووم ژ بیراتـــە تـــە چ حالـــە
هـــزرا ڤـــێ ڕۆژێ تـــە نـــەدكـــر ئـــەزمـــان لالـــە
مرنـــا منـــە یـــان ژی یـــا تـــە مـــرن تالـــە

---

[1] ل جهەكێ دیتر: هەتا مرم خەما تە ژ دلی ڤەنابت.

[2] ل جهەكێ دیتر: باوەر نەكە تەركا تە بكم.

[3] ل جهەكێ دیتر: گەر تو نەبێ.

## نه دانه من

نــه دانــه مــن دلبــەرا مــن نــه دانــه مــن
خــەم و كۆڤــان كــرن بــەهــرا ڤــى دلــێ مــن
هەوارە من چەند چارە خوەست تەڤنێ وان بەست
ئەو بى مەبەست نێ دلێ شكەست فەرمانە ل من

هــەر دوو چــاڤێن ڕەش بــەلــەك ژ مــن دويركــرن
سـەبـر نـەمـا چـبكم فـەلـەك دەرگـەهـ كـرن
ئــەڤينــدارين ئــەم هــۆ ژار بــين دوو دل مــرن
وار ڤــالا بــى كـوچــك ڕەش بــين بــێ ئــاگرن

شـەڤ و ڕۆژ ل نـك مـن ئێـك دەمـە مامـە ب تنـێ
بـێ دۆسـت و يـار ئێغبـال نـەمـا حـەيفـە ل دنـێ
نه من كەس ما ژ غـەيرى خودێ هاوار ب كمێ
ل مــن حاســل كــتن مــرادێ دا بگــەهمــێ

مخابنيــا ئــەڤينــدارا هــۆ ژێكڤــەبــين
خۆشــتوڤيا مــن دلبــەر بــى ئۆمێــد نــەبــين
ژ خــودێ بترســن بدنــە مــن دا پێكڤــەبــين
ژين هـەڤال بين ڤين شـەمال بين مـەدل هـەبين

# ئەز خاپاندم

تە دلێ من خۆ دکر باغچەیەك پاوان کری لێت[١] چەراندم
من تۆ بۆ خۆ کر بی کەوا کەدی کری بۆ خاپاندم
ب فەند و فێلا ئەز کرم ژار دل مراندی بێ هێزکرم
هەی جامبازێ ل چەند بازارا دلا دکرێ تەز[٢] حەلاندم

تو ب ڤی ڕەنگی هۆ مب[٣] هێلێ دۆزا ژینێ ل مت[٤] کێ بەلا
ئەکەر دویر بێ ژ ڤینا دلی من ژین نەما غەیری کولا
نە دەرمان و نەچوو نوژدار تەنا ناکی دەردێ دلا
ئەزم بلبل تە بەژن و بال ل بەر دلێ من شتلا گولا

بۆچی هندە تو دورندێ دلێت سۆژێ هەی لەوەندێ
تەیرا بێ چەنگ فر بلندێ توێ نزم کەڤی ل عەردێ
فەیدە ناکت پوشەمانی دەردێ ڤینێ تو نەزانێ
بکرێ دلێ تە ئەز بیم تو ژ هێلینا ژینێ دفرێ

گونەها من، من حەشتە دکر جهێ تە بی ل نیڤا دلی
من هزرا باش ڕۆژێ نەدکر ڕۆژ دێ تێتن دێ من هێلی
هێلام بێ وار دل ماپ[٥] زیمار چەند ئاخێنیا لێت[٦] کێلی
کا ئەو سۆزێن تە بۆ من داین کێ توت[١] کانیا ئاڤێ ب شێلی

---

[١] لێ د.

[٢] تە ئەز.

[٣] من ب.

[٤] من د.

[٥] ما ب.

[٦] لێ د.

## نەبێژە من، من تو نەڤێ

نەبێژە من، من تو نەڤێ
تو ژ ڤی دلی نا دەرکەڤێ
بهارا ژینا من تو بی
ژ خودێ بترسە و دویر نەکەڤێ

ڤینا دلی نە پێش چاڤە
ب ئێک ئاورێ خستم داڤە
کرم ئێخسیر ل ڤینا ساڤە
ئەڤ دلە هێلا ب پەلاڤە

هزر و بیرێت من مان بەلاڤ
چەنگا دلێ من بی سویلاڤە
یا من نژنی هەرافتی
دونیا ل من بی چەرخ و دۆلاڤ

محەیفا وێ بەژنا زراڤ
گەمیا ژینێ هێلا بی ئاڤ
تە ژ من ستاندن ئەو هەر دوو چاڤ
ئەز فرۆتم دامە ب دەراڤ

---

[١] تو د.

# جەگەر قائیم

سەرێ ڕۆژێ دا بێژی من گێر تە نائێم
تە پشتی ئەڤ دلە سۆتی جەگەر قائیم
بۆ خۆ گرم گورەپانە لێت[1] لەیزێ
تەت زانی هەی گونەهە بازێ بێ تە ناژیم

ل ڤێ فەرمانێ نێ هێش زوییی مەبەست بیم ئەس
ج هەوارەك بێ گازیی هێلام بێ کەس
ئۆمێدا دلی خۆزییی تە بینم بەس
تە ئەڤین داڤا دە زیبی هوسا بلەز

ل باغێ ژینێ من ئەڤین چاند هێلا بێ ئاڤ
ل گەمیا ڤینێ ئەز و تو بین ل پێلێن بەلاڤ
ل دەریەك کویر دە جوبێ دەنگ بی کاسەد ئاخ و داخ
ل من بی ئاخرەت تو ژ من ڤەبی بەژنا زراڤ

پشتی تە من ژیان نەما ل ڤی واری
من چاڤ ڕانابن تەبینم ب ڤی کاری
هەی خائینێ هۆ کول و خەما ل مت[2] باری
دونیا ل من کر چەرخ و فەلەك ئەز و ژاری

---

[1] لێ د.

[2] من د.

# دی جاوا ژیم

ئەڤینداری چاڤا ئەز بیم
دەرگەهەڤانێ دلێ تە بیم
تە هۆ ب ئەرزانی فرۆتم
نزانم کا دێ جاوا ژیم

تە ژینا من ل من کر بەلا
دێ ب چی دەرمان کم ڤان کولا
بریندار نێ ڕەبەن دلا
تە براشت و دا سەر پەلا

ڤینا ب درەو دلێت کوشت
چب چب خونێ ژ ڕها تڕشت
خۆزیا من تو نە دیتبیای
نە هوسا ئەڤ دلە بهەشت

ئەبێ سۆز بیم دەرەوینێ
نەخویندار بیم تولێ ستینێ
ئۆمێدار بیم ل ڕێکا ڤینێ
تە نەهێلا بگەهینێ

## ئەڤینی

ئەڤین پەیڤەك شرینێ
ل ژینێ مەست و گڕنژینێ
كول و دەردا ل دلا داخبار
گول ڕیحانا چەق هەژینێ

پسیارا بكن ئەڤیندارا
چەند دلێت ئەڤین نازدارە
ڤین نەكەڤت ل دار و بارە
دلا د حەلینت دوو جارە

ئەڤینی بێ كین و كەربە
خۆزیا دلێ ڤین ل سەربە
ب هەر دوو دەستا لێت كت سلاڤ
دلا داخواز ڤین ل دەڤ بە

ئەڤین دەستپێك ژیانە
ژی بێب ڕەوشە و تێر شیانە
ل دلا جەژنە و لێ سەیرانە
بێ ئەڤین ژبن ئێش و ژانە

## بەخت فرۆش

هەی بێ سۆزا بەخت فرۆش
نێ تە دل کر مەندەهۆش
خۆزیا مرنا ئێك جاری
نە تو مب[1] کوژی هەر ڕۆژ

تە ئەز هێلامە ب تنێ
بێ ئەڤین ل ڤێ دنێ
هەردەم دخوازم مرنێ
مت[2] گرینێ بخۆ دکەنێ

تە حەش من کر دل کری
دخەو بی تە هشیاری کری
ئەڤین نیشا من دا
ئیرۆ خۆ ژ من ڤەکری

تو مت[3] بینێ ئەی خودا
یا مت[4] ڤیای و دل نەدا
خۆشی ل ژینێ ژێ ڤەدا
دا من حەق ژێ بت ئەدا

---

(١) من ب.

(٢) من د.

(٣) من د.

(٤) من د.

## بەهار

ژ وەرزێت سالێ من دڤێت بەهار
هەر سێ مەهێت ژ وەرزا بژار
ئادار گولان بیکا نیسان[1]
چۆل خەملاندن ب ڕەوشن کەتن وار[2]

کەسکاتی کەت زویر و ملا
بەنەفش شین بین و جۆرێن گولا
ل باغچا خوەندن تەیر و بلبلا
ئەڤینداری خستن دلا

ئاڤێت تەزی مێرگ و کانی
چیمەن کویستان دیمەن جوانی
مە ل بن سها دارێت گویزا
مەکر قۆناغ زوم لێ دانی

بین سەیرانگەهین دل ڤەکەر
ژ ڕەنگا کراس بەهار ل بەر
سۆر و شین بین و کەسك و زەر
کچ و کوڕا گۆڤەندا ل سەر

---

(1) ل جهەکێ دیتر: بیکا نیسان و گولان و ئادار.

(2) ل جهەکێ دیتر: چۆل خەملاندن بین سەیران وار.

# بەهار

بەهارا دلڤەکەرە
خەملێ دا چۆل و گرە
ڤێکەتن کچێن گوندی
چوون کارێ و گەنگرە

ل بهارێ کەسک بی ئاقار
ب کەیف و شاهینە جۆتیار
ب تاڤیێن باران هاتن خوار
بەرهەم ئاڤدان بین ژار

وەرزێ بهارێ بیکە
دا بچین سەیرانێ زویکە
گۆڤەند ل خۆرت و قیزە
ل ناڤ نێرکزا و کولیلکە

بهارێ ب ڕەشێ شرین
ب گول و گیا و گول ڤەبین
بێن خۆش بنەفش و بەیبین
بلویلە پەر ریحان نەسرین

## بەهار و گول

سێ مەه ژ وەرزێ بەهارێ جوانن
ئادارا و نیسان و گولانن
لێ ڤەدبن گول شەنگێن خەم ڕەڤین
هەلال و بەیبین و شیلانن
سوسن و بەنەڤش و گول نەخوین
مامبز و نیرگز و ڕەیحانن
هێرۆ و گول بەڕۆژێن چەق هەژین
جەنب ل عەشق ل قەرەنفلا د ئالن
ئادارۆکا کرن باوەشین
گول چیچەك و فولێن بێهندارن
ل گەڤان لویلە پەرا و شەڤ ڤەبین
بێهنا دالیا و ئاسا ئەم خوارن
جورێن موحەمەدا و گول نەسرین
گول شلێر و دەڤێن شێران
ئەون ل ئەڤێندارا ڤین و ژین
سۆرن زەرن خۆشیا دلانن
بەهشتە بەهارا کەسك و شین
ل واری ب ڕەوشن ئەم لێ ب سەیرانن
قەبقەبا کەوا ل چیا دخورین
بلبل و شالویلا ل گەل خواندن
شادین ب ڤێ کۆمبینا پڕ شرین

ئـــەم هـــەڤـــالن دۆســـت و بـــرانن

ل سروشتێ ب خەمل ل گەل باکێ هین

ل بـــەر مێـــرگ و چیمـــەنـــا ڕوبـــارن

ل بـــن ســـها ڤـــان دارا ڕوینشـــتین

وارێ مـــــــە زۆزان و کویســـــــتانن

بـــەژداریـــن ب گۆڤـــەنـــدا و ســـاز ژەنـــین

ئـــاواز و هـــەلبـــەســـت و ســـترانن

# ته بڕی ل من دارا ژینێ

تــو هێجــەتــا ل مــت[1] هلێخــێ
نــەهــا ل ســەردەمــێ مــت[2] ئێخــێ
تــــە بــــڕی ل مــــن دارا ژینــــێ
کــولا ل دلــێ مــت [3]مــەزیخــێ

ئــەڤ دلــێ دخــەو تــە هشــیارکر
ژ خــودێ بترســە نــێ تــەژارکــر
بــێ ســۆزێ تــە ژ خــۆ جــوداکر
ژ وارێ ئــــەڤینــــا مــــن بــــارکر

چــەنــد مــت[4] بینــێ ب دل ئــاخینێ
چیرۆکێت کــەڤن بــۆ مــت[5] خــوینێ
ل بیرهاتنــــا ڕاســــتی تــــەحلــــن
ل ســەر تــە دلــێ پــڕ بــێ ژ خــوینێ

هــێش تــوا ل مــت[6] کــێ گازنــدا
کــــرم ئێخســــیر بــــەردام گونــــدا
ل نــاڤ ئــــەڤنــــدارا مــــام هنــــدا
مــــا دێ دلــــێ خــــودێ چــــەنــــدا

---

(1) من د.

(2) من د.

(3) من د.

(4) من د.

(5) من د.

(6) من د.

## کوشتم ئەوان هەر دوو چاڤا

کوشتم ئەوان هەر دوو چاڤا
دێم سۆرگولن بەفرا ل ناڤا
ژ دەڤ و لێڤا گەز و د بارێ
ل هەر دوو ڕویا ل سەر خۆناڤا

گەردەن ب مەرجان و مووری
کەزی ل سەر بەژنێ دا دبووری
سینگ و بەر زۆزانێت ژووری
سەیرانگەهن ل من خەمخووری

ژ نیشکەکێڤە من چاڤ ڤێ کەت
دل لەرزی کەسەر ڤێ کەت
پێسترکێ هەر دوو پێ گرتن
جهدە مرن ل من بی هزرەت

تو گول بی ل تە باغچەڤانم
ئەگەر عەور بی ل تە بارانم
بەهار بی ژ مەها نیسانم
بریندار بی ل تە دەرمانم

# خستم چەرخا فەلەکێ

تو خەونا من بی بشەڤێ
بۆچی ئیرۆ ژ مت[1] ڕەڤێ
بیم نوبەردار ل خۆزیا
کێ گۆت تو ل مپ کێ[2] ئەڤێ

دلی ئاگر ما تێدا
ل پاشەڕۆژێ و ئۆمێدا
بەخت بی ئار ل ناڤ دریێدا
ل شەڤەک تاری و من ڤێدا

تەدل فرۆت بێ بەها
تەشیا ڤینێ نەڤەها
کرم ئێخسیر زاڵمێ
دەرد و کول مان لێب دەها

خستم چەرخا فەلەکێ
تە کوشتم چاڤ بەلەکێ
گوهداریا خەلکێ نەکێ
دێ دوو دلا ژێک ڤەکێ

---

(١) من د.

(٢) من بکێ.

# خاتر خوەستن

بــێ گاڤــا خـــاتر خـــوەســـتنێ
چـــاڤێن مـــن ڕۆهنـــدك كـــەڤتنـــێ
دكـــم گـــری بـــۆ ســـعویدا خـــۆ
هـــا دیســـا تـــە هـــێلام ب تنـــێ

فـەلـەك تـــە چــەنگێــت مـــن بــڕین
ڕەحـــم و دل وێ ل دەڤ تــــە مـــرین
ژ مـن دویـر ئێخست چاڤ گـول نـەسرین
ل ســەر دلــی هــێلان چــەنـد بــرین

ل كـــول و خـــــەمـــا مێڤانـــدارم
ل دەردێ غـــــەریبیـــــێ بێـــــزارم
ل وارێ نێــــر ملــــێ نـــــەدیـــاری
لـــــەو هنـــــدە ئێخســـــیر و ژارم

د ڕویـــــنم ســــەر چـــوو دەراڤـــا
دل مـــا دامـــــای ب هـــــزرا ڤـــان
مـــن بیرهـــاتن تنـــێ بـــێش چاڤـــا
پشـــتی تـــە وار نـــــەمـــا ئاڤـــا

# حەژێکرن

ئەرێ گەلۆ بۆچی حەژێکرن شەرمە
نەقەبحەتە و نە تاوانە خوین لێ گەرمە
ڕوهنترین دۆز ل ژیانێ دە هەر ئەڤینە
گول بوژکۆژە[1] یت بێن خۆشە دکەڤت دلا

حەژێکرن ڕێ و ڕسمە ل ناڤ جڤاکێ
خورت و لاو زەری دگەرن ب مێلاکێ
ڤینا شرین هیلین ژینێ بێ ئاڤاکێ
نوژدارە ل دەرد و برینا بێ دەرمان کێ

حەژێکرن گران بەها ب زێڕ و زیڤە
نە ب کریار ل چو بازارا یا ب دلیڤە
ئەگەر دلی بەرسڤ ل تە ئەڤبندارا
ب زارەک شرین پەیڤەک نەرم بکە دەلیڤە

حەژێکرن نە یارینە بکێ لگا خوێرێ
ب ئاگری وێ دێ خۆسۆژی ب داڤا کێرێ
بخوینە باش ب شەهەرەزای هلبژێرێ
شنوی بکە ئەڤینی دایکێ ژین نەخۆشیا بنێرێ

---

(١) بوشکۆژە.

## دیم سۆرگولێ

دێم سۆرگولن ل سەر خناڤێ
دەڤ و لێڤا شەڕا ل ناڤێ
چوو بووری هەیڤا ئێك شەڤی
بەرەڤانیین هەر دوو چاڤا

گەردەن زەرا خال لێ دیار
گەڤێن بەفرێ ژێ شەرمزار
سینگ و بەر مێرگن شرین وار
کویستانن چیمەن لێ بەهار

گەزی شووڕیین ب وێ بەژنێدە
ل وان زەندێن زەریازن تێدە
ب بیکانی خۆ خەملاندی
هێش کچ د مالا بابێدە

نزبی ژینا دلی و جانی
تە کەرکر جەرگێ ڕەزڤانی
ئاگری دێ بەردم خۆ خانی
نە بێ هەڤژین و کابانی

# ئاخ غوربەتێ

بەرێ من کەفتی غوربەتێ
دویرکەفتم ژ دۆست و هەڤالا
هەر دوو چاڤا گری کەفتێ
وەلات و وار مانە ڤالا

پەیالا ژەهری من ڤەخوار
گاڤا من هێلا جهـ و وار
پەشیمانم ئەز دکم هەوار
چاڤ تاری بین گرتن تەمار

وەك دەهبەی دەڤ گرێدای
ئەزمان شکەستی بەرسڤ نەدای
دێ نژنم دێ هەرێفم
گەلۆ چی بریار بی من دای

ئەز بیم تەیرێ جەنگ شکەستی
چی تەڤن بی من ل خۆ بەستی
ل وەلاتی بام کۆمەك هەستی
ژبەر ساڤا لستیام دەستی

نەبام فەنە یەر بیانی
چ فەیدە دکت پەشیمانی
ئەو چالا مب(١) دەست کولای
بی زیندانا من نەزانی

---

(١) من ب.

تەیر تازەیە ب ڕەفا خۆڤە
بلا لێبدت چەند باڕۆڤە
مرن چێترە بچم هۆڤە
وەلات هێل قەد نەمرۆڤە

# بلا مب[1] هێلێ

بلا مب[2] هێلێ دێ خۆ ژ تە دویرکم
هەمی چەند سالن ئەز دێ تە ژبیرکم
نە مب[3] کێ شڤانێ کول و دەردا
هەرۆ ل ئاواکێ دلی ل خۆ بیرکم

نانێ من نە سۆتیە ل سەر سێلێ
ئیرۆ مت[4] گرێ سوبا مب[5] هێلێ
چەند جار دوو ڕوینێ دلی دێ کێلێ
کولالێ خرِ دکێ کانێ لێت[6] شێلێ

دلبەر ئەڤینی نە ب ڤی ڕەنگی
تە ل دۆزا ژینی ل من کر دەرەنگی
هەرە ژ من ڤەبە هێش نیڤا ڕیا
من شنویکا زانی کا تو چی سەنگی

ئێخستم داڤێ و ناکێ سلاڤێ
دێ هۆ کێ زاڤێ هزر بەلاڤێ
ڤین دەزینێ چاڤێ پچا وێ گاڤێ
چەند بکێ بزاڤێ قەد من تو ناڤێ

---

[1] من ب.

[2] من ب.

[3] من ب.

[4] من د.

[5] من ب.

[6] لێ د.

# ته نادن من

من تو خواستی ته نادن من
دەیك و باب بین نەیارێن من
ل گەل من نە بێ ناكم ژینێ
خۆشترە ژ ڤێ دەردی مرن

هوین ل من نەكن ئەڤێ چەندێ
لێب ئەڤینم ژمێژا ل بەندێ
من دویر نەئێخن ژ لەوەندێ
چ قوچ پێ من دەینا ل گەندێ

ڤینا من ل گەل تە شەكر بی
ژ هنگڤینێ هێش شرینتر بی
دیتنا تە ل من كرن هزرەت
دلێ من ل سەر تە كەر كەربی

دین و هار بیم كەتم چیا
بیم ئێخسیرێ سەرێ رِیا
وەك مەجریمێ لەیلا ڤیا
ڤینا بێ مراد بۆ چیا

## ئەرێ غاین[١]

ئـــەرێ غـــاین تـــە چ کـــوت مـــن هـــەرییـــا تـــە کـــر
مـــن دلـــێ خـــو یـــێ نـــازدار کـــری گـــوری تـــە کـــر
ب عـەشـق و ئـەڤینـی ئـەڤ دلـێ ژار مـن بـۆ تـە ڤـەکـر
ڤینـا تـە مـن تێـدە چانـد هـەوارا فـەیـدە نـەکـر
سـۆز و پـەیمـان تـە دانـە مـن و خـو ژ مـن ڤـەکـر
تـو یـا ل بـەر دلـێ مـن تـەحلـب ی خـو بکـێ شـەکـر
چـونکی تـە ئـەز هـێلام ب تنـێ و تـە پیـا خـۆ کـر
چیرۆکـا ئـەڤینیـا مـە دەلالا مـن تـە بـەلاڤـەکـر
دلـــێ مـــن دخـــەو بـــی دل ئاســـنێ تـــە هشـــیارکر
چـو مـر ئـەو سـۆزا تـە ل گـەل مـن دای و ئـەدا نـەکـر
ئەز[٢] کرم ئێخسیرێ هەر دوو چاڤا و من حەژ تە کر
شنویکا تو من دهێلی هەی بی هەستێ گونەهـ تە کر
تـە ئـەز[٣] هـێلام بـێ مـراد سـەد هـاوارا تـە چ ل مـن کـر
ئێدی مـن بـاوەری ب تـە نائێت، تـە بێبـەختـی ل مـن کـر
ل بـازاری تـە ئـەز[٤] فرۆتم ب ئـەرزانـی ب حیلـە و مـەکـر
هەی غاینێ بێ وەفایێ دل و جەرگ ل من کەرکەر کر

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٧/١٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئەس.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ئەس.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ئەس.

# ژینا ب چك

ئەو بەهشتا ب منەت     من نەڤێت ئەز بچمێ
ئاگرێ بشیر کرین داوەت     سەرفەرازی دێ چمێ

ل من نەدە چك و تەحنا     کچێن کوردا مشەنە
ب جانیا خۆ ژ تە زێدەنە     چاڤ ڕەشن ئامەدەنە

ژیانا ب ئاڤ و ڕۆهندك     مرنا ل سەر دارێ دنێ
دل مریێ سۆز نەما ل نك     ما تو نەیارا منێ

تەڤینا ل دلی چاندی     بیم زەحمەتکیشێ ماندی
تا نێ پاوان شکاندی     هەچی هات لێ چەراندی

## ئاخ فەلەکێ

ئـــاخ فـــەلـــەك ئـــاخ فـــەلـــەکـــێ
مـــن وەك كـــەســـێ حـــەســـێب نـــەکـــێ
ڕەحمـــــــێ بکـــــــە ل ڤـــــی دلــــێ ژار
دەریــــــــێ مــــــرادێ ڤــــــەکـــــێ

فـــەلـــەك مـــن نـــەکـــوژە بئیـــزە
یـــا مـــت[1] ڤێـــتن پـــڕ عـــەزیـــزە
دل ب ئـــەڤینـــە خـــوین خـــۆیی ڕویـــزە
نـــەبـــە ئاســـتەنـــگ مـــە ژێکڤـــەکـــێ

فـــەلـــەك ژیـــن نابـــت بـــێ ئـــەڤـــین
بــــــۆچی دلا دهێلـــــــی بـــــــرین
خــــەم و کۆڤـــــان تـــــە تێکڤــــەدان
دێ ب ڤـــی کـــاری مـــن بـــەرزەکـــێ

فـــەلـــەك کـــەتـــم تـــو را ڤـــەدە
بـــەس تـــو خـــۆ ژ ڕێکـــا مـــن ڤـــەدە
دینـــێ دیتنـــا یـــارا خـــۆ مـــە
بـــەختـــێ ســـپی تـــۆ ل مـــن ڕەش نـــەکـــێ

---

[1] من د.

# چاڤێن خمیر

شەکروکە زوو بارین ژ لێڤا
ڕویی بەفر خوین وەکە سێڤا
چاڤێن خمیر پڕ ئەڤینن
تیر ژێت وەشن من هنگێڤا

پرچا زێڕین دور و لەعلین
کەزێن درێژ ل بەژنا شرین
پەیڤ نازکا دل حەلین
سینگ پەنیرێ کوردا شەڤین

قامەت ڕەندێ پیتا ئەلیف
ب زەند و بەندێ چەند خوین خەفیف
کەتم تەلها تە لەوەندی
ڕەحمێ بکە ب ڤی دلێ زەعیف

ئەزمان و قەلەم ڕاوەستان
چەند بدم مەتحا کێمە و نوقسان
گول شیلان بە بم باغچەڤان
دل بهارا لێ بم شڤان

## ڤین دەم دەمێ

شەڤ و ڕۆژا گەریام ل دنێ
کەس نەبی ڤی دلی بدەمێ

بەس من ل گەل تە کر ئەڤینی
من نەدزانی تو دەم دەمی

من دل داتە ڤین تێدە بی
تە سۆز دامن تو لێڤەبی

ڕێکا ژینێ ل من بەرزە کربی
ئەگەر بمرم تو سەبەبی

نێ نە هوسانە ئەڤینی
ل بویرهاتنا من د گرینی

ل نێڤا دلی کولا دچینی
تیرێن ژەهرێ ل من د شینی

من کەسەر و کۆڤان زۆرن
ل دلی دئالان دورمان دۆرن

نەشێن ژێنێ ل من بگهۆرن
هەمی چەند ڕۆژن دێ بۆرن

# نەشێم بکم ژین

ئەگەر هەور بێ بارآنم ئەس
شەڤ تاری بێ شامالم ئەس
چیا و دۆل بی لێت[١] شین بم ئەس
چۆل و مل بێ لێت چەرم ئەس
نێچیرڤان بێ خەزالم ئەس
گەر شڤان بێ بیریمە ئەس
باغچەڤان بێ گول گەشم ئەس
ب چەنگ و پەر بێ پێت فڕم ئەس
بێ خودان بێ ل تە دگەڕم ئەس
ئاغە و بەك بێ خاتوینم ئەس
چەند فەقیر بێ ڕازیمە ئەس
گەر نەخۆش بێ نوژدارم ئەس
ئەڤیندار بێ دیلدارم ئەس
نەگەهەم تە من ژ ڤینێ بەس
گەر تو نەبێ من نەڤێت کەس
ڕەحمێ بکە بێ کەسم ئەس

بەفرا سپیمە چیا بێ تو
ل تەباریمە ب ژڤانبە تو
دلسۆتیمە ئەگەر بێ تو

---

[١] لێ د.

نـــهخواســـتیمه ئاگـــهڤـــ بـــه تـــو

پـــڕ خۆزیمـــــه ئارمـــــانج هــــهر تـــو

دهمگریمــــــه ل بیـــــرا مــــن تـــو

نـــه ڕازیمـــــه ژ مــــن دویـــــرێ تـــو

هـــاوارکی مـــه گـــهر نـــهبـــت تـــو

نـه پـــڕ کـــهوێ مـــه ل مــن داڤـــی تـــو

نـــان بـــێ خـــوێ مـــه نـــێ خـــهونـــێ تـــو

مــــراد کێمـــــه دهرگـــــهڤـــــێ تـــو

تێرگریمـــــه ل مــــن ڤـــهکـــه تـــو

ڕێڤنــــــگ ڕێمــــه نێزیکـــــی تـــــو

ماســـــی دێ مــــهلــــێ ئاڤـــه تـــو

ل بـــهر مرنـــێ مـــه هشـــیار بـــه تـــو

ئـــهز گولێمـــــه باغچـــهڤـــان تـــو

# غوربەت

بەرێ من كەت غوربەتێ
ئەز دویركەتم ژ وەلاتی خۆ
ڕێز ڕێز ڕۆهندك چاڤا بارین
پشتی من هێلای وارێ خۆ

ب دەیك و باب بیم ب خۆشك و برا
خۆش توڤی بیم ل خڕ هوگرا
ل غەریبیێ دل كەسەرە
بیرهاتن پێتە و ئاگرە

وا دیارە قەدمر حال بی
دوژمن فەلەك ل من بەلای
بێ كەس كرم هێلام ب تنێ
بۆچیە بژیم هۆ هندابی

خۆزیا كەڤرەك بامە ل چیا
ل دورمانێت من شینیا گیا
نەبام شڤانێ هویڤیا
مالێ دنێ ما بۆچیە

ج فەیدە دكت پەشیمانی
ئەز چووم وەلاتەك بیانی
من دیتن عادات بەروڤاژ
شاخ ل من هاتن چوون عەزمانی

ژ دیتنـــــــا وەلات دویـــــــرم ڤـــــــەدە
ئـــەز بـــیم بـــەریـــا ژ ڤاپـكـــا خـــۆ دەر
ژ خاكـــا بیـــرۆز مـــن دلـــێ ل ســـەرە
نـــادم ب جیهـــانێ ســـەران ســـەرە

# مرن وارە

ئـەز دەسـتێن خـۆ بـەرهـەمبـەری تـە دكـم خـودا
تــو ل مــن حاسـل مــرادێ كوشـتم دەردا
نــێ نــەگونــەهبــی مــن ڤیــا هــەی هــەوارە
گــەر ئــەو نــەبــت نــەشـێم بـژیم مـرن وارە

چـەنـدین سـالا دل سـۆتی مـە ل ڤینـێ بـەژدار
مــن سـعوود و ئیغبالــە ل خۆشـیا بـێ بـار
ژینـا شـرین وا ل مـن تالـە نـە ل گـەل مـن یـار
ئــەو بــی زیــن ئــەز مــەمــێ ئــالا دلبرینـدار

سـۆز بـت خـودا پشـتی یـارێ نـەك ئـەڤـین
دێ توبـەكـم ل مــن ڕۆهنــە بـتن ژیــن
ڕەحمـێ بكـە عـەڤدێ تـەمـە كـرم ئێخسـیر
ئێخسـتم زیندانـەك تـاری بـێ قورتـال بـین

ب ڕۆژی ب هزرم ب شەڤێ وێنێ تە ل پێش چاڤا
ژی ل مـن بـووری خـەم هلگـرم ڕۆژ چـوو ئاڤـا
بـی دەرەنگـی ل هـەر دوو دلا ڤـین مـا سـاڤا
نـە گـەهمێ ب كـول و داخـم دل مـا ب تاڤـا

# دوڕویێ

سەردەڤ یارا دلدە نەیار
چەندین جارا هێلام بێوار
تو ب خۆ دکەنێ مت[١] گرینێ
دلێ پاوان توت[٢] چەرینێ

هەرە ئێدی ل من نەپرسە
هەی بێ سۆزی من ژ تەبە
مار کەزت ژ وەریسی بترسە
دورویێ دل بتە حەسە

ئەڤینی دۆزەك شرینە
وا دیارە تەدا نینە
بلا بم وان ل ئەڤیندارا
كەس دی وەك من نەخاپینە

چەند ساخ بێ دێ دلبەر داخ بێ
دێ ڕۆژ ئێتن دێ هندا بێ
خۆشیێ بژینا خۆ تو نابێ
ڕامالا چاڤا ژ ڕۆهنكا بێ

---

(١) من د.

(٢) تو د.

## خەون و خەیال

ب خـــەون و خـــەیـــالم چـــاڤ خویســـاریێ
ل دیتنـــێ داخ بـــارم ڕوی گـــول بـــەهـــاریێ
گـــــەردەن زەلالـــێ دەق لـــــێ دیـــــارن
دەم و لێــڤ شـــەکـــر گـــەزو ژێـــت بـــارن

گـــولێن زەر زێـــڕین خـــەملـــە ل بـــەژنێـــدە
ئـــەو چـــاڤێن پـــڕ ژیـــن ستێرن ل ئـــەزمێنـــدە
جـــوت بوهـــار ل هنـــداڤ گۆڤـــەنـــد گرێـــدە
ل ســـەر ئـــەنیـــا گـــەڤـــەر بـــەفـــرە ل جێـــدە

شـــۆخ و شـــــەپـــالێ ئـــــەز چـــــاڤ ل دەری
ڕەنـــــدێ هـــــەڤـــالێ ل چاڤـــا بگـــــرم
گلـــێ ســـوبحانی ژ وان چاڤـــا شـــەرمـــە
ئـــاوری بینـــە تیـــر ب دلـــی دڤـــەدگـــرم

ل بـــاغجێ ژنـــا خـــو دچیـــنم ئـــەڤینـــێ
ئاڤـــدم ب ڕۆهنـــدکا ب دلـــوپێن خـــوینێ
ڤـــان شـــەڤـــێن درێـــژ مـــن لێـــت[1] نڤینـــێ
نـــە تـــە گـــەهـــی مـــن دێ مرینـــێ

---

[1] لێ د.

## کانێ خۆشی

من ل ڤێ ژینێ خۆشی نەبین
من دەرد و کۆڤان بین ئەڤین
تو سەبەبی زاڵم فەلەك
تە دل هێلا ب گول و برین

کانێ خۆشی من قەد نەمان
ژی ل من بووری مام بێ خودان
من نە ب تنێ کربی ڤیان
ل بیرهاتنا ئەز بیم شڤان

من ژمێژا دل بریندارە
گەریام حەکیم و نوژدارە
دا دەرمان کم ڤی دلێ ژار
چبکم فەلەك ل من نەیارە

چی دەرد بی ئەز ئێخستمێ
من ژین بی زیندان وەك مەمێ
یا مت[١] ڤێت ئەز نە گەهمێ
دێ ڤی ژی گوریکم هەمێ

---

(١) من د.

# من دل ما ژار

نێ ژینا من بێ مرن
لوما نەكن ل من نەكرن
دلێ ژار ئاگر ما تێدە
یا مت[1] ڤیا ژ من ڤەكرن

تو ژ من دویر كرێ نەمەردا
نەدانە من كۆڤان دەردە
وێت[2] بین كەسەر ل دلێ كولدە
ئەڤینا تە من بەردە

ترسم بمرم ب ئەڤان خەما
ساخ بم بژیم ئەز بۆ تەمە
وەناكم كەس لێ بت خودان
بەڕەڤانێ ڤینا خۆمە

سۆزبت یارێ بێ لێ ئەڤین
پشتی تە ئەز نەكم ئەڤین
ل هویڤیا تەمە بم ل دلێ برین
دێ هەر ڕۆژ ئێت ل من بی هەڤژین

---

(١) من د.

(٢) بیێت.

# تو ژ من ڤەبە[1]

ئەگەر تە ئەڤینی هەبا
ڕەحما خودێ ل دلێ تەبا
تە ئەز نەت[2] هێلام هۆ بێ ژین[3]
بەختێ تەمە تو ژ من ڤەبە

خەم و کۆڤانێت من زوورن
دەرد ل دلێ دورمان دوورن
نەشێن ژینێ ل مپ[4] گهۆرن
هەمی چەند ڕۆژن دێ بوورن

کێ گۆت داڤا ل بەر من ڤەدێ
هۆ زوی ل مپ[5] ئالزن ڕەندی[6]
من نەت[7] زانی ب فێل و فەندی
هەتا تو ل من بکێ ڤێ چەندێ

تورینن کچێت چاڤشین

---

(1) ل جهەکێ دیتر: دەرەوینێ.

(2) نە د.

(3) ل جهەکێ دیتر: هۆ بریندار.

(4) من ب.

(5) من ب.

(6) ل جهەکێ دیتر: مپ کێ قوربانی ڤێ چەندێ.

(7) نە د.

شـــەنـــگ و شـــوخێ خـــەم ڕەڤـــین
ل ئـــەڤینـــێ دكـــن بـــاوەشـــین
لاوا دل بـــــۆ هـــــەر شـــــین

دارا ژینـــــێ دێ ل خـــــۆ بـــــڕم
دلـــێ بـــێ ســـۆز قـــەد[1] نـــاكڕم
بـــاوەر نـــەكـــە ل تـــە بزڤـــڕم
بـــلا بـــێ ئـــەڤـــین بمـــرم

[1] ل جهەكێ دیتر: ئەز.

# نازیا نەکە

ب جانا خۆ گەفا ل من نەکە
دونیا هە چەرخ و فەلەك
بهێلە بکەهین مرادا خۆ
نەمینە دخەو چاڤا ڤەکە

تە ژ ڤێ چەندێ مەبەست چیە
ئەڤە ئەو بی یا تە ت[1] ڤیا
ئەڤینداری نەیا ڕیە
کلیلا دەرین گرتیە

من تاخێڤی بسەرێ لێڤە
نازیا نەکە من با خێڤە
من زانیبا تو هوسا نێ
شمێژا[2] دا تە هێلم برێڤە

ئەگەر دێ هو من ئێشینێ
ژینەك بێ مەفادێ بینێ
تودێ دودلا مرینێ
باش ڕۆژ دویرە ناگەهینێ

---

[1] یا تە د.

[2] ژ مێژا.

## من بدنێ

مـــن ژی مـــا بـــت ئێـــك ڕۆژ تنـــێ
کـــەســـێ مـــن دڤێـــت مـــن بـــدنێ
کـــول و کـــەســـەرا دل مرانـــد
ئـــاگری هـــوین نـــەبـــەردنـــێ

نـــە گونـــەهکـــارم حـــەژێ دکـــم
دل ئـــەڤینـــداره چلـــێ بکـــم
نـــەزانـــم کـــا پیـــا کـــێ بکـــم
یـــا دلـــێ خـــۆ بـــۆ تـــە ب ڕێ کـــم

ژ خـــودێ بترســـن ڤـــێ ل مـــن نـــەکـــن
مـــن خـــەم و کۆڤـــان گـــەلـــەکـــن
دل برینـــــدارم بـــــێ دەرمـــــان
چـــەنـــد ئـــەڤینـــدار بـــێ فـــەلـــەکـــن

چـــەرخـــا دنـــێ ل مـــن زڤـــڕی
دارا ژینـــێ وە ل مـــن بـــڕی
ڕابـــم رویـــنـــم چـــاڤ ب گـــری
حـــەیفـــا ڤـــی ژی و دلـــێ مـــری

## هات زەمان

هـــات زەمـــانێ حیلـــە و مـــیلا
دونیـــا كـــەتـــی ســـەر بـــەرتـــیلا
بـێ كـەد و كـەسـب فـەقیـر مـان ژار
زەنگینێـــــت مــــەنـــە دل پــــیلا

ســـەر ئـــەڤـــراز دچـــت ئاڤـــا خورتـــا
كراســـێ فـــەقیـــری هـــەر كورتـــا
تێـــری قـــەد هـــاش[1] برســـی نینـــە
ل پـــــارا دولێنـــــت وەك قورتــــــا

كـــی بـــەرپرســـە بـــۆ ڤـــێ چـــەنـــدێ
كـــەس تیناچـــت ڤـــێ گۆڤـــەنـــدێ
ڤـــان خـــوینمێژا دلـــێ مـــە خـــوار
بـــارێ فـــەقیـــری مـــال عـــەردێ

بــــــەرپرســــــا ب دولار فـــــــرۆتن
تێـــت ســـۆتنێ نـــا ئێـــت گـــۆتن
ســــــلاڤ ل بــــــارێ حــــــازرن
بـــۆ وان نـــەخـــەمـــەكـــە بیـــتن

---

[1] هاژ.

## خۆشیا ژینێ ل من بی مرن

خۆشـــیا ژینـــێ ل مـــن بـــی مـــرن
لۆمـــا نـــەکـــن ل مـــن نـــەگـــرن
یـــا مـــت[١] ڤیـــا چـــو ئـــەز هـــێلام[٢]
فـــەلـــەکـــێ ئـــەم ژێکڤـــەکـــرن

هـــەبـــی هـــەوارەکـــا ســـۆزداری
ل ئـــــەڤینـــــدارا وارا تـــــاری
دلـــێ ڕەبـــەن کـــولا خـــاری
مـــا بکـــە ســـەر و کۆڤـــان ژاری[٣]

کـــێ گـــۆت تـــو مـــن بێخـــێ داڤـــا
بـــەس بیرهـــاتن مـــان پـــێش چاڤـــا[٤]
ب چـــو جـــوره خـــوینێ دلـــێ تـــە[٥]
ژ ڕەحمـــێ ڤالامـــا ئـــەو ئاڤـــا

خۆشـــی و گرنـــژین مرانـــدن
خـــەم و خـــەیـــال تـــێ ئالانـــدن[٦]
چـــو ڤـــین ل دلـــی نـــائێن چانـــدن[٧]
تـــە ل مـــن حـــەلانـــد هـــات نڤانـــدن[١]

---

(١) من د.

(٢) ل جهەکێ دیتر: یا من دڤیا نەدانە من.

(٣) ل جهەکێ دیتر: دل مام کەسەر و کوڤانداری.

(٤) ل جهەکێ دیتر: بیرهاتن هێلان پێشچاڤا.

(٥) ل جهەکێ دیتر: ما خوینا دلی چ جۆرە.

(٦) ل جهەکێ دیتر: خەم و خەیال ل دلی چاندن.

(٧) ل جهەکێ دیتر: تە کوشتم بێ ڕاگەهاندن.

## دەستێ تەنگ

براستی مرنە دەستێ تەنگ
دەستێ ب تنێ ژێ نائێت دەنگ
خێزانی مالا خۆ بارکە
تە ل ڤێ ژینێ ل من کر دەرەنگ

مروڤ بێ پارە هندایە
ل ناڤ هەڤالا بێ بەهایە
دل ئیشێ کول و خەمایە
کۆڤاندارە ڕوح بەلایە

ئەگەر بەخت ب فرۆتن با
ئەز داگرم بەها ڕوح با
نە ب ڤی کاری بەلەنگاز بام
نەمێش ئەز ساخ من دل مربا

ب خوسارەت چوو ژی ل من بۆری
ل دۆزا ژینێ بێ ئابۆری
دەستێ ڤالا جان یێ گۆری
نابێ دەولەمەند بزۆری

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ل کەلییەك کویر هاتم نڤاندن.

## ژینا ب تنێ

مـــن نـــەڤێـــت ژیـــن ل ڤـــێ دنـــێ
بـــێ کـــەســوکار هوســـا ب تنـــێ
کـــا هـــەڤـــال و دۆســـتێن دەلال[1]
خـــۆزیێ دخـــوازم بـــۆ مرنـــێ[2]

دلـــــــۆ ژارۆ[3] تـــــــــویێ وارێ
ل هـــــزر و بیرهاتنـــــا د ئـــــارێ[4]
ڕۆنـــــدك ژ چاڤـــــا تـــێن خـــوارێ[5]
وەکـــە تـــاڤیێن ڤـــێ بـــەهـــارێ

ســـەد مخـــابن[6] ئـــەم ژێکڤـــەبـــین
چـــووم دویرکـــەتـــم خۆشـــی ڕەڤـــین[7]
ئـــەز بـــیم مێڤانـــدارێ گـــری
شـــوینا ڕۆنـــدکا ژ چاڤـــا تـــێن خـــوین

---

[1] ل جهەکێ دیتر: کا دۆستێن ئەز ل وان هەڤال.

[2] ل جهەکێ دیتر: خۆزی من خواست بۆ مرنێ.

[3] ل جهەکێ دیتر: دلۆ غەریب.

[4] ل جهەکێ دیتر: هزر و بیرهاتنا ژاری.

[5] ل جهەکێ دیتر: ژ چاڤا ڕۆندك پێ تێن خوارێ.

[6] ل جهەکێ دیتر: هەی هەوار.

[7] ل جهەکێ دیتر: خۆشی چوون گرنژین ڕەڤین.

ل خـــــەريبـــــێ دل مـــــا ڤالـــــە[١]
مـــن دەســـت قـــەتـــان ژ هـــەڤالـــە[٢]
رێڤنـگـــــێ خــــەم و خـــــەيالـــــە[٣]
دلـــــــێ برينـــــــدار بنالـــــــە[٤]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ئیرو دلێ من ما ڤالە.

[٢] ل جهەکێ دیتر: کا ئەو خۆشیێن هندە سالە.

[٣] ل جهەکێ دیتر: چوو جار ژبیر ناکم هەڤالە.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ژینا بێ وە نە چوو حالە.

# دل کرێ

یــــــارێ هنـــــــده[١] دزڤـــــڕی
ل دلـــــێ مـــــن تـــــو بکــــری[٢]
حــــــەژێکــــرن نــــەشـــــەرمــــە
خــــــەجـــێ و زینــــێ واکــــری

ئــــــەژی وەك تـــــــە دلـــــــدارم
خـــــــــودانێ دلـــــــــــەك ژارم
لــــێ گولبــــــە وەز بـــــەهـــارم[٣]
دێ بـــــم بــــاران لــــێ بـــــارم

یــــــارێ مــــــن ڤــــین وا دلـــــده
هــــەر دوو چاڤـــا ل مـــــن هلـــده
تـــــو نــــــوژدار ئــــــەزم دلبــــــرین[٤]
دەرمانکــــــــــــە کـــــــــول و دەردە

ئــــەز ڕوینشــــتم بـــــەر هـــــەمبـــەر
چــاڤ ڤێکــەت دل مــاپ[٥] کــەســەر
خودانـــــــا گــــــــەردەنــــــا زەر
ل ژینــــا مــــــن ببـــــە مــــەفـــەر

---

[١] ل جهەکێ دیتر: یارێ تو ل مت.

[٢] ل جهەکێ دیتر: وا دیارە دلکری.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ئەگەر گول بێ بەهارم.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ل ئەڤێ دلێ تێر برین.

[٥] ما ب.

# دلداری[1]

کوڕ:

حەژ تە دکم هەڤالا ژینێ
سەر ڤان لێڤا گڕنژینێ
گەر نەبینم کەسەر دارم
تە ئەز کوژتم[2] خەم ڕەڤینێ

کچ:

لاۆ تە خەلك ب من حەساندن
نەترسە نائێم خاپاندن
ڤینا تە ل دلی هات چاندن
تە برینێت من ئار هاندن

کوڕ:

دلداریێ وان چاڤا ئەزم
زوی بگەهە من گەلەك بلەزم
دل مام سۆتی ڤین ما تێدە
یا تو دزانێ ئەز بێت حەسم

کچ:

لاۆ تە ئەز تێگەهاندم
دل لانداریی و لێ نڤاندم
ب ئەڤینی تێدە هەژاندم
ب مێڤانی ل دلی حەواندم

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٨/٤/٢٠٠٤)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) کۆشتم.

# نازك شەپالێ

خۆزیا وێ مالێ دلبەر تو تێدە
نازك شەپالێ دلێ من لێدە[١]
ئەز کوشتیێ وان چاڤێن بەلەکم[٢]
گەلەك مت[٣] ڤیا[٤] ژ ڕوحا خۆ زێدە[٥]

دەرکەت بەر دەری ب کوکە بەژن و بال
گول شەنگا پەری ل دلی تو خەیال[٦]
ڕۆناهیا[٧] ژینێ فەنەر و شەمال
ڕەوشا[٨] ئەڤینێ نازدارا دەلال

شۆخا زەریا دل بەر هەر توبی
جوتێن کەزیا زەریێن کەهرەبی
ڕویکێن سوسنی بەفرا کەڤیا[٩]
دەڤ و لێڤ شرین هنگڤین پێڤەبی[١]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: خۆزیا وێ مالێ دلبەر تو تێدە.

[٢] ل جهەکێ دیتر: وان چاڤێت بەلەك ئەز کوشتم فەلەك.

[٣] من د.

[٤] ل جهەکێ دیتر: من حەشتەکری.

[٥] ل جهەکێ دیتر: گەلەك من ڤیا ژ ڕوحا خۆ زێدە.

[٦] ل جهەکێ دیتر: گول شەنگا و پەری ل ڤی دلی خەیال.

[٧] ل جهەکێ دیتر: ل دۆزا ڤێ.

[٨] ل جهەکێ دیتر: هەی ڕەوشا، تیرۆژکا ڤینێ.

[٩] ل جهەکێ دیتر: سەر ملا دەتێن ل وێ بەژنا زراڤ.

بـــەهـــاترین تشـــت بـــەس ڕوحـــا بتنـــێ
دێ گـــۆری تـــە کـــم ل ســـەر دارێ دنـــێ
بـــەس ببـــێ[2] هـــەڤـــژین داخـــوازا منـــێ
پشـــتی مـــرادێ بخێـــر بـــێ مرنـــێ[3]

---

[1] ل جهەکێ دیتر: داخواز خۆزیە هەڤژینا من بی.

[2] ل جهەکێ دیتر: ل گەل من بێ.

[3] ل جهەکێ دیتر: دێ شنویکا بێژم بخێر بێت مرنێ.

# ژینا ب ئەڤینێ

ژینا ب ئەڤینی
دێ ل گویڤە بینی
دل دارەك سۆزدار
دا تەنگت ژار
تو مب[1] خاپینی
دێ من حەلینی

فینا تە یارێ
گیاکێ بەهارێ
ئاڤ ل بن نەما
ب ئاگری قەما
کا خەملا دارێ
ڕۆهندك تێن خوارێ

یارا بێ وەفا
گۆتن سەر دەڤا
نەش نیڤا دلی
ناجت ئاقلی
شەڤبیرین شەڤا
توش[2] من نەڕەڤە

---

(1) من ب.

(2) تو ژ.

ئـــەگـــەر حـــەشـــمت كـــێ[1]

دێ دلـــــــى ڤـــــــەكـــــێ

ڕۆژێ بــــــــــۆ ڕينـــــــێ

تـــــو مــــــن نــــابينى

هــــــزرا خــــــوه بكـــــێ

هـــــەڤڕكيـــــێ نــــەكـــــێ

---

[1] حەژ من دكى.

# بێ ڕەحمێ[1]

پـــــــەریشـــــانێ وان چاڤـــــانم
دل خــــەریبـــێ دیتنـــا وانـــم[2]
ڕەحمـــێ ببــە تــو ب حـــالێ مـــن[3]
دویـــر و نێزیـــك لـــێ ب خـــودانم[4]

خـــودا تـــو دەردێ مـــــت[5] زانـــــی
یـــا مـــت[6] ڤێـــت دل دەرانـــــی
مـــت[7] ل ڤینـــا وێ کـــر شـــڤانی[8]
مانـــــە بــــەســــە پـــــەریشـــــانی

دلبـــەر[9] چـــبکم مـــراد نـــەبـــی[10]
دلـــێ مـــن ســۆت تـــو ژ مـــن ڤـــەبـــی[1]

---

[1] ل جهەکێ دیتر: پەریشانم.

[2] ل جهەکێ دیتر: ڤین بێ کەسێ لێ ب خودانم.

[3] ل جهەکێ دیتر: تو ڕەحمێ نابن ب حالێ من.

[4] ل جهەکێ دیتر: هەی بێ سۆزێ لێب خودانم، ڤین بێ سۆزی لێب خودانم، ژ کول و دەردا بارگرانم.

[5] من د.

[6] من د.

[7] من د.

[8] ل جهەکێ دیتر: من ل ئەڤینێ دکر شڤانی، ژین بووری ل ڤینێ ب شڤانی.

[9] ل جهەکێ دیتر: هەوار.

[10] ل جهەکێ دیتر: چبکم هەوار مراد نەبی.

دێ مــن كــوژێ نــەگــەهــێ مــن[2]
ســـاخبینا مـــن ل ژینـــێ تـــوبی[3]

فــەلــەك وا ل مــن بیــە نــەیــار[4]
پــەریشـــان بـــیم ئـــەز كـــرم ژار[5]
دلـــێ ب ئـــەڤـــین مـــا بـــێ بـــەهـــار[6]
هــــێلام ب تنــــێ دل بریـنــــدار[7]

---

[1] ل جهەكێ دیتر: داخواز گول بی ل من ڤەنەبی.

[2] ل جهەكێ دیتر: ئەز دێ مرم نەگەهمێ.

[3] ل جهەكێ دیتر: ڕەوشا ژینا من هەر تویی.

[4] ل جهەكێ دیتر: دلبرینم زاڵم فەلەك.

[5] ل جهەكێ دیتر: گەر نەبینم چاڤێت بەلەك.

[6] ل جهەكێ دیتر: پەریشانم خودا گەلەك.

[7] ل جهەكێ دیتر: دل دامایمە من ڕوحا ل نك.

# هێلا بێ وار

دل خالی بی و مر
ئەمان بێ هۆگر
تو بی ئەڤیندار
تە دەرگەه ڤەکر

دلێ من تە خوار
تە ئەز کرم ژار
دکم قیری و هاوار
تە هێلام بێ وار

دل ما بێ خودان
پڕ بی ئێش و ژان
خاپاندم تە ئەز
ل من مراند ژیان

ل دلی چوو بەهار
لێ نەمان شینوار
ل من کر ژەهرە مار
من هەر ژی فەخار

## ل من ڕەش كرن ژين

تــــە ل مــــن ڕەشـــكر ژينـــا شـــرين
تـــو ئـــەگـــەر بـــی دل مـــاپ[١] بـــرين
كێ گۆت تـو ڤينێ ل گەل مـن بكێ
ڕهـــــێن دارا ژينـــــێ بـــــرين[٢]

تـــە ئـــەز هـــێلام ل ســـەر ڤـــان كـــولا
دلـــێ مـــن ئاســـن بـــی و حـــەلا[٣]
تـــە ڕوح وال مـــن كـــری بـــەلا
دێ چـــاوا ژيـــم[٤] ســـەبـــرا دلا

مامـــە ب تنـــێ بـــێ بـــەنـــدەوار
ل دارێ دنـــــێ ئێخســـــير و ژار
تـــەيـــر و تـــەوال ســـەر مـــت[٥] گـــرين
جدلـــــە ل تـــــە خـــــودا هـــــەوار

بـــێ ڕەحمـــێ كاڤينـــا هـــــەژی
كـــرم قوريـــان ل مـــن بـــووری ژی
مرنـــا ئێكجـــار جـــەژنـــە و خۆشـــی[٦]
نـــێ تـــوا مـــن هـــەڕۆ دكـــوژی

---

(١) ما ب.

(٢) ل جهەكێ ديتر: تە هەمی ڕێك ژ من برين.

(٣) ل جهەكێ ديتر: من دل كر ئاسن و حەلا.

(٤) ل جهەكێ ديتر: نەشيم بژيم.

(٥) من د.

(٦) ل جهەكێ ديتر: كوشتنا ئێكجاری خوەشی.

# پەریشانم

خودا ما ئەز تە بۆچی دام
بلا هێش زویکا ئەز مربام
ژین وا ل من بی زین و[١] زیندان
پەریشان و بێ حال ئەز مام

خودا تو ب ڕەحمێ و مەزنێ
ئاگەهدارێ دلێ منێ
ئێخسیرکرم ل دارێ دنێ
پەریشانی دامن ب تنێ

بێ سعوید[٢] و مرادم ئەس
لومەهیا ژ من نەکن کەس
پەریشانەك دل[٣] سۆتیمە
هیڤی[٤] هندا من ژینێ بەس

من بەلك هشك بی ژ دارێ وەریا
نە مەلەڤان کەتم دەریا[٥]
کوچك ڕەش بیم ل[٦] ڕێزا مریا
مرن هات و[١] ل من گەریا[٢]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: نێ من ژین وا ل من بی.

[٢] ل جهەکێ دیتر: تالع.

[٣] ل جهەکێ دیتر: پەریشانێ وار.

[٤] ل جهەکێ دیتر: تالع.

[٥] ل جهەکێ دیتر: من ئیغبال کەت بنێ دەریا.

[٦] ل جهەکێ دیتر: بەخت ڕەشبووم.

# مامێ نەجم

مامێ نەچم ئەز دل کولم
کۆڤاندارم مرنێ دکرم
دل دامایمە و پڕ ناگرم
بریندارم کویڤە هەرم
هندی ساخم دل کەسەرم
بێ مرادم ڤین ئەگەرم
تەیرێ ژ هەڤالا ڤەدەرم
من چەنگ نەمان پێ بفڕم
خۆشی نەمان لێ بزڤڕم
بەهار نەما کو لێ بچەرم
مامێ نەچم خەم هلگرم
یا مت[٣] ڤیا بێ سەرگرم
وێ دل نینە و لێ ناگرم
ل گەل بێ سۆزانە ب باوەرم
ژین مام تاری بێ فەنەرم
خۆزیا دخوازم زوی بمرم

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ئزرائیل هاتو.

[٢] ل جهەکێ دیتر: پەریشانی بەس ل من گەریا.

[٣] من د.

# چیاییێن مه

چیاییێن مە مە دۆل و گەلییێن وان کویرن
زۆزانن بەزێن کویڤی لێت[1] چەرن
شڤانا بەز لێ دانە مەخەلێ
بێژیا خەملا وان سۆر و زەرن

چیاییێن مە تێر کاش و گەڤر و بەرن
کەو ڕەڤن ل سەرێ کێریا وێت[2] خورن
کویستانن مێرگین خۆش دلڤەکەرن
ل چیمەنا سەیرانگەهێن مە ل سەرن

چیاییێن مە بێخیر و خان تویر و گارە
خەملینن ستێ و نزالێ بەهارە
جویرانێن چیاکێ جویدێ مرادا
بەفرینن نحامتن چەقین دارا

چیاییێن مە ب ڕوی و سویلاڤ هەژینە
خابیر و هیزل لێ جۆت کەزینە
تێر گوندن د[3] باب و کال دەلێت ژینە
بەهشتن مە ژیار لێ خۆزینە

---

[1] لێ د.

[2] بێت.

[3] ل جهەکێ دیتر: وارێن مە ل.

## کەسەرا دلێ کۆڤانی

کەسەرا دلێ کۆڤانی
وەرە مالا مە ب مێڤانی
من بخوازە ژ دەیك و بابا
تو کلێ ل سەر ڤان چاڤانی

ڤەبرە نەختێ من کەچکوکێ
یا بیم ماسی و کەتیم شوکێ
سیامەندێ ل من خەجوکێ
مەجربم بدینێ لەیلوکێ

مەمێ ئالا زین هەڤالم
فەرهاد شرینم تفالم
ئەگەر نەبێ ئەز شوی ناکم
ئەڤینیێ ل گەل کەس دی ناکم

وەرە لاوك ئەز حەیرانۆ
ل سینگ و بەرا بە مێڤانۆ
ل تە ب دل کولم ئێش و ژانۆ
لوقمانی لێ بکە دەرمانۆ

# دلێ هەژار

گەریام چار قورنەتێن دنێ
کەس نەبی ڤی دلی بدمێ
تو خەون بی د هزرا من دە
چەند سال بین دا بگەهمێ

دیتنا چاڤا فەیدە ناکت
برینێت دلی ساخ ناکت
ب گۆتنێت شرین نێ ئاشت ناکت
دلێ ب ئەڤین تەنا ناکت

چبکم مراد حاسل نەبی
ب ساخی ژینا من ژبەر تەبی
تو نەبێ بۆچیە ژیان
نێ مرنە کو ژ من ڤەبی

دکم شیرەتێ ل ئەڤیندارا
کەس ڤینێ نەکن دوو جارا
دلی نەسۆژن هەژارە
کچا بێ سۆز نە جویارە

# دل كولم

ئەز قوربانی تەبم خودا
تە بەرێ من ژ خۆشیا ڤەدا
كرم كۆڤاندارێ خەما
ژ ئەڤیندارا هێلام جودا

خودا دێ تو ڕەحمێ من ببە
دل كولم من ڤین سەبەبە
بلا من ژك مراد هەبە
فەلەكا من ب غەزەبە

من ل ڤێ ژینێ خۆشی نەمان
یەزدان ل دەردێ من بكە دەرمان
یا مت[١] ڤێت تو بگەهینە من
ڕوح ل سەر خودا ئەمان

زڤڕی ل من چەرخا دنێ
مەندهۆش ببم مامو ب تنێ
ئەگەر نەگەهم سوسنێ
سەد ئاخ داخ بۆ مرنێ

---

(١) من د.

# ئەم دل كولین

تەز[1] حەلاندم كچا مەردا
ئەڤینا تە ل دلی دەردە
ژینا من یات[2] وان چاڤا دە
دلێ من خۆ ژ سینگی بەردا

كوڕۆ لاو نەلۆرینە
دلی من ژك ل تە ب ئەڤینە
پڕ كول و تژی خۆزینە
گەر تو نەبێ من ژین نینە

بەژنا زراڤ دێم سۆرگولی
نوژدارا ڤی دلێ كولی
تە دیتن ل من نوژە و دەرمان
حاسلكە مرادا دلی

لاو بەژنا تە ڕیحانە
من سینگ باغچە ل تە زۆزانە
ل من كەجكوكێ ڕوح و جانە
لاۆ ل دلێ بە مێڤانە

---

(1) تە ئەز.

(2) یا د.

## غاینێ[1]

ئەگەر تە ئەز ڤیا بام
ب شرینی دلی دە بام
نە دهێلام بێ ڤین و ژین
خوەزیا ب مرنێ و هۆ نەبام

نیاسن بین گەلەك سەهلە
بەسن ژێکڤە بین یا تەحلە
غیانەتی بێ موهلە
بێ سۆزی نەچوو قەولە

کێ گۆت توڤێ ل من بکێ
ب سەر هشکی کەتێ ڕکێ
کا ئەداکرنا سۆزێ
هنداکرم ب جارەکێ

کا دلێ بێب کم ئەڤین
هوسا نەشیم بکم ژین
ل من چوون خۆشی و گڕنژین
کێمن دلدارێن هەژین

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٤/٧)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# جانێ

جانـــا ســـپەهـــی هـــاتۆ ژ وێـــدە
نێچیرڤـــانی مـــن ل پـــەی وێـــدە
جـــانێ هـــەکـــەر دل ڤـــالا بـــێ
دل وێ ل بـــەنـــدێ تـــو ب خـــەتێـــدە

بـــەرســـڤا پســـیارا مـــب[1] دە
تـــەز[2] حـــەلانـــدم کـــەچـــا مـــەردە
بـــێ فـــەهێـــد بـــت کوشـــتم دەردە
دلـــێ مـــن خـــۆ ژ ســـینکی بـــەردە

بـــێ دەنگـــی د خـــوەیـــت ڕازی بـــین
ب ڤـــی ڕەنگـــی مـــراد حاســـل بـــین
تـــو ژینـــێ و ڤـــین جانـــا شـــرین
دل بخـــوەیڤـــە ل بـــەر تـــەبـــین

ژ مێـــژدە مـــن دل ل ســـەر تـــە هـــەیـــە
ل ئـــەڤینـــێ دەردە بـــێ لۆمـــەیـــە
کچـــێ و کـــوڕم بـــەنگـــا مـــەیـــە
بگـــەهـــین هـــەڤ دوو ب دەســـتێ تـــەیـــە

---

[1] من ب.

[2] تە ئەز.

## مازی چنم

مازی چنم دەلالۆ
دۆستا تەمە هەڤالۆ
هاتی هێلا مازیە
تو من نەهێلە ل مالۆ

سەرکێشێ مازی چنە
ئەڤرازیا هلچنە
وەستانا تە ژبەر منە
دلێن بێ ڤین بۆ چنە

بی بێن ڤەدانا یارا
لبن سها ئەڤان دارا
پاڕزینگێ خوە من هلگرت
د گەلێ دە چوونە خوارە

بنێ گەلی وا بمێرگە
ب چیمەنە و کانی ژێرکە
ل هەڤ ڕوینشتین ل وان مێرگە
لاو من ژ دیتنێ تێرکە

## خۆزی و ئۆمێد

خۆزیـــا ئـــەز تـــەیـــرەك بامـــە
ل هنـــداڤ حـــەوشـــا تـــو تێـــدە
ل بـــەرهـــەم بـــەری تـــە بامـــە
دیتنـــا تـــە ل مـــن ئۆمێـــدە

ئـــاورین چاڤـــا تـــێن تیـــر
ل دلـــێ مـــن کـــەڤـــن ژ دویـــر
خۆشـــیێن بـــەرێ مـــن تـــێن بیـــر
نـــە ل گـــەل مـــن بـــێ بـــیم ئێخســـیر

ب شـــەڤـــێ هـــەمـــێ دەلالـــێ
مـــن خـــەو نینـــە تـــو ل بـــالێ
ل هـــزر و تـــەخمینـــێن تـــە دە
دێ مـــن دینکـــێ هـــەڤـــالێ

پـــەیـــام بـــاران و خۆنـــاڤ
ل ســـەر رویـــێ تـــەبـــام بـــەلاڤ
ژ دیتنـــێ تێـــر بـــام هـــەرگـــاڤ
ژ وێ بـــەژنـــا شـــێرین زراڤ

دەســـتمال بـــام ل نـــاڤ دەســـتادە
ل نێزیـــك بینـــێ دلشـــادە
ل مـــن حاســـلکە مـــرادێ
گـــولا ژ دلـــێ مـــن ڕادە

ڕهەك ژ دلێ تەبام

هەردەم دا بیرا تەبام

دەرگەهڤانێ دلێ تە بام

دا ئەز ب دلێ خۆ بام

## خائین فەلەك

سەد ئاخ و داخ هەی فەلەکێ
بۆ مت[1] ب تنێ تو جەلەنگێ
ئۆمێد هەمی ل دلی دەمان
بهێلە خوە بینم جارەکێ

فەلەك بۆچی خائن فەلەك
تە شمن[2] ڤەکر چاڤێن بەلەك

هەتا کەنگی هۆ نە یاربی
ب چی ڕەنگی تو دێ شمن[3] ڤەبی
بهێلە بگەهین مرادا خۆ
دوژمنا دوو دلا تو بی

فەلەك بۆچی خائن فەلەك
تە شمن[4] ڤەکر چاڤێن بەلەك

مراد نەبی زاڵم فەلەك
تو سەبەبی نەبی دلەك
دل بێ هیزکر ل سەرما گولەك
ژبی ل من بووراند نەما گەلەك

---

(١) من د.

(٢) ژ من.

(٣) ژ من.

(٤) ژ من.

فــــەلــــەك بـــۆچى خـــائن فـــەلـــەك
تـــە شـــمن[1] ڤــەكـــر چـــاڤێن بـــەلـــەك

دەريــــا ئـــــەڤينــــێ مــــابێ ئـــــاڤ
كـــــرم ماســــى تـــەز[2] خســــتم نـــاڤ
فـــەلـــەك هـــز ل مـــن بـــين بـــەلاڤ
ل مـن چـەنـگ شـكەسـتن نـەما بـزاڤ

فــــەلــــەك بـــۆچى خـــائن فـــەلـــەك
تـــە شـــمن[3] ڤــەكـــر چـــاڤێن بـــەلـــەك

---

(1) ژ من.

(2) تە ئەز.

(3) ژ من.

# بێریا ئەڤیندار

بێریمە کەچا گوندا
من مەنجەلوکا ل دەستدا[١]
ل شڤانی ئەڤیندارم[٢]
سەرێ من پێ بلندا

ئەز هێلام بێریڤانە
ئەز مام من دل کۆڤانە[٣]
مرادا من شڤانە
ل من کەچکوکێ[٤] مێڤانە

شڤان خەریبا تەمە
ساخبم نەمرم بۆ تەمە
پەزی بینە دەلالۆ
تو ل مب[٥] بڕەڤینە خەما

شڤانۆ تە پەز بۆشە
بدە هەڤشی ل دویڤ هۆشە[٦]
بێرێ یا بتە دل خۆشە[٧]
هاری من پەزی بدۆشە[١]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ل زەندا.

[٢] ل جهەکێ دیتر: من ل گەل شڤانی دلدا.

[٣] ل جهەکێ دیتر: مە سۆز پێکڤە ژڤانە.

[٤] ل جهەکێ دیتر: دا ئەز لێ بم.

[٥] من ب.

[٦] ل جهەکێ دیتر: بدە هەڤشی ل ناڤ قامووشە.

[٧] ل جهەکێ دیتر: بێرێ من دل خۆشە.

# دلێ تە کەلها ئەڤینێ

چاڤێن تە ئارمانجا من بی
مپ[٢] وانا دونیا دیتن بی
ئۆمێدا ل من نەهەرێڤە
من نەکە مەجریمێ دبن بی

دلێ تە گەلها ئەڤینێ
ئێک دەرگەهە بۆ ڤەبینێ
ب دەستێ تە کلیلا ژینێ
ژ خودێ بترسە مپ[٣] گەهینێ

سینگ و بەر زۆزانێت ژووری
گەردەن ب مەرجان و مووری
ژ هەر دوو ڕویا شەرمە
سەد مخابن بهار بووری

بەژنا تە ژ دارا بەناڤێ
سەر بەلگا گرتن خۆناڤێ
دلی بۆ کم کانیا ئاڤێ
محەیف بێژێ من تو ناڤێ

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ئەز دێ گرم تو بدۆشە.

(٢) من ب..

(٣) من ب..

## دلێ ژار

دلێ ژار خەما لێدچینی
گولیزار دێ من مرینی
کەسەر و کۆڤانا کوژتم[1]
نێ نە هوسانە ئەڤینی

دل ئاسنێ کانێ ئەو سۆز
بێ باوەرێ کەوا داڤ دۆز
تە ل من چەراند پاوان و کۆز
تە ئەڤ دلە هێلا ئالۆز

من خۆزی چاند هویڤی دوری
قەد ساخ نابن دلێ مری
بەهار د ل من کر زڤستان
ئاگرێ عەشڤا تە من ڤەمری

ئەڤیندارە بێ فەلەکم
سۆز بت ڤینێ ئێدی نەکم
مریێ وان چاڤێن بەلەکم
دێ ڤی دلی گۆری تە کم

---

(١) کۆشتم.

# دلێ ژار[١]

من دلێ خوە ڤەکری
جهێ تە تێدەکری
تە [٢]هێلام ل سەر ڤان گولا
بۆچی تە دل[٣] ژار کری

فەرمان ل من فەرمان
ستێرا من ڕژیا ل عەزمان
کا بەختێ تە کا ئیمان
کا ئەو سۆز و کا پەیمان

هەمی ڕێ ل من بین ستری
چاڤ نەمان پێبکم گری
پشتی تو ل من غائین بی[٤]
ل کەس دی ناکم باوەری[٥]

دلی دخەو تە هشیارکر
بر بازاری بەهاکر
شخەم[٦] و کۆڤانا بارکر
ل ژینێ ڕێ لێ هنداکر

---

[١] ل جهەکێ دیتر: من دلێ خوە ڤەکر.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئەز.

[٣] ل جهەکێ دیتر: بۆچی تە هۆ.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ب دڕەوا دل ئاشتکری.

[٥] ل جهەکێ دیتر: نە لەیزە ب ئاگری.

[٦] ژ خەم.

ئەڤینا شیر و شەکر
مخابن تە بەرزەکر
تە دل ئێشاند ژ دەردا
برینەک کویر لێ ڤەکر

بێ دلێ کا ڕۆژێن خۆش
ل چو دل دی تو نا بێ نۆژ
نێزیکە دێ ل تە ئێت ڕۆژ
پوشمان بی هەی دل فرۆش

## دلێ كول

تــه ڕوحــا ل مــن كــرى بــه‌لا
نــه‌كــه دلــێ مــن ڤــان گــولا
مــن نــه‌فرۆشــه ب ڤــى ڕه‌نگــى
مــه‌زن بێــژن بــازار گــولا

پوشــه‌مــانى دێ ل تــه بــن خــۆزى
ل تــه‌بــى ده‌ره‌نــگ زويكــا چــوو ژى
شــمن[1] چێتــر بــت ل تــه پيــرۆزى
ب ســه‌رڤــه نــه‌بــى دلێــت ســۆژى

ئــه‌ڤــين ل ژينــێ هــه‌ڤالــه
ل تــاريێ ڕۆنــاهى و شــه‌مالــه
بــۆچى ل ڤينــا خــو بــێ ســه‌نگــى
ديــاره دل بــێ ئيغبالــه

ل كــێ بكــم گلــى و ڤــان گازنــدا
دل ب ده‌رده ڕێ مــا هنــدا
تــه ژ هێلينــا دلــى فــڕدا
ژبــه‌ر جــى هنــده دل دۆرنــدا

---

(1) ژ من.

## دلێ كول[1]

ئەز بیم شاهێ ئەڤیندارا
من دل كول ما و بریندارە
هویڤیا تەمام گەلەك یارێ
ب خەم و كۆڤانا دل بەژدارە

من ژینا خۆ ب تە ئاڤاكر
سۆزداری تە ل من هنداكر
ڤینا من تە بێ بەهاكر
دەردێ مرنێ ل من بەهیداكر

هندی بگریم بێ ئێغبالم
ژ هەر دوو چاڤا ڕۆهندكا دمالم
تە ئەز كرم پالێ پۆیشی
بۆ بویرهاتنا وێ دنالم

تە ئەڤ ڤینە دخەما ڤەدە
كا ئەو ڕەحما دلێ تەدە
ئەو كیە دناڤبەینا مەدە
دڤێت مە بكوژن تو گوهنەدە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢/٤/٢٠٠٤)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# دل ماپ[١] برين

نــــه ئێشـــينه ئـــهڤـــى دلـــێ برينــــدار
ب تـــازى و شـــينه فــهلــهك وا ل مـــن بـــى نــهيــار
بـــۆ مـــن بێـــژه كـــا گونـــهها مـــن چيـــه
ل ڤــێ هێلانـــێ تـــه ئـــهز كوشـــتم هـــزار جـــار

شـــمهمـــێ[٢] زيـــن مـــا ئـــهز وهك وى مـــام بـــێ وار
مـــا مـــهجـــريمم تـــو لـــهيـــلا بـــێ مـــب[٣] كـــێ ژار
كـــرم فـــــهرهــــاد ل شــــرينێ بكــــم پســــيار
نـــه ســـيامهنـــدم خـــۆ دكـــێ خـــهجـــا ئـــهڤينـــدار

مـــن نـــهكـــهنـــه ژينـــێ ل مـــن نـــهكـــه زيمـــار
دل شيشـــهيـــه ئـــهكـــهر شـــكهســـت دا بـــت جـــهبـــار
هـــهمـــى هـــويڤى و خـــوهزى تـــه ل مـــن مرانـــدن
ژ خـــودێ بترســـه تـــه زويكـــا ل مـــن كـــر ئێڤـــار

كـــا جزيـــرى و فـــهقيـــێ تـــهيـــرا و جـــهگـــهرخـــوين
هۆزانڤـــان بـــين مـــان بـــێ مـــراد نـــێ چـــوون ژيـــن
دكـــهڤـــم حـــهيفـــا ئـــهڤينـــدارى دل خـــهمگـــين
بـــژارى و ژويـــرى كۆڤـــهنـــدارين خـــۆ ب خـــوين

---

(١) ما ب.

(٢) ژ مه.مێ.

(٣) من ب.

## دل ماپ برین

دل مـا برینـدار نـێ ل هویڤیـا تـەبـی
بـۆچی کـرم ژاری دێ ل مـن بـەرزرەبـی
ئـەز هـێلام بـێ وار دبێـژم خۆزیـا پـار
ژینـا بـێ دیلـدار خـۆش بـۆ نـەبـی

هـۆ زوی ژبیرکـرم هـەی دلا لاوازێ
ل وارێ دزڤـرم جهـێ لێـت[1] زازێ
ژ کـولا دەفـرم دل مرنـێ دخـوازێ
ل بیرهاتنـا دکـریم کـا چاڤێـت نـازێ

ل واری نـەدیـارێ چـاڤ هـێلان بگـری
کـانێ دیلـداری دێ ل کویڤـە کـری
چەند دویر بکەڤێ ژ من دێ زڤرێ ل من
ئـەزم ئـەڤینـداری تـو دێ ل مـن گـەری

ژ وەرزا بـەهـار بـێ ئـەز لـێ سـەیـرانم
ژ مـەهـا نیسـان بـێ کـول ل سـەرخۆنـاڤم
مێـرگ و چیمـەن بێ هـەر وەختـێ ل نـاڤم
دەشـت و زۆران بـێ بـاران لێـت[2] بـارم

---

(١) لێ د.

(٢) لێ د.

# هێلام بێ ژین

تە ل من ڕەشکر ڤینا شرین
دلێ ڕەبن هێلا برین
ئەڤینداریێ تە بیم یاریێ
ب تنێ ل دنێ هێلام بێ ژین

حەژێکرن تە هێلا ژار
بیم ڕێڤنگ ل من هندا بی وار
من تەڤ ژین بووراند ب زیمار
کاسا ژەهرێ ب من دا ڤەخوار

تە دل ب ئاگری سۆتی
ل بازارێن تاری فرۆتی
من خۆش چاند خەم من دورین
کا سۆزا تە ل گەل من گۆتی

ئەڤینداری نەبا ڕینە
کەس دی وەك من نەخاپینە
بەس وەلاتۆ ب کۆزرینە
یارا دوو دل چو دین نینە

# نەشێم بژیم[1]

نەشێم بژیم نە ل گەل من بیٚ[2] ڤین ئاگریٚ
دکم و ناکم تو ژ ڤی دلی نائیٚ دەریٚ
ل من بی مرادی بیرهاتن تێن پێش چاڤا[3]
هندی ساخم دل ب داخم ل سەر کەسەریٚ

سیامەندی خەج نەهێلا جان[4] ژ دەستدا
ل مەمیٚ ئالا زیندان خۆشبی و زین نەبەردا
ل فەرهادی شرین مراد بی و کەتبی دەردا
مەجرویم دین بی بۆ لەیلای ڤین ما دلدا

عاشقیٚ گولیٚ بلبلا هەڕ لیٚ ب حەزە
دل بەهارا ئەولیٚ وارە دەم ب ئاوازە
ل دوو ئەڤیندارا گەهشتن دەم داخازە
ل من بزڤرە بەریٚ من نەدە ئەڤرازا

چاڤ ل ڕێکا تە قەڕمین دل ما ب برین
محەیفا ویٚ ڤینا شرین نیٚ ئەو بی ژین
دیٚ ب چی دەرمان کم ڤان کولا بیٚ زڤڕین
کەس ل گەل بیٚ سۆزا بلا نەکت ئەڤین

---

[1] ل جهەکیٚ دیتر: ڤین ئاگریٚ.

[2] ل جهەکیٚ دیتر: ژ تە غەریبم تو ژ من دویریٚ.

[3] ل جهەکیٚ دیتر: تە ڕۆژێن خۆش هەمی ل من کرنە بیرهاتن.

[4] ل جهەکیٚ دیتر: گیان.

خــەم و كۆڤــان ل منــدان كــرن دل بــاركرى
دارا خــوزيــا ل منــدا ب چانــدى تــە ل مــن بــرى
هــويڤى و ئۆميّــد تــە مرانــدن بــن ئــاخ كــرى
برينێــت كــول ل مــن ئارانــدن كــار بــى گــرى

## ڤین گرانێ

چ هێجەتن ل مت[1] هلێخێ ڤین گرانێ
کولا ل دلێ مت[2] مەزێخێ بێ ئیمانێ
نازیا ل من نەکە ب جانیا خۆ کچا دەلال
ژ تە شێرینترین کچ هەنە ل کوردستان

بلا سەرێ ڕۆژێ با یار هۆ نەبام ژار
نێ تە دل هێلا بریندار مابێ نوژدار
خەم و کۆڤان ب سەدان هزار نائێن هژمار
ڕۆهنکێن چاڤا ڕێز ڕێز تێن خوار ژین ماپ[3] زیمار

خۆزیا من تو ناس نەکریا هەی بێ سۆزێ
گونەهبارێ ب ئاگرێ ڤینا خۆ مت[4] سۆژێ
تە ئەڤ دلە تژی کول کر و ژ خودێ بترسە
برین ئارهان دەرمان نەبین تولێ نوژێ

کرم ئێخسیر وەك عەڤدالی ڤین ما شکێرە[5]
چ دلە ل تە ژ ڕەحمێ ڤالا ل من بنێرە
ژینا بێ ڤین نەچوو حالا خوەی هێرە
هنداکر ڤینا چەند سالا مرن زێرە

---

(1) من د.

(2) من د.

(3) ما ب.

(4) من د.

(5) شکێر، ئەو جهێ بەران لێ کۆمدکەن دبێژنێ شێکرا بەران.

# پێشارێن پێ بەژدار[1]

ڤینا دلا ژ چاڤا دیارن
ڤینا شرین ل خۆشیا ب نازدارن
ژینا بێ ڤین خودان لێ ژارن
ژینا ب ئالۆز ل مرنێ ب ئێڤارن
دلێن تێر کول ئەو بێ نوژدارن
دلێن شکەستی هەر بریندارن
گولێن بێ بێن ستریا نەچارن
گولێن ڕەنگین بەهار لێ وارن
کچێن بێ سۆز ئەو نەچو یارن
کچێن خاین بەردێ لێ بارن
دۆستێن پاری نەهاریکارن
دۆستێن مەتح و دوپیشك و مارن
دۆستێن[2] سۆزدار ل ژینێ بژارن
کەسێن حەسوید ل چاڤا بزمارن
کەسێن شەریف ب غیرەت و ب عارن
کێم نامویسا ئێك ل دەڤ وان چارن
کەسێن دەیندار هەر گران بارن
کەسێن تەماع ئەو گورکێن هارن
زەنگینێن ب دل کێمن نەدیارن

---

[1] ل جهەکی دیتر: ساخلەت، ساخلەتێن بەژدار ل ژینێ.

[2] ل جهەکی دیتر: کچێن.

مالا ب تفاق وان دونیا خوارن

مالا ب قەرقەش ل دەردا هەژارن

جەگەر سۆتیا دلا ل وان د ئارن

جویرانێن باش ل گازیا هەوارن

برایێن باش ل برا هشیارن

دەیکێن دلسۆژ نێ جەگەر هارن

وەلاتێن خۆش لێ ب خەمل شارن

چیایێن بێدار ڕەوش لێ ڤەشارن

مێرگێن بێ ئاڤ نە سەبردارن

ل حیلەبازا[1] هێجەت هەزارن

نێ دەرەوین هەر شەرمەزارن

مللەتێ بێ سەر تێر دوژمنکارن

سەرکردێن چاک دل ب ئازارن

---

(1) ل جهەکی دیتر: ل فێلەبازا.

# سەرخاترا تە

نەکەنە ژبەر خاترا تەبا[١]
ئەڤینێ من[٢] ل دلی نەبا
سال ب سال من تو نەدیتنێ[٣]
دیتنا تە شەکر پێڤەبا[٤]

دل سۆت بۆ وان چاڤێن بەلەك[٥]
نێ ئەز ژێ خەریبم گەلەك[٦]
چبکم ل من خاینە فەلەك
بهێلە بگەهین ببین دلەك[٧]

ناما تە بۆ من ب رێ کری
ب دلێ کۆڤان من ڤەکری
ل وان پەیڤێت نازك شرین
دل هەرشاند بێ هێزکری[٨]

---

[١] ل جهەکی دیتر: ئەگەر نە سەر خاترا تەبا.

[٢] ل جهەکی دیتر: ئەڤینا تە ل دلی.

[٣] ل جهەکی دیتر: سال ب سال تە ئەز نەدیتم.

[٤] ل جهەکی دیتر: دەرگەهیە ل مرادی ڤەبا.

[٥] ل جهەکی دیتر: هاتنا من ژبەر چاڤێن بەلەك، ئەز بیم مێڤان ل چاڤێت بەلەك.

[٦] ل جهەکی دیتر: منژی بووری نەما گەلەك، ژ دیتنێ دل لەرزی گەلەك.

[٧] ل جهەکی دیتر: ناهێلت ئەم بین دلەك.

[٨] ل جهەکی دیتر: دل هەرشاند چاڤ مان بگری، ل من بین کەسەر چاڤ مان ب گری.

هندى من ژى هەبت هەبم
ببم مەجرويم و دينێ تەبم
ئەڤينداريێ جانا خۆ بم
ل مرنێ ب تنێ كو ژ تە ڤەبم[1]

---

[1] ل جهەكى ديتر: مرنە ب تنێ كوژتە ڤەبم.

## خاتر ژ من خوەستی

چـاڤ مــام ب گــری خــاتر خــوەســتی
تــه ئــەڤ دلــه هــێلا شــکەســتی
بــەختــێ تــه مــن خــەریــب نــەکــه
ڤــین و ژینــێ ل دلــی مــەســتی

مـــن نـــەهێلـــه دل برینـــدار
مـــن کـــول و دەرد مـــان بـــێ نـــوژدار
دەرمـــان بکـــه ڤـــی دلـــێ نـــازدار
دلـــێ خـــەو تـــه کـــر ئـــەڤیندار

تـــه نیشـــا مـــن دا ئـــەڤینـــی
ڤینـــا خـــۆ ل دلـــێ مـــن چینـــی
بێتـــه نـــەشـــێم بکـــم ژیـــار
چـــاڤ ب ڕێمـــه و هـــێلام تینـــی

خـــەریـــبم هـــەواره خـــودا
تـــه دیـــن کـــرم مـــراد نـــەدا
ژ تـــه دویرکـــرم کوشـــتم دەردت
دێ بزڤـــڕه کچـــا مـــەردا

# شرین

محەیف نابینم شرینێ
کرم ئێخسیرێ ئەڤینێ
تە دلێ من دا بەر داخا
چ ترسە ل دلێ خۆ د چینێ

مخابن هێلام بێ دیتن
چیرۆکا مە هات گۆتن
ئەڤینی نائێت فرۆتن
شرین نێ ل مە دوو دل سۆتن

گول نسرینا باغچێ دلی
ل دلێ من کەسەر و کولی
شرین دڤێن تە ژ من دویر بێخن
تویرکێ خەما بدن ڤی ملی

دل ئەڤینم ل تە ب ئەگەرم
گەر تە نەبینم دێ مرم
شرین ژینێ من ژی ل سەرم
ژ من دویرکە ڤێ دل کەسەرم

## چاڤ گول نه سرین مام بزی

گـــول نـــەســـرینا چـــاڤ بـــەلـــەك
بـــــەژن تورینـــــە گـــــەلـــــەك
جـــــۆت كـــــەزی وەك دوو مـــــارا
ســـــەر مـــــلا دەبـــــین خـــــەلـــــەك

ســـینگ و بـــەر بـــەفـــر و كـــەڤـــی
ب ســـــێڤن هنـــــارن زەڤـــــی
لێڤـــــین شـــــرین هنگڤـــــی
چـــپ چـــپ خۆنـــاڤ ژێـــت كـــەڤـــی

نێرگـــــزا چـــــاڤ مـــــام بـــــزی
ڤـــــین ل دلـــــی ئـــــالزی
مـــــا تـــــو ژ خـــــودێ ناترســـــی
ئـــــــەز كـــــــرم داڤ و دەزی

بـــــورهێن قـــــەیتـــــانی خـــــوارن
ســـــــەر وان چـــــــاڤێن دژوارن
مێـــــــرگ و چیمـــــــەن و وارن
مـــــە دوو دل ل نـــــاڤ دیلـــــدارن

# ئەڤین

ئەڤین پەیڤەك هەژیە
ب چار پیتا ئەو پێكهاتیە
ئەلیفۆ ڤائۆ یائۆ نوینە
ب زێر و زیڤی خەملاندینە

ئەڤین فەنەرا دیلدارە
ڕۆناهیا دلێن ژارە
ل وەرزێ بهارێ ئادارە
ژین پێپ[١] ڕەوشە خەملادارە

ئەڤین قوتابخانا ژینێ
یەكەمین پۆل تو لێ ڕوینێ
تەڤنەك ڕاچاندی و تێر داڤە
پاشی ڕۆژا گەش تێت بەرچاڤە

ئەڤین خۆزیا دۆست و یارە
پێستركە بۆ ژینێ ل كارە
دلێن كۆڤان لێپ[٢] قەرزارە
نوژدارا خڕ برینداره

---

(١) پێ ب.

(٢) لێ ب.

## ئەڤین

ئەڤین ل تە ئەڤیندارم
ئەز دل کۆلم[١] ل تە داخبارم
چەند[٢] خەریبێ دیتنا تەمە[٣]
نەبینم ئەز بریندارم

ڕەوشا ژینا من ئەڤینە[٤]
دێم و ڕوی بەفرا شەڤینە[٥]
خوین شرینە[٦] وەك هنگڤینە[٧]
ڕوح سڤکە و خەم ڕەڤینە[٨]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: ئەز ب دلڤە.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئەز.

[٣] ل جهەکێ دیتر: خەریبێ دیتنا چاڤامە.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ئەڤینێ.

[٥] ل جهەکێ دیتر: شەڤینێ.

[٦] ل جهەکێ دیتر: خوین شرینێ.

[٧] ل جهەکێ دیتر: هنگڤینێ.

[٨] ل جهەکێ دیتر: ڕوح سڤکێ و خەم ڕەڤینێ.

# ئەڤین

کا سۆز و ئەڤین
تە هێلام بێ ژین
ژ چوو ناتە دلبەر
ل من ئارهان برین

ئەرێ دلبەر ئەرێ دلبەر
نێ تە دلێ من کەرکەر
کول و کۆڤان تە هێلان ل سەر
گەر مرم تو دێ بێ ئەگەر

برین ما ل دلی
ئیرۆ تو سلی
دوهی دگڕنژی
گول بی ل بلبلی

ژبیر نەکە جانێ
ل دلی دەرمانێ
ئەگەر سان نەکێ
تازێ بۆ دانێ

## ئەڤین

ئـــەڤـــین ئـــەزم ل تـــە ئـــەڤینـــدارا
ل دیتنـــــێ بلـــــەزم دیاربـــــە یـــــار
ژ مـــن نـــەڤـــەشـــیره وان چاڤـــا
نـــەگـــەهـــێ مـــن دێ مـــن كـــێ ژار

ئـــــەڤـــــین تـــــو ڕەوشـــــا ژینـــــێ
بـــــەهـــــارێ ب خـــــەملینـــــێ
ســـــەر ڤـــــان لێڤـــــا گرنژینـــــێ
ڤینـــا خـــۆ ل دلـــێ مـــت[1] چینـــێ

مـــراد نـــەبـــت ســـۆز بـــت ئـــەڤـــین
ل گـــەل چـــو دلا نـــەكـــم ئـــەڤـــین
هنـــدی ســـاخم ل هویڤیـــا تـــەبـــم
بـــەس مرنـــە ل مـــە ژێـــك ڤـــەبـــین

شـــۆخ و شـــەنگـــێ چـــاڤ خۆمـــالێ
تـــــە ئـــــەز حـــــەلانـــــدم دەلالـــــێ
ژیـــن كوبـــارا مـــــەمـــێ ئـــالێ
شـــــەڤ و ڕۆژێ تـــــو خـــــەیـــــالێ

---

(١) من د.

# ئاخ ئەڤینی

قەدرا منی ئەڤینی
دلێ مندا دێ هەر مینی
هێش گینج بیم تە ئەز پیرکرم
چەند یا تەحل بی ل من شرینی

ئەڤینی ب کول و کەسەرە
وەغەرەکا بێ ڤەگەرە
نەکەڤتن ل دار و بەرا
د حەلینت دل و جەگەرا

نەشێم بژیم بێ عەشق و ئەڤین
دلیدا شەکرە و هنگڤین
دەردێ ئەڤینێ دین کرم
ئەز ئەڤیندارم دلبرین

ئەڤینی رێکەك پیرۆزە
دلداری پەیمان و سۆزە
خیانەتێ لێ ئالۆزە
بۆ ئەڤینێ ئاستەنك دۆزە

# ئاخ ئەڤینێ

ئاخ ژ دەردێ تە ئەڤینێ
دل ئاسن بت توت[١] حەلینێ
چو دل نینن تو نە تێدە
كول و دەردا[٢] لێت[٣] ئالینێ
ئەڤین تویێ خۆشیا ژینێ
دلا ب ئێك دوو توت[٤] حەسینێ

هەی ئۆمێدا[٥] ئەڤیندارا
ڕەوش[٦] بهارێ ل هەمی وارا
ئاگرێ تە چەند دژوارە
ئێ تو بسۆژی ل ژینێ ژارە
ئەڤین تویێ خۆشیا ژینێ
دلا ب ئێك دوو توت[٧] حەسینێ

ئەڤین توا ل من بی بەلا
تەز[١] مراندم من دل حەلا

---

(١) تو د.

(٢) ل جهەكێ دیتر: دەرد و كۆلا.

(٣) لێ د.

(٤) تو د.

(٥) ل جهەكێ دیتر: هەی نەیارا.

(٦) ل جهەكێ دیتر: تو.

(٧) تو د.

نــەشــێم بــژیم نــە ل گــەل مــن بــی[٢]
بالیۆزخـــــانێ ڤینـــــێ دلـــــــە
ئـــەڤـــین تـــوێ خۆشـــیا ژینـــێ
دلا ب ئێــــك دوو تـــوت[٣] حـــەســـینێ

نـــوژدار و حـــەکـــیم[٤] لوقمانـــــە
ل دەردا ئـــــەڤــــین[٥] دەرمانـــــــە
بــــەژداری کـــــول و خــــەمانــــــە
دادگــــەهــــا ســـۆز و پـــەیمانـــە
ئـــەڤـــین تـــوێ خۆشـــیا ژینـــێ
دلا ب ئێــــك دوو تـــوت[٦] حـــەســـینێ

---

(١) تە ئەز.

(٢) ل جهەکێ دیتر: ژین ل گەل ئەڤینێ سلە.

(٣) تو د.

(٤) ل جهەکێ دیتر: دل حەکیمە و ئەو.

(٥) ل جهەکێ دیتر: دەردێ ڤینێ دکت.

(٦) تو د.

# گولا ڤەبی

هەڕۆ ل ڕیا تەدە د ڕوینم
من هزرەتاچاڤا بینم
تە دل وەستاند خەریب کر
نێ توت[١] زانێ ل تە ب ئەڤینم

تە دل سۆت ئاگرێ تێڤە
خودانا ڕوینێ وەك سێڤە
شەکر دباری ژ هەر دوو لێڤە
کا ڕۆژا لێ بکم خێڤە

ئیرۆ چەندە ل بەندا تەما
ئێدی دلی تاقەت نەما
ل هزر و بیرا سەودا سەر بیم
تو ل من زێدە نەکە خەما

باغچێ ئەڤینا من تو بی
تو گول بێ تێدە وا ڤەبی
پاوانێ ڤی دلێ ب کول بی
بیهن نەکم تە مرنا من بی

---

(١) تو د.

# گرنژینا وانا لێڤا

گرنژینـــــــــا وان لێڤـــــــــا
مـــن کـــەس نـــەڤیـــا ژ تـــە پێڤـــا
کـــــەتـــــم داڤـــــا ئـــــەڤینـــــێ
نـــەگـــــەهمـــــێ شـــــمرنێ[1] وێڤـــا

چاڤـــــا ل مــــــن نـــــە نــــــەقینـــــە
دیتنـــــا تـــــە ل مـــــن مزگینـــــە
شـــــەرم نـــــەکـــــە وەرە ڕینـــــە
مــــە پێکڤـــــە مــــراد ژینـــــە

چاڤـــــا تـــــو ل مـــــن نـــــەبـــــادە
دیتنـــــا تـــــە ل مـــــن مـــــرادە
تشـــــتێ تـــــەمـــــە شـــــمیژا[2]
دلـــــێ ڕەبـــــەن ب تـــــە شـــــادە

کاڤـــــا ل دەڤ مـــــن ڕوینشـــــتێ
دلـــــێ کۆڤـــــان کـــــەهشـــــتێ
بـــین و هلـــم ل مـــن خـــوەشـــتێ
ژێ تێـــــت بێنـــــا بـــــەهـــــەشـــــتێ

---

[1] ژ مرنێ.

[2] ژ مێژا.

# دیتنا تە ل من خۆزیە

دیتنا تە ل من خۆزیە
کوشتم خودانا کەزیە
غائن نە بەهیشتا زویە
هێلام و چووی غەریبیە

دەرمانکە هێش برین نویە
نەهێلە بکم ڤان هویڤیە
ڤێ دلمانێ چارە چیە
تەرکێ ناکم چەند من شیە

ئەڤ گۆتە من، من تۆفیە
ئەڤینداری نەیاریە
دویر نەکەڤە دل سۆتیە
پڕ ئۆمێدە ل هویڤیا تەیە

دەستێ مە ژ هەڤدوهو ڤەبیە
نە هاوار و نە گازیە
ڕێ دویر ل من ئەڤڕازیە
دیتنا تە ل من خوەزیە

# دیتنا ته خۆزیه

دیتنـــــا تـــــه بـــــۆ مـــــن خۆزیـــــه
کـــــورتم خـــــودان کـــــەزیـــــه
چـــاڤ بـــەلـــەکـــه دێـــم ســـۆرگولێ
دلـــێ مـــن ل ســـەر تـــه ســـۆتیه

بـــەژنـــا تـــه چـــەنـــد زراڤـــه
هـــەی گـــول شـــەنگـــا ل بـــەر ڤـــان ئاڤـــا
دژوارن ئـــــــاورێن چاڤـــــــا
تـــه دلـــێ مـــن ئێخســـت داڤـــا

گـــول سوســـنا ل بـــەر ڕوبیـــاری
ژ دەڤ و لێڤـــا شـــەکـــر دبـــاری
شـــرینه گـــەردەنـــا زەلال
خۆشـــیا دلـــی ب ئـــەڤینـــداری

ئـــەرێ دلـــدارێ تـــەمـــه دلبـــەر
سینك زۆزانـــێ مـــن لێـــت[1] کـــر چـــەر
کـــولا ژ دلـــی بینـــه دەر
تـــه ئـــەڤ دلـــێ هـــه کـــر کـــەر کـــەر

---

[1] لێ د.

# میڤانێ مرنێ

دەست تەنگی و هەژاری
فەقیری و دەینداری
دونیا گەش بی تاری
ل قەدەرێ بەژداری
ئاخ دایێ ئەز گۆری هۆی هۆی
هێژاۆ ژی بۆری هۆی هۆی

نەیارا دەرب دەینان
برین مان بێ دەرمان
تەرم هێلان بێ خودان
ل مرنێ بی میڤان
ئاخ دایێ ئەز گۆری هۆی هۆی
هێژاۆ ژی بۆری هۆی هۆی

زیمار و خەم داری
نەئێخست ڤی واری
چاڤ ل من مان تاری
محەیف تو نە دیاری
ئاخ دایێ ئەز گۆری هۆی هۆی
هێژاۆ ژی بۆری هۆی هۆی

کـــولا شـــخۆ[1] ڤـــەنـــاکم
چ جـــار تـــە ژێیـــر نـــاکم
دگـــۆت دایـــێ وە نـــاکم
براکـــــــوژی نـــــاکم
ئـــاخ دایـــێ ئـــەز گـــۆری  هـــــــۆی هـــــــۆی
هێـــــژاۆ ژی بــــۆری  هـــــــۆی هـــــــۆی

---

[1] ژ خۆ.

## حەیرانۆك

رێکا گەلی وا ب سوسنە
هاتن و چوونا لاوێ منە
ئەز بیم زێرەڤان د رێدە
دیتنا چاڤا دل سۆتنە

بەهار بووری ئاخ لێڤەیە
تریێ لێڤێ بالەتەیە
تو گوهـ نەدە گۆتنێت خەلکێ
شەرتی دلی من و تەیە

کورۆ دینۆ چوومە گەلی کویرە
قەولێ من و تەیی لاو ل ناڤ هەژیرە
ل سەر رۆیباری ئەز ڕوونشتم من دل زویرە
نێ ڕۆم نائێن ڤەشارتنێ د بنێ تویرە

نێ بابێ من ڕەزکەك هەبی ل پالا گری
تو ڕەزڤانبی سەرخاترا من خزمەتکری
ل تە بین مێڤان تەحرا نویر و ل بنێ خولپا
من بۆ تە سینگێ خۆ ڤەکر تە دام گری

# حەیرانۆك

لاو ڕەش و نان بخویبە
دیوانێت میر و حاکما دەم تو لێبە
ڕەشاتیا مێرانە چو عێبە

ڕەش و ڕەش و ڕەش تەحلۆ
خەما نەکە دلێ خۆ
ئەگەر ساخ بم و ئەز نەمرم
دەیکا تە دکم خەسیا خۆ

سێڤەك سۆرم ئامێدیمە
سەرێ ڕێکا ڕوینشتیمە
ل هویڤیا لاوکێ بەناڤیمە

ناڤێ لاوکێ من ئەحمەدە
نەخت گران بم تو گوهـ نەدە
یا من کولە و یا تە دەردە

کانیا گوندی ب خر و بەرە
خوە پێخواسکە ب گورێ وەرە
گەر دڕها دێ بۆ تە چێکم
ب ئاڤرمیشێ سۆر و زەرە

ناڤێ گوندێ مە سنجەقە
لاو دیتنا تە مەرەقە

دل سۆتیا لاوی خەمە
من ب ڕەڤینە مرن حەقە

یارێ تە کرم بەگزادا
وار نەما من سەرا نەدا
شەڤ و ڕۆژێ مام د هزرادا
نەگەهشتم چو مرادا

بەژنا بلند ژ دارێ بە ناڤێ
تو نە ستویرێ و نە زراڤێ
نێچیرڤانم بۆ من ڕاڤێ
شەڤەکێ ل تە دکم سلاڤێ

ژ وەرزێت سالێ ئاخلێڤەیە
تریێ لێفی بالەتەیە
قەد گوهـ نەدە گۆتنێت خەلکێ
شەرتێ دلێ من و تەیە

دەرێ گەلی یا سوسنە
هاتن و چوونا لاوی منە
من ژ دویر دیت و هات و بووری
دیتنا چاڤا دل سۆتنە

# گولەك ژ باغچێ فلكوری

گولەك ژ باغچێ فلكلوری
بلا ژبیر نەكین كەلتوری
حەیرانوك و گۆتنێت مەزنا
ب سەرهاتی و چیرۆكین بوورین

ب هۆز و بەرهۆزا و مامكا
پێدە هەرە و هزرا بكە
گوهدار تو خوە ئامادەبكە
گولەكێ ژ باغچێ مە ڤەكە

ناما ب سلاڤە مە خواندن
ب پەیوەندین وە ئەم شادن
مە ڤینا وە ل دلا چاندن
بویرهاتن نائێن مراندن

# شڤان و بێری

کوڕ:

بێریێ من خۆ کر شڤان
سەر خاترا وان چاڤێت جوان
ئەو ڕۆژا ئەز تە نەبینم
دێ پەزی هێلم بێ خودان

کچ:

شڤان ئەزم بێریا بۆتی[1]
تێم بێریێ ژ دلەک سۆتی[2]
چاڤ مال تە و پەز[3] ما نەدۆتی
پەز ما ل هەڤشی و نەهاژۆتی[4]

کوڕ:

بێریێ پەزی نابم چەرێ
تە دلێ من ئینا دەرێ
دێ بەرخا بەردم بەر ماکا
وەرە ڕوینن بن[1] سیبەرێ

---

(١) ل جهەکێ دیتر: شڤان ئەزم تە پێ گۆتی.

(٢) ل جهەکێ دیتر: دا تێر بم ژ دیتنێ دیلبەرێ.

(٣) ل جهەکێ دیتر: پەس.

(٤) ل جهەکێ دیتر: نە ئاژۆتی.

کچ:

شڤان نە چاخێ حەنەکا
دەرەنگە من مژیل[٢] نەکە
هەڤال چوون من ژێ ڤەنەکە
شەرمزاریا من گەلەکە

کوڕ:

بێریێ من سەبر نەما
من تەبات نائێت چو دەما
ئەز مریێ دیتنا تەمە
شڤانی بۆ من نەخەمە

کچ:

شڤان ب دەردێ تە ئەز دحەسم[٣]
ل گەل[٤] من نەبێ ئەز بێ کەسم
دێ ڤان کەزیا سەر تە سپیکم[٥]
بێریا تە دڤێت[٦] نێ هەر هندی ئەزم

کوڕ:

بێریێ ئەز ل کێ و شڤانی
من چو ژ کوپالی نەدزانی[١]

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ل دەڤ من ڕوینە لبن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: موژیل.

(٣) ل جهەکێ دیتر: شڤان ئەز ب دەردێ تحەسم.

(٤) ل جهەکێ دیتر: ل دەڤ؛ ئەگەر.

(٥) ل جهەکێ دیتر: بگەهم تە ئەز یا بلەزم.

(٦) ل جهەکێ دیتر: بێریا توت ڤێ.

مێـــرگ و چیمـــەنێـــت مـــن تـــوبی[٢]
تـــە ئـــاگر بـــەردا ڤـــی جـــانی[٣]

کچ:

شـــڤان ئـــەز ژی[٤] نـــە پیـــربیم
ژ کـــەد و کـــەسـپا گونـــدا دویـــربیم
مـــن نـــەشـــیام خـــۆ[٥] ژ تـــە غـــەریبـــیم[٦]
ل ســـەر ئـــەڤینـــا تـــە یـــا دیـــن بـــیم

---

[١] ل جهەکێ دیتر: من چو ژ گوپالی نەت زانی.

[٢] ل جهەکێ دیتر: مەقسەدا دلێ من توبی؛ دەشت و زۆزانێت من تو بی.

[٣] ل جهەکێ دیتر: تە ئاگر یێ بەردای ڤی جانی؛ تو ئەگەر ل دلی و جانی.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ئەز ژك.

[٥] ل جهەکێ دیتر: لێ ئەز چبکم.

[٦] ل جهەکێ دیتر: خەریبم.

# شڤان و بێری

کەچ:

ئەگەر شڤانبێ
ئەز بێریڤانم
عەور بى ل عەزمانى
باران ژێ دبارم

کوڕ:

گول و ڕەیحانبێ
ئەز باغچەڤانم
کەچا ئاغابێ
کوڕێ پاشانم

کەچ:

گەر نێچیرڤانبێ
ل ڕاڤێ خەزاڵم
نوژ و دەرمانبێ
ئەز ئێش و ژانم

کوڕ:

شرین پەیڤبێ
ئەز هوزانڤانم
تو بگڕنژینبێ

کەنیا لێڤانم

کەچ:

گەر ژ من غەریبێ

ل تە ئەز مێهڤانم

کوڕێ بەگابێ

هەر ئەزم خانم

کوڕ:

گەر تو دلداربێ

عاشقێ چاڤانم

گەر تو شەمالبێ

تاڕیا شەڤانم

کەچ:

مێرگ و چیمەنبێ

ل تە ئەز سەیرانم

دیر و نێزیکبێ

هەر ئەز حەیرانم

کوڕ:

بخۆ تو مرنێ

ل گەل تە بەژدارم

کەسەر و کولبێ

سەر دلی درانم

کەچ:

گەر قیز بژاربێ

لاو ئـــــــــــەز جــــــــــانم
تـــــو لمـــــن ب ئـــــەڤنيـــــێ
بـــــــۆ تــــــــه ژيـــــــانم

كــورِ:

دورا ل دەريـــــــــــــــــــــــابێ
كـــورِۆ ئـــەز مـــەلـــەڤـــانم
هنـــــــدى ژ مـــــن دويربـــــــێ
دل ب كـــــــۆڤـــــانـــــــــم

## فەیدە ناکت

فـــەیـــدە ناکـــت پـــەشـــیمانی
تـــە داخـــوازا دلـــی دزانـــی
هـــەی بێبـــەختـــێ مرانـــدن ســـۆز
ل ڤینـــا خـــۆ هـــێلام بیـــانی

دلـــداریا خـــۆ تـــە ل مـــن ڤـــەشـــارت
چـــوون بـــین چیـــرۆك كـــرن ب ســـات
یـــا مـــت[1] ڤیـــا مـــن هلبـــژارت
ئـــەو رۆژ ل ئێڤـــاری هـــەلات

دەردێـــن كـــەڤـــن نـــا ڤـــەكـــۆلم
لـــێ ســـۆزا قـــەد ئـــەز یـــا دۆلـــم
مـــا دێ چـــەنـــد جـــارا مـــن كـــۆژی
ژ مێـــژا كۆژتینـــە[2] و بـــێ تـــۆلم

قـــەد مـــن ب تـــە نـــەمـــا بـــاوەری
تـــو دێ بخـــو رِوی ل مـــن زڤـــرِی
شـــنوی ل كـــەســـارا دل كـــوری
دەرەنـــگ هـــاتی تـــو ل چ د گـــەری

---

[1] من د.

[2] كۆشتینە.

# بۆچی دەلال

ئەگەر تو نەبی ئەز بی ئەڤینم
ژ ڤی دلی ڤەبی مرنی دێ بینم
کا سۆز و پەیمان هەی کچا جوان
زیدەی دەهـ سالا ل بەندا تە د مینم

تە دلی ڕەبەن دا بەر خەنجەرا
بریندار مام دل ژ کول و کەسەرا
هەموو کۆڤانا من دلی وێ ل سەرە
بۆچی دەلالی ما تە دل بەرە

ئەو خەونێت شرین تە بۆ کی هێلان
کانێت ژینا من ئیرۆ ل من شێلان
من چو وار نەمان ئەز بیم بەندەوار
شوینا ڕۆهندکا خوین ژ چاڤێت من باران

تە داخوازیا ڕوح دا بێژم هاتی
محەیف مخابن بهێلی ڤیانی
بۆچی ژبیرکم هەبی ئیمانی
تەمراند ئەڤین سۆراتی کانی

## کا دلێ ته

ئـــەگـــەر تـــە دل هـــەبـــا
ڤینـــــا مـــــن تێـــــدە بـــــا
دا زوی پرســـــا مـــــن کـــێ[١]
چـــەنـــد وەختـــێ تـــە کورتبـــا[٢]

مـــا قـــەی[٣] تـــە دل نینـــە
یـــان ژی بـــێ ئـــەڤینـــە
ل پـــیش چاڤێـــت مـــن ڕوینـــە[٤]
مـــن تێـــر بـــین ژ تـــە نینـــە[٥]

شـــەڤـــێ خـــەونـــا دبیـــنم
تـــو نـــەبـــێ بـــێ ژیـــنم
نێزیکـــــی مـــــن بـــــە جـــــان
دا خــــەمـــــا بـــــڕەڤیـــــنم

تـــە دێـــم و ڕوی جـــوانن
جـــۆت برهـــی قـــەیتـــانن
ل چاڤـــا زێـــرەڤـــانن
ڕەش ڕەنگـــێ چاڤـــانن

---

(١) ل جهەکێ دیتر: دا پسیارا من کێ.

(٢) ل جهەکێ دیتر: جەند ژ من دیر با.

(٣) ل جهەکێ دیتر: یارێ.

(٤) ل جهەکێ دیتر: پیش چاڤێت من ڕینە.

(٥) ل جهەکێ دیتر: دلی ب حەوینە.

دلـــێ ب خـــەم و كۆڤـــان
تـــە هـــێلا بـــێ دەرمـــان
كـــۆل و كـــەســـەر بـــین ژان
ل ســـەر ڤـــی دلـــی نـــێ مـــان

## هویڤی و خۆزی

ل مـــن خـــۆزی بـــی تـــەنـــاس بکـــم
بـــاوەر نـــەکـــە خـــۆ ژ تـــە ڤـــەکـــم
خوینـــا تـــە یـــا کـــەتـــی دلـــی
ســـۆز بـــت ڤینـــێ بێتـــە نـــەکـــم

گرنژینـــێ ل ســـەر ڤـــان لێڤـــە
دێـــم و رویـــا دورێـــن پێڤـــە
دلـــێ نـــازك نـــە بشـــێڤە
ب ئـــەڤینـــی تـــو مـــن باخێڤـــە

ل دیتنـــێ مـــن دل لـــەرزی
کـــرن ئێخســـیر ژار و ئـــەزی
یـــا تـــوت[۱] زانـــێ پـــێ ئاگـــەهـــم
مـــن دل ل دلـــێ تـــە ئـــالزی

مـــن چاڤێـــت رەش زویکـــا خوانـــدن
بـــین تیـــر ل دلـــێ مـــن ئالانـــدن
ئـــەڤـــین دەردە و ئـــەم حـــەلانـــدن
ل دلـــێ مـــن و تـــە هـــات چانـــدن

---

[۱] یا تو د.

## حەیفا ڤێ ژی

مـــن ژی مـــا بـــت ئێـــك ڕۆژ تنـــێ
کـــەســـێ مـــن دڤێـــت مـــن بـــدنێ
کـــول و کـــەســـەرا دل مرانـــد
ئـــاگری هـــوین نـــەبـــەردنـــێ

نـــە گونـــەهکـــارم حـــەژێ دکـــم
دل ئـــەڤینـــداره چ لـــێ بکـــم
نـــزانم پیـــا کـــێ بکـــم
مـــان و نـــەمـــان ل گـــەلـــێ کـــم

ژ خـــودێ بترســن ڤـــێ ل مـــن نـــەکـــن
مـــن خـــەم و کۆڤـــان گـــەلـــەکـــن
دلبـــرین دار مـــا بـــێ دەرمـــان
چـــەنـــد ئـــەڤینـــدار بـــی فـــەلـــەکـــن

چـــەرخـــا دنـــێ ل مـــن زڤـــڕی
دارا ژ بنـــێ وە ل مـــن بـــڕی
ڕابـــم ڕویـــنم چـــاڤ ب گـــری
حـــەیفـــا ڤـــی ژی مـــن دل مـــری

## خوازگینی هاتن[1]

خوازگینێـــــت مــــن هــــاتن
هـــویڤیێن مـــن بجهـــ هـــاتن
پیرۆزبـــــاهین دۆســـــتا
دیـــــــاری هنـــــــارتن

شـــــــریناهی کـــــــرین
نـــەختـــێ مـــن ڤــەبـــڕین
ب زێـــــڕ و مــــەفـــــەرەدات
جلوبــــــەرگــــێن شــــرین

تبـــــل خــــەنــــا کـــــرن
پرچـــــا مـــــن شــــەهکـــرن
مــــەکســــی ل بـــەر مــــن کــرن
بـــــو وارگـــــەهـــــی بـــــرن

شـــــاهی بــــۆ مــــن دەینــــان
ب تلیلـــــــی و دەســـــــت قوتـــــان
کـــــرم بیکـــــــەك جــــوان
ئـــــەز بـــیم خــــودان خێـــزان

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٨/١٥)ێ و ل جهەکێ دیتر (٢٠٠٦/٧/٧) هاتیە ڤەهاندن.

# خەونا شەڤێ[1]

د هزرا دە چووم د ڤێ شەڤێدا
شەڤا تاری چاڤ مام د خەوێدا
من کچەك دیت د خەونێدا
هێژا بی د مالا بابێدا
ڕوی نازکبی جوانبی زێدا
چاڤ غەزالبی بێ کل تێدا
پرچی سڵاڤ دا د بەژنێدا
ب ئەڤینی دلێ من لێدا
پەیوەندی ل گەل من گرێدا
پێ خۆشحالبیم د ڤێ چەندێدا
دیدارا وێ ل من ئۆمێدا
مراد نەبیم سپێیدێ لێدا
هشیار بیم مامە د هزرێدا
بی خەون چوون د بەر ئاڤێدا
فەلەکێ ل من چەرخەك لێدا
ئێخستم د ڕێکا مرنێدا
چاڤێت من گری مان تێدا
من کەسەر ب کولا گرێدا
قەدەر بی و بۆ من خودێدا
بیم کول مامە دلێ وێدا

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٧/٢١)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## تەڤنێ ئەڤینێ

ل گەل من ڤەهینە تەڤنێ ئەڤینێ
ش[١] ڕەنگا بخەملینە دۆزا ڤێ ژینێ
چار قورنەت جیهان تو لی بگەڕێ
ئێك دی وەك من تو بۆ خوە ناینێ

ژینا بێ ئەڤین کۆڤان و کولە
تەت گۆت حەشتە دکم من گۆتە بلا
دیتنا ئەولی دل کەفتی دلە
ناما تە گەهشت ل گەل باقێن گولا

دیتنا چاڤا سۆتن هناڤا
چاڤ ڕەنگ مام بزن وێ ل دورێت ئاڤا
برهی ل هنداڤن لێتکن[٢] سلاڤا
مژیلانك دزانن كێ تێخن داڤا

کەتم بهارا ڤان ئەڤیندارە
دەستێ من بگرە وەك هەمی یارە
ل گەل من گڕنژە دلكێ من ژارە
ئاگرێ ئەڤینا تە چەند دژوارە

---

[١] ژ.

[٢] لێ دکن.

# ئەڤینا ب زۆری

ل ڤێ ئەڤینا ب زۆری
ژیێ من ل گەل بووری
چەوا ئەز خاپاندم
مەرگ و تو بێ گۆری

بیریێ ل من هلدا
چەند گول مانە ل دلدا
خێزانێ خوە ل سەردا
کوشتم ئەڤان دەردا

جوانیێ ل من بارکر
دل مراند و ژارکر
دونیا ل من زینداکر
قەرێ من ئەداکر

حەژێکرنا ژ دویری
بەفر ل سەر ئاگری
ژینا ب ژار و ژویری
ئاڤێتن ل خابیری

## خودا هەوار

خـــودا تـــە ئـــەز ئافرانـــدم[١] دلبرينـــدار
مـەحـريم كـرم ژ خـر[٢] خۆشـيا ئـەز كـرم ژار
ڕێكا ژينـێ ل مـن تـارى كـر ل مـن ڕەش كـر وار
مـام بـێ مـراد ڤـين مـام دلـدا كـولا دل خـوار[٣]
ل كۆڤانـا ئـەز كـرم مێڤـان دەرد بـين هـزار[٤]
هێلام د خەو و هشيار نـەبيم ل مـن كـر ئێڤـار[٥]
مـرادێن خـەلكـێ حاسـل بـين ژێ مـام بـێ بـار
گلـە و گازنـدێن مـن ل تـەنـە نـائێن هژمـار[٦]
تـە ئـەز وێ دايـم بـو مرنـێ مـن گـور بـى وار[٧]
تـە نـەهـێلا ل ڤينـا[٨] شـرين شـين بـت بـە هـار
كانيا مرادێ ل مـن كـرە ژەهـر و مـن ژێ ڤـەخـار[٩]
بـەختـێ تـەمـە ل مـن نـەشـكێنە دلـێ نـازدار[١]

---

[١] ل جهەكێ ديتر: خودا ما ئەز تە بۆچى دام.

[٢] ل جهەكێ ديتر: ڤان.

[٣] ل جهەكێ ديتر: مام بێ مراد ئيغبال هندا بێ ئەڤيندار.

[٤] ل جهەكێ ديتر: ژ كول و خەما مام بارگران كەسەر هزار.

[٥] ل جهەكێ ديتر: ئەز مامە د خەو هشيار نەبيم ل من بى ئێڤار.

[٦] ل جهەكێ ديتر: گلە و گازندێن من ل تە نە خودا هەوار.

[٧] ل جهەكێ ديتر: تە ئەز وێ دايم بۆ مرنێ دێ چم كم غار.

[٨] ل جهەكێ ديتر: ل ژينا.

[٩] ل جهەكێ ديتر: چەند تە دان من تەحلى و زەحمەت من ژێ ڤەخوار.

چەند فەقیربم ئەز ڕازیمە ژ زەنگینەك سار[٢]
گرڕنژین ل من بین گری تازی و زیمار[٣]
بلا دوو دل ل مە شاد كربان ل چولەك بەیار[٤]
پشتی هینگی تە ڕوح بربان ب مرنەك ئێكجار[٥]
لێ چبكم ل من دل هەڕشاند ژمن دویركر یار
كەلها ڤینێ تە ل من هەرافت ئاڤابی پار
ما من سەید شەلاندبین بم گونەهبار
من مزگەفت نەروخاندبین بم بەرپرسیار
ئەز یێ دحالێ خوەدا دحەلم خودا هەوار
من ئێك گونەهـ یا هەی ب تنێ بیم ئەڤیندار
ڕەحمێ ببە تو ب دەردێ من مام بەندەوار
بهێلە بگەهم مرادا خو توێ نوژدار

---

[١] ل جهەكێ دیتر: هویڤیدارم ل من نەشكینێ دلێ نازدار.

[٢] ل جهەكێ دیتر: چەند فەقیر بم من قەبیلە ژ زەنگینا سار.

[٣] ل جهەكێ دیتر: ژ كەربێت گری هەر دێ كەنم ناكم زیمار.

[٤] ل جهەكێ دیتر: خۆزیا ڕۆژا گەهشتبا مە ل تە دۆست بیم بار.

[٥] ل جهەكێ دیتر: بلا شنوی خودا ڕوح بربا ل بن چار دیوار.

# دوو دلێن کول[1]

کور:

کچێ دینێ مـن ژ بـویر نـەکـە یارێ تـەمـە
نـەبـێ دلـی نـادم کـەسـێ هنـدی هـەمـە
ل گـەل تـە بسۆزم تـە نـەبینـم بکـەسـەرم دل
مـن خـەو نـاچن هـەر دوو چاڤـا د هـزرا دەمـە

کچ:

کـورۆ لاو دزانـم کـا تـە چ مـەرەدە
ئـەز ژك ل تـە ئـەڤیندارم دلـێ خـوەدە
هـێش ژ مێـژا دل سـۆتیمە دەردێ تـەدە
ڤینـا تـە یـا د ڤـی دلیـدا دزانـت خـودا

کور:

دلبـەرێ مـن دەرد و کۆڤـان دیتنـا تـەیـە
ئـەڤینـا تـە دلـێ یـێ سـۆتی ب ئاگرڤـەیـە
بـەس ئێکجارێ ل دەڤ مـن ڕوینـە نیڤـا چاڤـا
دابـزانم کـا چـەنـد تـە ئـەز دڤێم بـێ لومـەیـە

کچ:

لاوێ دەلال بـۆچی ئیـرۆ تـو ژ مـن د ڕەڤـێ
بلنـد نـەچـە تـو دێ نـزم ب عـەردێ کـەڤـێ
ئـەگـەر بزانـێ شاهد خـودا مـن چـەنـد تـو دڤـێ
ئەز حەش تە دکم دێ خۆ کەرکێ و نا ئاخڤێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٣/٢٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## حەنان

شـــتلا ڕەیحـــانێ حـــەنانـــە
تـــو ڕینـــە و ســـەركێشـــا جوانـــا
ڕوح ســـڤكی و یـــا خـــوین شـــرین
ب دلـــێ مـــن دەرمانـــدكێ ژانـــا

تـــە بـــەژن و بـــال قامـــەت ئـــەلیـــف
هــــەی هێژایـــا دیـــتن زەریـــف[1]
یـــا د ڤـــی دلیـــدا بـــوی ئـــەرشـــیف
تـــو نـــەبـــی مـــن مـــرین یـــا ل دویـــف

چاڤێـــت ڕەش بـــەلـــەك خۆمـــالن
بۆرهـــ و خۆنـــاڤێ ژێـــت د مـــالن
تـــە دێـــم و ڕوی چـــەنـــد شـــەپـــالن
ژ دیرڤـــە جـــەرگ و دل بـــۆ دنـــالن

لێـــڤ شـــرینا هنگڤـــین پێڤـــە
تـــە هـــەر دوو ڕوی جـــۆتێن ســـێڤە
دبێـــژی حووریـــا هـــەڕن وێڤـــە
ب ئـــەڤینـــداری مـــن باخێڤـــە

حـــەنـــان هـــەی خوینـــا دلـــێ مـــن
ڕۆناهیـــــا ژیانـــــا مـــــن
پـــەیڤـــێ ل ســـەر ئـــەزمـــانێ مـــن
ئـــەز حـــەشـــتە دكـــم هـــەی ڕوحـــا مـــن

---

[1] نازك.

# گرین

ئەز گرینم دێ هەر گریم
دلێ من شکەست بۆچیە بژیم
خۆشیا خاتر ژ من خواستن
کفنێ مرنێ ل بەژنێ دوریم

بەهارا دلێ من هشك بی
پێش چاڤێت من دونیا ڕەش بی
بەلگێ من کەت ژ دارێ وەریا
زالم[١] فەلەك ل من بێبەختبی

د خەما ڤەدام من دل کولبی
ل من ڤەمراند ڤینا هلبی[٢]
دەی بابێن من دل کەڤر بی[٣]
گری و زێمار ل من بین هەڤال

ڕۆژ ل من ڕەبەنێ بین سال
کانێ ئەو گرینا دەلال
چاڤ ڕەش بەلەکا بسك خال[٤]
چبکم دەستێ بن بەریە

---

(١) ل جهەکێ دیتر: چبکم.

(٢) ل جهەکێ دیتر: ئاگرێ ڤینێ ل دلی خۆشبی.

(٣) ل جهەکێ دیتر: ئاڤێتم چۆلەك بێ دەی باب.

(٤) ل جهەکێ دیتر: ل گرینێ پەیڤ مان بێ خال.

پۆشمانی خوەلیسەریە
شرکرنا من ژ بێ کەسیە
مرن ل من داخوازیە
یا هاتیم ڕێزا مریە

بەخت ب ڕەش بیم شوی بۆچیە
نەگەهشتم یێ من دڤیا
بێ مراد بیم دل حەلیا
دین بیم کەتم چول و چیا

تا کەنگی دێ مینم بێ حال
سەر ڤینا خۆ[1] ئەز بیم عەڤدال
حەیفا من گرینا دەلال
دێم سۆرگولا گەردەن زەلال

مر[2] گرینا چاڤ ڕەش بەلەك
كول و دەردێت من بین گەلەك
دونیا لن تاری کر[3] فەلەك
بێ هێز کر[4] گرینا چەلەنك

چەند خۆزی مان د ڤی[5] دلیدا
تیرا من خودی ل بەریدا
مرادا من قەد بجهـ نەهات
ساخم بەس یا دژیم د قەبریدا

---

(1) ل جهەکێ دیتر: گەر بکێشم.

(2) ل جهەکێ دیتر: کا.

(3) ل جهەکێ دیتر: دونیا ل من تاری بی.

(4) ل جهەکێ دیتر: چوو مر ئەو.

(5) ل جهەکێ دیتر: هەمی ئەگەر.

بـــەس مـــن ئيـــرۆ مـــان بيرهـــاتن[١]
تێـــت بـــۆ ســـۆتنێ و نائێـــت گـــۆتن
کـــێ ديتـــە دل بـــين فـــرۆتن
ب ئـــاگرێ مـــن دل هـــات ســـۆتن

برينێـــت مـــن يێـــت غـــەونـــن
چـــو گرنـــژين نـــەبـــوو مـــنن
گـــرێ و رۆنـــدك بـــەهـــرا مـــنن
ب شـــەڤ و رۆژا ناســـەکـــنن

ل کێ بکم هەوار و ل کێ بکم گازێ
ژێ ل مـــن بـــوورێ ب بـــەلـــەنگـــازێ
ئـــاخ مرنـــێ تـــو داخـــوازێ
بـــەرێ مـــن کـــەت ڤـــێ ئـــەڤـــرازێ

خـــودا تـــوێ ل تـــە بکـــم هـــەوار
گـــرين ئێخســـت دەرەك هـــەژار[٢]
هـــێلام ب تنـــێ و دل مـــام بـــێ وار[٣]
کـــول و خـــەمـــا دلـــێ مـــن خـــوار

کـــەتـــم بـــەختـــێ تـــە و خودێـــدا
شـــوينا دانـــێ مـــن کاڤێـــدا
چ زينـــدان بـــێ و خســـتم تێـــدا
تـــە دەرد دا مـــن ژ مرنـــێ زێـــدا

---

[١] ل جهەکێ ديتر: رۆژێت من خر بيرهاتنن.

[٢] ل جهەکێ ديتر: تە دل ئێخست دەردك دژوار.

[٣] ل جهەکێ ديتر: کرم رێڤنگ هێلام بێوار.

ل ڤێ ژینێ مامە بەندەوار
من کەس دی وەك خوە نەدیت ژار
ل گرینێ قەد ناهات بەهار
سوعیدا من ل من بی نەیار

دەریایەك بێ بن کەتمێ
من دل کەت بەر تیر و ڕومێ
ژ من دویرکەت یێ دلی بدمێ
ب چو ڕێکا ئەز ناگەهمێ

کانێ خۆشی ل من بەرزەبین
فەلەك هەمی سویجێن تە بین
هێلام گرینا دلبرین
یێ من نەڤێت ل من کر هەڤژین

## گەلۆ بۆچی

گــەلــۆ گونــەهــا مــن چبــی
ئــەز كــەتــم ڤــی دەردێ گــران
گــول یــا مــن بــی ئــەو نــەدان مــن[(١)]
ئیــرۆ ل باغــەی ل مــن بــی زینــدان

نــێ نــەبمنــە ســەبــڕا دلا[(٢)]
هــێش ل ســەر تــە مــن دل كولــە[(٣)]
ب ڤینــا تــە ب ئــاواز بلبلــە[(٤)]
تــە ڕوح یــا ل مــن كــری بــەلا

نــەشــێم تــە ژ بــویركم هێژایــێ
هنــدی ســاخبم ل ڤــێ دونیــایێ
ڤــین یــا ل دلــی هــاتی چانــدن[(٥)]
تــو بینــەهیــا ڤــان چاڤــایێ

ل تــە مــام دیلــدار[(٦)] ڤــی دلــێ ژار
بێریــا تــە دكــم دل مــام داخبــار[(١)]

---

[(١)] ل جهەكێ دیتر: گولا من چاندی یا من بی.

[(٢)] ل جهەكێ دیتر: نێ نەبمبی دەلالا من.

[(٣)] ل جهەكێ دیتر: سەر تە هێش دلێ من كولا.

[(٤)] ل جهەكێ دیتر: خەم و كۆڤان ژ من ناڤەبن.

[(٥)] ل جهەكێ دیتر: دێ ڤینا تە ل دلی چینم.

[(٦)] ل جهەكێ دیتر: ئەز حەشتە دكم.

تەركا تە ئەز ناكم چو جار
هەتا گۆڕ ل من بتن وار

چەند ژ من دويربێ هەر شرينێ
گەر[٢] نێزيك بى من دحەلينێ
ب دیننێ دلى د هەڕشينێ
بويرهاتنا من دگرينێ

بكەسەرا هزرا ڤەدهوينم
ژينا ب مراد[٣] ئەز نابينم
دێ سەر سۆزا خۆ هەر مينم
سەر تە ڤى دلى د مرينم[٤]

---

[١] ل جهەكێ ديتر: بيريا تە دكم گولا نازدار.

[٢] ل جهەكێ ديتر: تو.

[٣] ل جهەكێ ديتر: ژينا مرادێ.

[٤] ل جهەكێ ديتر: د خەونا دە تە ب چاڤا دبينم.

# ل من خائینی

خـــەلـــەتیـــا مـــن بـــی یـــاری
مـــن هـــزرا بـــاش ڕۆژێ نـــەت[1] کـــر
مـــــن زانیبـــــا دێ هوســـــابی
ئـــەڤ دلـــە بـــۆ تـــە ڤـــەنـــەدکـــر
محـــەیـــف هنـــد زوی تـــو خـــائینی
تـــە نـــاخوم بـــێ قنـــدەك شـــەکـــر

ئـــەز خاپانـــدم ب فـــەنـــد و فـــێلا
هـــویڤی خـــوەزی ل مـــن بـــین کـــەســـەر
ل دەریـــەك کـــویر ئێخســـتم پـــێلا
ســـۆز و پـــەیمـــان چـــوون بـــین ئـــەگـــەر
بـــێ ســـەبـــەب ئـــەڤینـــی هـــێلا
ســـویجێت مـــن بـــین مـــن حـــەشـــتەکـــر[2]

بزڤـــــــرم نیڤـــــــا ڕێیـــــــا
ل خـــــوە د حـــــەقیـــــنم پـــــەشـــــیمانم
مانـــــدی کـــــرم تـــــە هوتڤیـــــا
بـــێ هێـــز بـــیم ئـــەز پـــەریشـــانم
تـــە دل کـــول کـــر چـــەنـــد تـــەشـــیا
بـــــــلا بمـــــــرم دا بـــــــزانم

---

(1) نه د.

(2) ل جهەکێ دیتر: چ بکم دلێ من حەش تەکر.

ئـــەڤينـــا تـــە نـــێ ســـەر دەڤبـــی

مـــن بـــاوەركـــر خشـــيم بـــيم ئـــەس

ل گەل من يارێ توب گڤ گڤبی

ب ڤـــان هێجـــەتـــا هـــێلام بـــێ كـــەس

پســـيارا مـــن بـــێ بـــەرســـڤبی

شـــخەلـــەتيـــا[١] ئێـــدی مـــن بـــەس

---

[١] ژ خەلەتيا.

## جۆرێن چاڤا

هندی کچێت چاڤ ڕەشن
ژ دویرڤە ئەو لاوا د کوژن[1]
خوینا وان ل ڤینێ گەرمە
بەخت و باوەر[2] کەیفخۆشن

تورینن[3] کچێن چاڤ شین
شەنگ[4] و شۆخن خەم ڕەڤین
ل ئەڤینێ دکن باوەشین
لاوا دل بۆ هەر شین

کچا[5] چاڤ ڕەنگ تەبەسی
خۆشیا[6] دلێن بێ کەسی
ئەڤینێ خۆ بۆ د چەماند
لاوان[7] دل بۆ د ڕەقسی

ڕەندا[8] چاڤ ڕەنگ کەزوانی
ڕەوشا باغچێن[1] دلانی[2]

---

(1) ل جهەکێ دیتر: ل دیتنێ لاوا دکوژن.

(2) ل جهەکێ دیتر: سەر بەختێ من.

(3) ل جهەکێ دیتر: شرینن.

(4) ل جهەکێ دیتر: شەنگن.

(5) ل جهەکێ دیتر: کچێن.

(6) ل جهەکێ دیتر: خۆشیێن.

(7) ل جهەکێ دیتر: خورتا.

(8) ل جهەکێ دیتر: کچا.

دلێ وار تێده[٣] دانی
ژ کەیفا د کۆژت[٤] خودانی

چاڤ ڕەنگێ قەهوا هندێ
ل ئەڤینێ سەربلندێ
شرینن دل حەلینن[٥]
ل ژینێ فندو و ئەلەندن[٦]

کچا چاڤ ڕەنگ هنگڤینی
تێن خوارنێ ب لەخرینی
خۆشێ ل دلا د زویرینی[٧]
خنیا ل گەل بکن ئەڤینی

ئەو کچا چاڤ خمیری[٨]
زەنگین کوژت[٩] ل گەل فەقیری
مالا لێ بت کابانی
د کوژت مێری و خەزیری

ڕوحا دلانن چاڤ زەر
دەم هێژانە و دلڤەکەر

---

(١) ل جهەکێ دیتر: باغچێ.

(٢) ل جهەکێ دیتر: گولا باغچێ دلانی.

(٣) ل جهەکێ دیتر: تێدا.

(٤) ل جهەکێ دیتر: د کوژن.

(٥) ل جهەکێ دیتر: وان دلێ لاوا حەلاند.

(٦) ل جهەکێ دیتر: هەمی لاو لێ ب ئەڤینن.

(٧) ل جهەکێ دیتر: دلا ب ئێك دوو د حەسینی؛ خوین ل دلا شرینی.

(٨) ل جهەکێ دیتر: خومیری.

(٩) کۆشت.

ل دلا دکن کول و کەسەر[1]
خنیا[2] لاوێن دل ل سەر[3]

چاڤ شێلینە[4] خویساری
بۆرهی هەیڤن[5] ل ئێڤاری
پەیڤ خوەشن[6] پڕ شرین
شەکر ژ لێڤان[7] دیاری

خۆمالینە[8] چاڤ بەلەك
سەر دە[9] تێن پرچا خەلەك
گەردەن زەلالن گەلەك
دبێژن فەلەکێ وەلەك

چاڤێت[10] عەزمانی جوانن
ل ئەڤیندارا زۆزانن
مێرگ و چیمەنێت وانن
سەیرانگەهێت[11] دلانن

---

[1] ل جهەکێ دیتر: دلا دکەنە کەر و کەر.

[2] ل جهەکێ دیتر: خۆزیا.

[3] ل جهەکێ دیتر: خنیا مالا ئەوی بن بەر.

[4] ل جهەکێ دیتر: شیلێ.

[5] ل جهەکێ دیتر: برهی هەیڤا.

[6] ل جهەکێ دیتر: خۆشن.

[7] ل جهەکێ دیتر: لێڤا.

[8] ل جهەکێ دیتر: خۆمالن.

[9] ل جهەکێ دیتر: دا.

[10] ل جهەکێ دیتر: چاڤێن.

[11] ل جهەکێ دیتر: سەیرانگەهێن.

مخازرینە ڕەنگ چاڤ
ژینا دلدارا یا ل ناڤ
دلێن لێ نەکن سلاڤ
ل ناڤ ئەڤینێ نەمان ناڤ

## جۆرێن كچا[1]

هندی كچێن ئەسمەرن
شرینن دلڤەكەرن
هەژینە ل ژینێ كوبار
لاوا دل بۆ ب كەسەرن

تورینن بەژن زراڤ
ڕەش ڕوحانن چەق بەلاڤ
قەد ژێڤە نابن چو چاڤ
خنیا یێن لێبكن سلاڤ

سۆر و سپینە ڕوح سڤك
شۆخن شەپالن گنك
ڕوی نازكن بەفر و خوین
خنیا لاوێن ئەوێن یێن نك

ناڤنجینە دلڤەكەر
نە كورت نە درێژ قەدەر
چاڤ خویسارن پرچ زەر
خنیا لاوێن دل ل سەر

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٤/٣/٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن. ل جهەكێ دیتر: (٢٠٠٤/٢/٧).

## ژین هێلا تاری

دلێ تە کەلها ئەڤینا من بی
گرتی دەرگەهبی بۆ من ڤەنەبی

تو ل کێ دا داریی ژین هێلا تاری
بۆچی شمن ت[1] ڕەڤێ بەرزە و نەیاری

ل من نەڤەشێرە وان چاڤێن بەلەك
دل دایە بەرکێرا برین بین گەلەك

دیار بە یارێ ل هاتینێ نوژدارێ
دەرمانکە کولا بانگی و هاواری

تە ل من مراندی دلێ پڕ ئەڤین
تە هێلا شکاندی ئێش لێ خرڤەبین

خۆزی و خەمداری بەهرا من ژاری
من گۆت دلداری ژبیر چوو سۆزداری

کەسەر و کۆڤان ل دلی بن مێڤانی
ئاخین و نالین ل هویڤیا بیم شڤانی

من سووندا خواری بارکم ژ ڤی واری
ڤینا ب ڤی کاری نەکم بەژداری

---

(1) ژ من د.

## جانا ل ناڤ ڕەزی[١]

مــــن جانـــەك دیـــت ل نـــاڤ ڕەزی
خوینـــا وێ ل ڤـــی دلـــی تـــەزی[٢]

ل دەڤ ڕوینشـــتم ســـەر كـــانێ[٣]
ژ جوانیـــا وێ مـــن دل لـــەرزی[٤]

بـــەرسـڤ و دان ل مـــن بـــی خـــوەزی
ئـــەزمـــانێ مـــن تێـــك ئـــالزی

گـــۆت مـــن لاو تـــو ل چـــی دگـــەری
تـــو چـــی د فرۆشـــی و چـــی دكـــری[٥]

نـــە شـــڤانی و پـــەز نـــە ل بـــەری
نێچیرڤـــانبی كـــەو چـــوون چـــەرێ[٦]

بـــۆ دامـــایی و دل كـــەســـەرێ
ڕێڤنـــك بـــێ خێركـــە وەغـــەرێ

یـــا لێدگـــەرم بـــەرام بـــەرم
ل هـــەر دوو چاڤێـــت وێ بكـــرم

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٧/٢٧)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەكێ دیتر: ڕوی سوڕگولبی و چاڤ نێرگزێ.

[٣] ل جهەكێ دیتر: ل گەل ئاخفتم سەر كانیێ.

[٤] ل جهەكێ دیتر: دەرزی.

[٥] ل جهەكێ دیتر: تو غەریبێ ژ ڤێ دەڤەرێ.

[٦] ل جهەكێ دیتر: بێ كەو تو نێچیرێ دگەرێ.

نــــــه نێچيرڤـــــــان و شــــــــڤانم[1]
كـــــهوا بـــێ داڤ نـــــهشـــيم بگـــــرم

دل دامايمـــــــه ل تـــــه ب ئـــــهگـــــــهرم
كويڤـــــه بچـــــم دێ ل تـــــه ڤـــــهگـــــهرم

[1] نه شڤانم و نه نێچيرڤانم.

# خەم و خەیال

خەم و خەالێت من گەلەکن
نائێن هژماتن ل من زێدە نەکن
من دل داخبارێ چاڤێن بەلەکم
حەیف و مخابن مە ژ هەڤدوو ڤەکن

من چەند باوەری ب ئەڤینا تە کر
تە ل من دل مراند زوی تەرکا من کر
من چاڤ مان بگری گریا تە من کر
ڕۆهندك من مالین ل وان ڕۆژێن شەکر

گڕنژینێت من تە هێلان هندا
کا دلێ ب ئەڤین ڕەحمێ ژێ فردا
ئەز بیم بەندەوار من ژەهری ڤەخوار
فەیدە ناکت یار من دل ما د خەودە

من شەڤ درێژ بی خەوکا من نایێ
ئەز مەست و گێژ بیم کەتم بەلایێ
تێر نال و ئێش بیم من گرتی تایێ
دل مام بێ هویڤی تەمرن دایێ

# جیهان[1]

جیهـــان ل دلـــێ تـــه بـــیم مێڤـــان
ل بـــەژن و بـــالێ بـــیم زێـــرەڤـــان
گـــەر ڕۆژەكـــێ تـــه نـــەبیـــنم
دلـــێ مـــن ب كـــەســـەرە و كۆڤـــان

جیهـــان بـــۆ مـــن مـــەســـت و ژینـــێ
تـــه نیشـــا مـــن دا ئـــەڤینـــی
بـــەر دلـــێ مـــن چـــەنـــد شـــرینێ
خـــەمـــا ژ ڤـــی دلـــی د ڕەڤینـــێ

ل گـەل ئێـك مـه سـۆز و پـەیمـان دان[2]
مـــه دوو دل پێكڤـــه گرێـــدان
هـــەی شـــەنـــگ و شـــۆخا دەزگـــری[3]
وەرە مـــالا مـــن ب ســـەرەدان

جیهـــان خۆشـــتڤیا دلـــی
فنـــد و شـــەمـــالێ و لـــێ هلـــی
ل بـــاغچێ دلـــێ مـــن[4] ســـۆرگولی
نـــوژدارا ڤـــی دلـــی ب كـــولی

---

[1] ئەڤ هەلبەسته ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٢/١٧)ێ، هاتیه ڤەهاندن.

[2] ل جهەكێ دیتر: سۆز و پەیمان مه ل گەل ئێك دان.

[3] ل جهەكێ دیتر: نازەلین.

[4] ل جهەكێ دیتر: د باغچێ دلیدا.

جیهـــــان ڕەوشــــــا وارێ منـــــی
کـــــەلهــــا ڤینــــێ تـــــە نژنـــــی
دەرگـــــەهڤـــانێ دلـــێ تـــــەمـــــە
بـــــەس نـــــەمـــــرم تـــــو بـــــۆ منـــــی[١]

جیهـــان گـــــەهشـــتن بـــێ مـــــراد
تـــــو شـــــرینی و ئـــــەزم فـــــەرهـــــاد
مانـــــە بـــــەســـــە تـــــە دل حـــــەلانـــــد
تـــــە لاوێ خـــــۆ ب دلڤـــــە مرانـــــد

جیهـــان کـــا ڕۆژا تـــــە بکـــم بیـــــك
ببـــم زاڤـــا ب کـــــەیـــــف و موزیـــــك
ئۆمێـــد دا ل مـــــە نـــــەبـــــن خۆزیـــــك[٢]
وەرە ل ژینـــــا مـــــن بـــــە شـــــەریـــــك

بـــــۆچی ئـــــەڤینـــــدار نـــــە شـــــادن
دلـــــێن نـــــازك بـــــێ مـــــرادن
جـــــەرگ و دل تـــــە ل مـــــن هـــــەژانـــــدن
کـــــول و خـــــەم تـــــە لـــــێ ئالانـــــدن

---

[١] ل جهەکێ دیتر: بەس نەمرم ئەز بۆ تەمە.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئیرۆ ئۆمێد ل من بین خۆزیك.

# دوو دل هێتیم بین

بلا ل ڤێ ژینێ بێ کەس سوکار بام
نە مابام ب تنێ بێ ئەڤین ژار بام
مرادا دلی هەر تو بێ یارێ
تە کانی شێلاند ئەز تێنی ل بەر مام

تە دل هێلان خەو شەڤ لێ درێژ بی
ئۆمێدین خەون سەری من گێژ بی
هەی گەوا داڤ دۆزئەڤ دلە کوزبی
بۆچی ژیێ فر دا ژیێ ل من ئالزبی

مێرگ و چیمەنا چوو خەمل نەمان
خۆشیا خاتر خوەست ل شوینێ مان کۆڤان
ها بەهار هشک بی بلبل ما بێ وار
هۆ زوی ژ من ڤەبی ڤین ما بێ خودان

ل زۆزان و کویستان لێ خەم ڕەڤین بین
ل باغ و بیستانا بیرهاتن شین بین
باش ڕۆژەك جوان مە گۆت دێ بژین
ئەڤین ژ من ستاند دوو دل هێتیم بین

## هەی دلبەرێ

هەی دلبەرێ هەی دلبەرێ
ل مب[1] زڤرە وەکە بەرێ
من نەهێلە ل سەر ڤان کولا
ل دلێ کۆڤان تو کەسەرێ

دلبەر تو بی یا مت[2] ڤیا
ژینا ل گەل تە دل ڕازیا
دێ حەشتەکم[3] من چەند ڤیا
نێ کەهشتن هەر خۆزیا

دلبەر داڤێ ل من ئالزی
ئەڤ دلە تە بۆ خۆ دزی
بێ تە نەشێم بکم ژیان
کونەهباری بۆ تو بلەزی

دلبەر من تو هلبژارتی
ژ هەمی قیزێن ڤی وەلاتی
خۆزیا من دیتی ڕۆژ هاتی
نە هوگر بام سەرهاتی

---

(1) من ب.

(2) من د.

(3)

## دل ئالۆزێ

من ژ ڤینا خۆ بێ بار نەکە
ژ هەر دوو چاڤا من دویر نەکە
خەریبم ئەز تە دل حەلاند
دەریێ مرادێ ل من ڤەکە

تو ئۆمێدا دلێ من بی
ڤینێ ناکم گەر نە تو بی
خۆزیا ل دنێ دیتنا تەبی
نازدار نەبە گولا ڤەبی

من نەهێلە خەما خوارم
ئەز دل کولم بریندارم
دویری منێ لەو ئەز ژارم
ل خۆش و نەخۆشیا بەژدارم

نازیا نەکە هەی بێ سۆزێ
تە دلی من سۆت وەك كوزێ
وەرە ئاگری ژێ ڤەمرینە
یان تو ژك دێ ل گەل من سۆژی

# ته دل هێلا پەلامه[1]

نامـــــه گـــــەهشـــــت ب گولاڤـــــه
تـــــه دل [2]هـــــێلا پـــــەلاڤـــــه
نـــــەشـــــيام بخـــــوينم دەلالـــــێ
ڕۆهنكـــــارێ نـــــەدان چاڤـــــا[3]

پشـــــتى ڕێـــــز و ســـــلاڤا
دلـــــى ئـــــاگر كـــــەن ناڤـــــه
لـــــەرزام وەك بهـــــا ل نـــــاڤ ئاڤـــــا
بيرهـــــاتن تـــــێن[4] بـــــەرچاڤـــــا

ل وارى نێـــــرم ب گولاڤـــــه[5]
ل ئـــــەڤـــــان چيـــــا و ســـــويلاڤه
كـــــەوگێـــــرا ڤينـــــا مـــــن بـــــى
تـــــه دل ئێخســـــت تـــــەلـــــه و داڤـــــه[6]

بـــــەر گونـــــدى ب دار بـــــەناڤـــــا[7]

---

[1] ل جهەكێ ديتر: نامه گەهشت.

[2] ل جهەكێ ديتر: ئەڤ دله.

[3] ل جهەكێ ديتر: ڕۆهندكا ڕێ نەدان ڤان چاڤا.

[4] ل جهەكێ ديتر:بيرهاتن تنێ.

[5] ل جهەكێ ديتر: ل شويندارى نێرم ب گولاڤه.

[6] ل جهەكێ ديتر: دل ئێخست تەله و داڤا.

[7] ل جهەكێ ديتر: مه بەر گوندا به دار بەناڤه.

زەری مـــــەشـــــیا ســـــەرئاڤـــــا[1]

یـــا مـــــت[2] ڤیـــا نـــــە ل ناڤـــــە[3]

ئـــــاگر بـــــەر بـــــی هناڤـــــا[4]

---

[1] ل جهەکێ دیتر: زەری مەشیان چوون سەر ئاڤە.

[2] من د.

[3] ل جهەکێ دیتر: کەسەرا دلێ من نە ل ناڤە.

[4] ل جهەکێ دیتر: تە ئاگر بەردا هناڤا.

## نەدانە من(١)

نە دانە من دەلالا من
ئاگر بەردانە دلێ من
دل مام دامای و پەریشان
مرن خۆشتر بی ژینا من

ئەرێ بۆچی ئەی فەلەکێ
دیر ئێخستم ژ چاڤ بەلەکێ
بۆ من ب تنێ تو جەلەکێ
بەختێ تەمە ڤێ ل من نەکێ

خودا مرادا من نەبی
خۆشتوڤیا من بەرزەبی
ئەو نەبت من کەس دی نەڤێت
ژین و مرنا مە پێکڤەبی

فەیدە ناکن ڕۆندك و گری
چلێ بکم ڤی دلێ مری
دلێ من سۆت و کۆزری
ب چو ئاڤا ل من نەڤەمری

(١) پەشیمانی، ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٨/٩/٢٩)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## ته ئەز هێلام یارێ

تە چ ئینادە سەرێ من
وەرە تو سەحکە دلێ من
کا ئەو سۆزا تە دایە من
تە بۆچی هێلام یارا من

نازدارا تو ل من نەکە
سەبەبێ خۆ شلۆڤەکە
تو دوو دلا ژێکڤە نەکە
سۆزا ئەڤینێ گەلەکە

ژینا بێ ئەڤین بۆچیە
زیندانەکا دەم تاریە
ئەڤینداری باوەریە
یا شرینە دگەل خۆشیا

بێ سۆزێ بیرا خۆ بینە
کولا ل دلێ من نەچینە
دلێ ب ئۆمێد نەمرینە
گەر تو نەبی من کەس نینە

# نادرا

چەند تو رینێ نادرایێ
ڕوح سڤك كچا مەردایێ[1]
خوین شرینێ چەند هێژایێ[2]
ب جانیا خۆ ل دلا بەلایێ[3]

ڕوی سۆرگولێت ناڤ باغایێ[4]
تو نازدارا ل بەر دلایێ
بێ دەرمان تو چاڤ كلدایێ
بەژن سپیندارا حەودایێ

نادرا هەی جوانا[5] دەلال
بەخت و باوەر شۆخێ و شەپال
خنیا یێ تو ل گەل بی هەڤال
بۆ دیتنا تە نامینت حال

هەر دەم ل پێش چاڤا توی خەیال
خۆشتوڤیا گەنجایێ و كال
ڕۆناهیێ و فندی شەمال

---

(١) ل جهەكێ دیتر: كچا دایێ.

(٢) ل جهەكێ دیتر: شەكر و چایێ.

(٣) ل جهەكێ دیتر: ب جانیا خوە دەرد و بەلایێ.

(٤) ل جهەكێ دیتر: تە ڕوی سۆرگولاێت باغایێ.

(٥) ل جهەكێ دیتر: ڕندا.

گـــــەردەنـــــا زەر نیشـــــانە و خـــــال

نـــــادرا بوژکـــــۆژا[1] گـــــولێ
ئـــەو وار خۆشـــە عـــەردێ تـــو لـــێ
فـــەنـــەرێ بـــۆ ژینـــێ هلـــێ
هنگڤینـــێ ل ســـەر دلا د حـــەلـــێ

فـــەهمـــایێ و زێـــدە ب ئـــاقلێ
بـــێ کـــێم و کاســـێ کـــاملێ
ڕەوشـــــا خـــــابیری و هیزلـــــێ
چـاڤ ڕەشـێ[2] تـو کـول مـن ل کـولێ

---

[1] بوشکۆژ.

[2] ل جهەکێ دیتر: نادرا من.

## نامه گەهشت

نامە گەهشت ل گەل سلاڤا
غەریب کرم نیڤا چاڤا
من نامە خواند ب ڕوهندك و گری
دلێ من ئاگر یێ ل ناڤا

پەیڤێت[١] نازك گەهشتن
دل و جەرگ ل من برشتن
دەردێ غەریبیێ ئەم کوشتن[٢]
من ڕوهندك ژ چاڤا مالشتن

بویرهاتن ل من بین خوەزی
ژ کەسەرا من دل لەرزی[٣]
فەلەکێ ئەم ژ هەڤدوو[٤] کرین
ژ خەم و کولا من دل تەزی[٥]

ئاخ فەلەکێ مانە بەسە
بەس جارەکێ تو بمن حەسە[٦]
یار دویر بت من دل بێ کەسە
لوما سۆتم ژ گۆتن و قەسە[١]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: پەیڤێن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئەز کوشتم.

[٣] ل جهەکێ دیتر: دەرزی.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ژێکڤە.

[٥] ل جهەکێ دیتر: کول و خەم ل من ئالزین.

[٦] ل جهەکێ دیتر: بەس جارەکی ب دەردی ب حەسە.

## نەگەهشتم مرادا خۆ[٢]

نەگەهشتم مرادا خۆ هەوار خودا
دێ چ بێژم دەلالا خۆ ژێ مام جودا
د هزرا دا چووم كارێ من بی ڕۆندك و گری
هەی هۆ فەلەك تو بی ئاستەنگ د ڕێكا مەدا

تە نەهێلا ل گەل شاد ببم[٣] ژی ل من بۆری
دلێ مندا[٤] مان چەند خۆزی و ئەز بیم گۆری
ئەم بین قوربانێت ئەڤینێ ب زوڵم[٥] و زۆری
ل مە[٦] جەرگ و دل هاتن سۆتن بێ خەم خۆری

جانا من ما[٧] د مال بابێدا و كەتم حەیفێ
كرم كەلەنداری خەما دویربیم ژ كەیفێ[٨]
سەد ئاخ و داخ ما بۆچیە بمینم ساخ
شەڤ مام تاری ژ من دویركەت ڕۆناهیا هەیڤێ

---

(١) ل جهەكێ دیتر: حەلاندم ڤان گۆتنا و قەسە.

(٢) ئەڤ هەلبەستەل ڕێككەڤتی (٢٠٠٦/٦/٢٦)ێ، هاتیە ڤەهاندن. ل جهەكێ دیتر: (٢٠٠٦/٨/١).

(٣) ل جهەكێ دیتر: تە نەهێلا پێك شاد ببین.

(٤) ل جهەكێ دیتر: دلێ وێ دا.

(٥) ل جهەكێ دیتر: ب تەعدا.

(٦) ل جهەكێ دیتر: ل من.

(٧) ل جهەكێ دیتر: سەر لێ سپی بی.

(٨) ل جهەكێ دیتر: ئەز كرم كەلەنداری خەما دویر مام ژ كەیفێ.

دلـێ تــه پــاوانێ مــن بــی هــات چــەرانــدن
فــەلــەك گونــەهبــارە یــارێ[1] ئــەم خاپانــدن
ئــەز و تــو هــەر دوو کرنــه ژار دل مرانــدن[2]
گونــەهــا مــن و تــه چبــی ژێــك قــەتانــدن

منٛ[3] كول داعیران ب كەسەر ب دلێ كۆڤان
گاڤا ته دبینم جەژنه ل من هەی ڕوح و جان
فەیده ناكت هندی بێژم وەستا ئەزمان
بیرهاتنێت من گەلەكن لێ بیم شڤان

---

[1] ل جهەكێ دیتر: یارێ نه گونەها من بی.

[2] ل جهەكێ دیتر: تو ژار بی ئەز ژی مامه ژار دل مراندن.

[3] ل جهەكێ دیتر: مه.

# بریندارم[١] بێ نوژدار[٢]

جزیریمە[٣] و جەگەرخوینم[٤] و فەقیێ[٥] تەیران[٦]
من كار بی هۆزان ڤەهاندن ب دلێ كۆڤان[٧]
پەیڤێن نازك و شرین مان بێ خودان[٨]
داخوازا من هەر دوو چاڤ بین تە ژ من ڤەدان[٩]
ل بەندا تە ئەس مام چەندین سال ئەس بیم قوربان[١٠]
كول و كەسەر من مان دلدە كرم دێران[١١]

ئەز دلدارەك دلبرینم تو لێ نوژدار
چو دەرمانا ئەز نابینم من ساخكن یار
تو نوژدار بی ل تە ب ئەڤینبیم تە هێلام ژار

---

(١) ل جهەكێ دیتر: دەردێ.

(٢) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٤/٣/١٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٣) مەلا ئەحمەدێ جزیریێ ناڤدار ب مەلایێ جزیری (١٥٧٠-١٦٤٠).

(٤) شێخ مووس حەسەن ناڤدار ب (جەگەرخوون) هەلبەستڤانێ ناڤدارێ كورد (١٩٠٣-١٩٨٤).

(٥) فەقیێ تەیڕان (١٥٩٠-١٦٦٠).

(٦) ل جهەكێ دیتر: جزیریمە و فەقیێ تەیرا و جەگەرخوین.

(٧) ل جهەكێ دیتر: من هۆزان ب تە ڤەهاندن ب دلێ برین.

(٨) ل جهەكێ دیتر: پەیڤێن نازك و شرین بۆ كێ هێلان.

(٩) ل جهەكێ دیتر: كوڤاندارێ وان چاڤا بیم ئەز مام بێ ژین.

(١٠) ل جهەكێ دیتر: ئەڤیندارێ گولێ ئەز بیم ل من هات چنین.

(١١) ل حهەكێ دیتر: كول و كەسەر من مان دلدا ئەم ژێكڤە بین.

ئەز دێ ل هویڤیا تە هەڕمینم نەبە نەیار
ڤینێ ل چو دلدی ناچینم ئەزم سۆزدار
دلی ب خودانڤە دمرینم من کور بت وار

یارێ چ دلمان بی و سل بین تو ژ من ڤەبی
پارزوینکێ خەما دام ملی سەبەب چبی
خەمدارم چەند بکم گری بی لومەبی
شوینا ڕۆهندکا ژ چاڤا بێن خوین بێ فەیدە بی
دل شیشەیە یێ ل من شکەستی جەبار نابی
تە دەرگەهێ ڤینێ ل من کرن مانەڤەبی

دل سۆتیمە و خەم هلگرم من دەردە
ب فند و فێلا ڕازی کرم ئەس مام هندا
ژ خودێ بترسە بزڤڕە ب ڤان گازندا
کرم ئێخسیر و بەندەوار ئەڤە چەندە
تە ئەس گۆری ئێکدی کرم ئەڤین بەردا
سۆز بت ئێدی نەکم ئەڤین بریار من دا

# نەینە بیرا من

نەینە بیرا من وان ڕۆژێن بەرێ
تە دلێ من سۆت و لێ ناڤەمرێ[1]
برین ڤەکۆلان هەی دل کەڤرێ[2]
جەرگ ل من براشت هەی ڤین ئاگرێ[3]
دلێ من حەلاند[4] چووێ[5] وەغەرێ
ژ کول و خەمێن تە من دل هات دەرێ
چوون زۆزانێت خۆش[6] کو لێ بکم چەرێ[7]
خوە ل من هندا و ل من تاڤەگەرێ[8]
چەند سویندا بخۆم هەر بێ باوەرێ
سوبا دێ مری ب گونەهە کەسەرێ[9]
تو دێ چێ بێژێ[10] ڕۆژا مەحشەرێ

---

(١) ل جهەکێ دیتر: تە دلێ من سۆت چەند دل کەڤرێ.

(٢) ل جهەکێ دیتر: برین ڤەکۆلان بێ ڕەحم دلێ.

(٣) ل جهەکێ دیتر: جەرگ ل من براشت ل من ناڤەگەری.

(٤) ل جهەکێ دیتر: کانی ل من شێلاند.

(٥) ل جهەکێ دیتر: دچێ.

(٦) ل جهەکێ دیتر: هشك بین وار و گۆز.

(٧) ل جهەکێ دیتر: من لێدکر چەرێ.

(٨) ل جهەکێ دیتر: خۆ ل من هندا کر هەی ڤین ئاگرێ.

(٩) ل جهەکێ دیتر: سوبا دێ مرێ ژ قەنجا ڤەدەرێ.

(١٠) ل جهەکێ دیتر: دێ چێ بێژێ خۆ.

هەیلا زالمێ ل خۆ نازڤڕێ[1]
هەی گونەهبارێ[2] تو ل من ب ئاگرێ
دێ نزم کەڤێ بلند تو بفرێ
غاین دیار بی تو نە ڤین کرێ[3]
چ دلە ل تە ئاخ ما تو[4] کافرێ
تە ئەز خاپاندم و دچێ ل ئێکدی دگەرێ
دێ وێ ژی وەك من ڕێکێ[5] لێ برێ
تو نە دلدارێ و دلا مەستری[6]
من گۆت حەژ تە دکم تە د گۆت من ئەرێ[7]
هەی دۆستا ڕۆژێ و دەست ب خەنجەرێ[8]
دەربێ خودانا[9] و دخوازێ خاترێ
ڕۆژ دێ ل تە هێتن دێ چێ و دێ مرێ
کەس نابێژتن حەیفا دلبەرێ[10]

---

(1) ل جهەکێ دیتر: هەی گونەهبارێ صوبا دێ مرێ.

(2) ل جهەکێ دیتر: چەند گونەهباربێ.

(3) ل جهەکێ دیتر: غاین دیا ربی تو نە دل کرێ.

(4) ل جهەکێ دیتر: چ دلە ل تە ئاخ چەند دل کافری.

(5) ل جهەکێ دیتر: دفنێ.

(6) ل جهەکێ دیتر: تو نە دلداری ژ مرنێ مەستری.

(7) ل جهەکێ دیتر: تە گۆت حەژ تە دکم من گۆتە ئەرێ.

(8) ل جهەکێ دیتر: هەی دوستا ڕۆژێ قەی نەبە شەڕی.

(9) ل جهەکێ دیتر: خەنجەر ل دلیدا.

(10) ل جهەکێ دیتر: تو ئەز حەلاندم جانێ دلبەرێ.

## بابێ من

بابێ من هەی عەزیزێ من
خۆشتڤیێ سەمیانێ من
تو عەزیزی ل بەر دلێ من
بابێ هێژا هەی ڕوحا من

بابو تانجا سەر ڤی سەری
ل ژیانا من تو پالدەری
سەرخۆ ڕاناکم وی قەری
زەحمەت تە یا بمنڤە بری

بابو ئەز جەگەرا تەمە
ئەڤینا ل ناڤ دلێ تەمە
ڕێزەك مەزن دێ ل تە گرم
بابو ئەز قەردارێ تەمە

# چوو ڤینا بەرێ

چــوو ڤینــا بــەرێ لــێ ناڤــەگــەرێ
تــە ل مــن ڕەشــکر ژیــن ئــەســمەرێ
مرانــد گڕنــژین هــێلام بــێ ئــەڤــین
ســاخ نــابن بــرین تــولێ ئــەگــەرێ

نێ دل ما شکەستی تە تیر لێ بەستی
تــەڤنــێ ڕاچانــدی داڤ ژێ ڤــەڕەســتی
مام ل سەر ڤان کولا هاتن توخوەستی
گڕنژین مان سل خاتر ژمن خوەستی

باغــان بــێ گــول نــێ بــەلــك وەرانــدن
ژێ ســل بــین بلبــل ئــەوان نــەخوانــدن
تە ژ خۆ ڤەکر دل ژگری چاڤ مان کول
ڤــەمرانــدن ئــاگرێ هــل بــرین ئارانــدن

بینــەبــرا خــۆ تــە ل ڤــێ ڕێ شــاندم
ل دەریــا ڤینــا خــۆ ئــەز خــەندقانــدم
ل جــەرگــی دکــێ دا خــونێ تــەمرانــدم
مــن دل ل ســەر تــەبــی ل خــەما نڤاندم

# ب هیڤیمه ئەز[1]

نــەشــێم خــۆ شــته[2] بــێ هیڤــیکم
ئــەز دێ ســۆزێ دگـــەل تـــه نـــیکم
دێ دلـــێ بـــۆ تـــه کـــم وار
ب[3] ئـــەڤینـــا تـــه دێ تـــەژیکـــم

ئـــەڤینـــدارێ بـــەژنـــا تـــەمـــه
تـــه ژبیـــر نـــاکم هنـــدی هـــەمـــه
ئـــەز بمـــرم شـــەیـــدایێ تـــەمـــه[4]
قـــەد نـــه د خـــەمـــا مرنـــا خـــوه[5] مـــه

بـــەهـــار دلـــێ مـــن گـــەشـــکه
ڤـــەگـــەره و ڤـــی دلـــی[6] خـــوەشـــکه
دێ ڤـــی ژی ل خـــۆ تـــه نیڤـــیکم
مـــن حـــەیرانـــی[7] چاڤێـــت ڕەشـــکه

دل مـــام برینـــدار بـــێ دەرمـــان

---

[1] ئەڤ هەلبەسته ل ڕێککەڤتی (٢٠١٥/٢/٥)ێ، هاتیه ڤەهاندن.
[2] ژ ته.
[3] ل جهەکێ دیتر: دێ ب.
[4] ل جهەکێ دیتر: گەر بمرم قوربانی تەمه.
[5] ل جهەکێ دیتر: خۆ.
[6] ل جهەکێ دیتر: بزڤڕە و دلێ من.
[7] ل جهەکێ دیتر: من حەیرانی.

پشتی تە من ئۆمێد نەمان
ژی بووری ب کەسەر و زیمار[١]
دل بەر کا[٢] ئەو سۆز و پەیمان

نە رۆخینە کەلها ڤینێ
تو یا من ب دلڤە د حەلینێ
رەحمێ ببە ب ڤی دلێ ژار
ب ڤی کاری دێ من مرینێ

دین و هاربیم د عەشقا تەدا
تە دەرد هێلان دلێ کولدا
خۆزی و ئۆمێد ل من بەرزەبون[٣]
بمرم ڤینا تە یا[٤] دلدا

رۆندکێت من شەش رێزی دبارن
ل پێش چاڤ بیرهاتن هزارن
هزرەکێ دبم و دەها دئینم
سۆزدار ئەڤرۆ قەد نەدیارن

چ هات سەرێ من هەوارە
دل شکەستیمە و برینداره
کول و خەما دلێ من خوار
دل کەسەرەم و کۆڤانداره

---

[١] ل جهەکێ دیتر: دلمان.

[٢] ل جهەکێ دیتر: هەوار کا.

[٣] ل جهەکێ دیتر: هندا.

[٤] ل جهەکێ دیتر: دێ مرم و ئەڤینی.

تە ب ئاگری دلێ من سۆت
ئەڤینی ب ئەرزای فرۆت
بۆچی سەرێ ڕۆژێ نەدگۆت
من ب ڤی کاری ژین نە دهاژۆت

من دل داتە ڤین تێدەبی[1]
تە سۆز دامن و تو لێڤەبی
پشتی تە من دل بەرزەبی
تو یا بێ دل و کەزەبی

---

[1] ل جهەکێ دیتر: تێدا.

# بەخت بڕەشم

کەچەکا بەخت بڕەشم یا دژیم ب ژیری و ژاری
ڕازیمە ب قەدەرا خۆ بەس نە ب زۆرداری
ئەز ئێخسیرەکا بێ تالع و نەسیبم
یا کەتیمە ناڤ بەینا نالێ و بزماری

ئاخ بۆ دلێ من ب خودان کری ب نازداری
ئەڤرۆ ئەز ب دلڤە هاڤێتم ناڤ بازاری[1]
ب ڕۆندکا[2] یا دژیم ب کول و خەما و کۆڤانداری
کەسێ من دڤێت من نادەنێ ژین مام تاری

یا دناڤ خینا خۆ د گەڤزم برینداری
ئاخ فەلەك بەس تو بۆ مرنا من هشیاری
کەس و کار نەیارن ناکن[3] هاریکاری
ئەرێ ما من ب تنێ کریە ئەڤینداری

بۆچی هوسا بەخت ب ڕەش بیم مام ل ڤی واری
حەزا دلا نە ب فرۆتنە و کریاری
مریمە یا دخۆم نانێ ساخا ب ئازاری
چو جا[4] ئاسن نائێتە جەماندن ب ساری

---

[1] ل جهەکێ دیتر: دلێ من کوینێ ئێخستن بازاری.

[2] ل جهەکێ دیتر: ئەڤرۆ.

[3] ل جهەکێ دیتر: ئەز یا دبینم خێزان ناکت.

[4] ل جهەکێ دیتر: کێ دیتە.

ئـــەرێ گـــەلـــۆ مانـــە بـــەســـە تـــەنگـــەزاری
هـــەتـا كـــەنگـی دێ هـــۆ مینـم مـــاف لـــێ خــاری
دلـــێ منـــە و ژیـــن یـــا منـــە و بـــێ ئیجـــاری
خێزانـــا مـــن هـــین ژ مـــن ڤـــەبـــن ب ئێـــك جـــاری

دێ هلبژێـــرم هـــەڤژینـــێ خـــۆ ب دلـــداری
ئـــەز دێ دمـــی ڤـــی دلـــێ خـــۆ ب ســـۆزداری
گوهێ خۆ نادەمی كەسێ من سویند یا خواری
ئـــەز شـــوی نـــاكم هـــەكـــەر نـــەكـم ئـــەڤینـــداری

# بەژنا شرین

چـــەنـــد شـــەنـــگ و شـــۆخە بـــەژن و بـــال
دێـــــــم ســـــــۆرگولن گـــــــەردەن زەلال
خودانــــــا چــــــاڤێن ڕەش بـــــەلـــــەك
تـــــورين و ڕەنــــدا ل مــــــن خــــــەيـــــال

ڕوى نــــــازكن بـــــــەفـــــــرۆ گـــــــەڤـــــــى
بـــۆرهى وەك هــــەيڤـــا ئێـــك شـــەڤـــى
چـــــەنـــــد شـــــرينە كـــــەنيـــــا ل دەڤـــــى
دەڤ و لێـــــــــڤ شـــــــانێت هنگڤـــــــى

مـــــن جانـــــەك ديـــــت هـــــات و ژ وێـــــدا
ب بويكـــــــانى خـــــــەمــــــل گرێـــــدا
شـــــەپـــــال بــــێ حووريـــا بــــەحشـــتێ
كـــــەزى شــــوورِ بــــين ســــەر بــــەژنێــــدا

ژ جـــــورێن گـــــولا گـــــول نـــــەســـــرينێ
هـــــێش بوژكـــــۆژێ[1] ل بـــــەر ڤـــــەبينـــــێ
ب جوانيـــــــا خـــــــۆ مـــــــن دحـــــــەلينـــــــێ
هـــــەر وەخـــــت تـــــو ل ڤـــــى دلـــــى شـــــينێ

---

[1] بۆشكۆژ.

# بێ خاتر خواستن[١]

بــێ خــاتر خواســتن بــەرزەبــی[٢] لــەو ب کۆڤــانم
ژ وارێ ئـــەڤینـــێ تـــە بـــارکر دل ب ژانـــم[٣]
زویکا چویێ و چەند بیرهاتن ل گەل خۆ برن
هـــێلام ژڤـــانێ خۆزیـــا و دلگـــرانم

تــە[٤] نــەگۆتــە مــن ب خــاترا تــە دا بــزانم
دلــێ مــن بخــۆ ڤــە گرێــدا ئــاخ پوشــمانم
لــێ ئــەز چــبکم وە دیــارە بــێ خــودانم
لــەورا تــە پیتــە ب مــن نــەکــر هــەی دل زاڵــم

تــە فــەلــەك ل مــن کــر نــەیــار و بــێ ســەمیــانم
مــن دلــێ خــو ب جــەرگڤــە دا تــە ب کــولا درانــم
دەم[٥] درێــژ بــی ب شــەڤــێ ســەری ب ڕۆنــدکا دانــم
ڕۆژ و مــەه چــوون ســال وێ د بــوورن بــێ ئێغبــالم

چیرۆکــا مــن ب داوی نــەهــات هــەر ب خــەیــالم
ئــەو ڕۆژ چــو ل دەڤ تــە شــرین بــیم نوکــە تــالم
تــە ئــەز کــرم گــولا هشــك بــی دەحــلا[٦] د ئــالم
چەند بێهن خۆش بیم ل بەر دلێ تە ئەز نەجوانم

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٨/٣)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: هندا بی.

[٣] ل جهەکێ دیتر: تە بارکر ژ وارێ ئەڤینێ دل ب ژانم.

[٤] ل جهەکێ دیتر: ڤەد تە.

[٥] ل جهەکێ دیتر: ڕۆژ.

[٦] ل جهەکێ دیتر: بی ل دڕیا.

گەر هەر کەسێ وەك تە کربایە ئەڤینی
دا توبەکن ل خۆ حەرام کن ڤینێ زاڵم
دلێ من شکەست ستێرا من ڕشت نە ل عەزمانم
مرنێ دخوازم دا تە نابم بێ ژیانم

# بیرا خۆ بینە

بیرا خۆ بینە وان ڕۆژێن بەرێ
تە چەند حەژ من کر هەی دل کەڤرێ
چویێ و ئەز هێلام دلێ من تە سۆت
ئەز نەشێم بژیم ل من نەزڤڕێ

کا سۆزا تە دایی بیرا خۆ بینە
تیر تە ل دلیدا دەرمان بۆ نینە
ئەز کرم قوربان من دەرد ئەڤینە
هەی گونەهباری من نەمرینە

کێ گۆتە یارێ ل من بێ ئەڤیندار
ژی تە ل من بووراند تە ل من کر ئێڤار
ب کول و کەسەرا ئەز وێ دکم ژیان
نە ب شەڤ و نە ب ڕۆژ من ناهێت هەوار

ڤینا تە یارێ ما د ڤی دلیدا
خۆ ژ من جوداکر هێلام د واریدا
پەریشان بیم ئەز خەما ل من ڕویدا
ب دلڤە هاڤێتم د ناڤ ئاگریدا

دێ ژ خودێ بترسە بریارێ و دانێ
ما چ دلە ل تە هەی بێ وژدانێ
تە ڕەحم نەبر ل من بێ گونەهی
دێ من فرۆشێ هوسا ب ئەرزانی

تــه دلــێ مــن كــر لانــدارا خــەمــا
ب دەستێن خۆ هەژاند تە دگۆت بۆ تەمە
تــو ل مــن غــاین بــی و بــاوەری نــەمــا
بــەســە ژ مــن ڤــەبــە تــە چ مــەرەمــە

دلـــێ مـــن بریـنـــدار نـــەكـــە
نازداریـــا تـــو ل مـــن نـــەكـــە
ژ خـــودێ ب ترســـە و چاڤـــا ڤـــەكـــە
ســـوزداری ل ڤینـــێ گـــەلـــەكـــە

مــن دل نـــەمـــا پێــبكم ئــەڤــین
ب كــول و خـــەمـــا د بـــوورینم ژیــن
كــەتــم حــەیفــا ڤینــا بــەرێ[١]

---

[١] یا دیار دێرەك ژ ڤیرێ كێمە.

## بۆ خاترا تە[1]

ئەگەر نە ژبەر خاترا تەبا هەی جەرگێ من
ڤینا تە ل ڤی دلی نەبا تورینا من
سال ب سال تە ئەز نە دیتم ل ڤی وارێ سار[2]
لێ ئەز چبکم ژ تە غەریبم هەی دلێ من

ئێك ڕوینشتن ل دەڤ تە ڕویینم پێ شادم ئەز[3]
د ژینەك شرین دا خۆ دبینم دەم بووری ب لەز
هەر دوو چاڤێت ڕەش و بەلەك حەلاندم ئەز[4]
بەژن زراڤ قامەت ئەلیف ڕویکا دم گەز

هەر دوو بۆرهی[5] شوبهەتی هەیڤا ئێك شەڤی
سەر وێ ئەنیا سبەحی و جوان[6] بەفر و کەڤی
زولف و خال ل دێمی ئالان کەنی یل دەڤی[7]
تە لێڤ هنگڤینێ شانانن پێت پەیڤی[8]

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٧/٢٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن. ل جهەکێ دیتر: (٢٠٠٦/٨/٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: سال ب سال ئەز تەد هاتم ڤی وارێ خەما.

(٣) ل جهەکێ دیتر: ئەس.

(٤) ل جهەکێ دیتر: ئەس.

(٥) ل جهەکێ دیتر: بری.

(٦) ل جهەکێ دیتر: ل سەر وێ ئەنیا کەڤەرن.

(٧) ل جهەکێ دیتر: زلف و خالا دل کوزراند و کالا.

(٨) ل جهەکێ دیتر: تە لێڤ هنگڤین و قەیماغن سەر ڤی دەڤی.

ئاخ ئەڤینێ چەند شرینی ل دلا تو خوەش
ئێ تە نەڤێت تو د مرینی ژین لێ ما ڕەش
ئۆمێدا مە[1] دێ گەهینێ هەی گولا گەش
ئەگەر ئەڤینی ب تە خۆشە[2] ل من بیست و شەش

ل تە دلدارم هەی جانا من هەر[3] ب وەفایێ
مەجریمم ئەز تو لەیلایێ[4] ل ڤێ دونیایێ
ل گەل من نەبێ جانا من، من[5] سەبر نایێ
ڕوح و جانی تو بیبیکا ڤان چاڤایێ

---

(1) ل جهەکێ دیتر: یا مە دڤێتن.

(2) ل جهەکێ دیتر: ئەگەر ئەڤ دەرد ب تە خۆشبت.

(3) ل جهەکێ دیتر: تێر.

(4) ل جهەکێ دیتر: تو لەیلانی و مەجریم ئەز.

(5) ل جهەکێ دیتر: شەڤ ما تاری و ل من درێژ بی.

## بۆچیه ژین[1]

ئەڤینداریٚ چاڤێن تەمە
تە نەبینم د هزرا دەمە
نە ل گەل من بی نەشێم بژیم
دل هێلا سەر کول و خەما

نیٚ نە هوسانە ئەڤینی
خەما ب کول ڤە ل دلی د چینی
گەر ڤی حالی تو بمینی
باوەرکە دیٚ من مرینی

من دل دا تە ڤین تێدەبی
تە سۆز دا من و تو لێڤەبی
کەلها ئەڤینیٚ تە ل من ڕوخاند
گونەهـ تە کر نەیا منبی

توبەدارم ب سویند و یەقین
گەر تو نەبی نەکم ئەڤین
ژین تە ل من کر زیمار و شین
خۆشی بوورین بۆچیه ژین

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٧/٢٩)یٚ، هاتیە ڤەهاندن.

# دێم سۆرگولێ

دیم سۆرگولێ ل سەر خۆناڤە
دەڤ و لێڤا شەکرا ل ناڤە
جۆت بۆرهی هەیڤا ئێك شەڤی
بەرەڤانی هەردوو چاڤا

گەردەن زەرا خال لێ دیار
کەڤێن بەفرێ ژێ شەرمزار
سینگ و بەر مێرگن شرین وار
کویستانن چیمەن لێ بەهار

گەزی شووڕ بین ب وێ بەژنێدە
ل زەند و بەندا بازن تێدە
بەژنا شێرین من دل کەتێ
هێش زارۆك ل مالا بابێدە

تێربێ ژینا دلی و جانی
تە کەرکر جەرگێ ڕەزڤانی
ئاگری دێ بەردم خۆ و خانی
نە بێ هەڤ ژین و کابانی

# دەلال[١]

دەلالێ[٢] شۆخ و شەپالێ
ڕندێ نازکێ و هەڤالێ
تو دینی چەند یا نازدارێ[٣]
هێژاییێ گەردەن زەلالێ

دەلال[٤] تە دێم بەفر و خوینە
ڕوح سڤکێ و خوین شرینە
بەخت و باوەر چاڤ هەژینە
ڕەوشا مللەتێ بەهدینە

دەلال[٥] گولێ دناڤ دلادا
دیتنا تە ل من مرادە
سرنج کێشێ ل دلی د ئالی
تو دووری د بنێ دەریادا

هویڤیا خورتا بەس تە بینن[٦]
دەمێ کێم ل دەڤ تە ڕوینن[١]

---

(١) ل جهەکێ دیتر: دیمەن.

(٢) ل جهەکێ دیتر: دیمەن.

(٣) ل جهەکێ دیتر: بەژنا تورین چەند نازدارە.

(٤) ل جهەکێ دیتر: دیمەن.

(٥) ل جهەکێ دیتر: دیمەن.

(٦) ل جهەکێ دیتر: هیڤیا من بەس تە ببینم.

بێ حەمدی خۆ تە دحەبینن[2]
جوانیا تە چیا دحەلینن

ئەز دێ هەر ل گەل تە بکم[3] ئەڤین
شرینێ و شەکرێ و هنگڤین
گەزۆ ژ دەڤ و لێڤا د بارین
دەرماندارا دلێ[4] ب برین

بۆرهێن تە هەیڤا[5] ئێک شەڤێ
چەند شرینە کەنیا ل دەڤێ
تە سینگ مێرگ و چیمەن و زەڤێ
سەد خۆزی دگەل من[6] باخڤێ

---

(1) ل جهەکێ دیتر: دەمەك کێم ل دەڤ تە ڕوینم.

(2) ل جهەکێ دیتر: نێ نە ب منە تە د حەبینم.

(3) ل جهەکێ دیتر: خنیا دلێ دگەل بکەی.

(4) ل جهەکێ دیتر: دلێت.

(5) ل جهەکێ دیتر: تە بورە و هەیڤ.

(6) ل جهەکێ دیتر: خۆزیا وی یێ گەل.

# دایکا من

هەرێ دایێ دایکا منێ
ڕۆناهیا چاڤێن منێ
شیرێ سپی من ژ بەدەن خاری
زێرەڤانا ژینا منێ

دایکا منێ ئەز گۆرینێ
هەی مێرگەها دلداریێ
پەیمانگەها زانیاریێ
شەمالا شەڤێن تاریێ

هەرێ دایێ هەی ڕوحا من
هەی خودانا دلێ مەزن
دەست و پیێن تە سەر ڤان چاڤا
هەر بۆ من ساخبی دایکا من

دایێ ل تە ئەز نان بخێمە
گوهداری گۆتنا خودێمە
قەرزاری وێ زەحمەتێمە
چەند حەژ تە بکم هەر یا کێمە

## دەی بابێت من

عەزیزن دەی بابێت من
ئەون خۆشتوڤیێت من
قەرزدارێ هەردوو کامە
وان خۆشکر ژیانا من

پشتی خودای دەی بابن
پێت وان دێ ل سەر ڤان چاڤابن
وان ڤین دێ ل ناڤ دلابن
هەردەم دێ ل مە بەهابن

دایکێ دام بەر سینگێ خۆ
بابۆ کرمە ملێ خۆ
دەی بابا ئەز پاراستم
وان خۆشتر ڤیام ژ خۆ

دای گولە و باب گولاڤە
بەهشت یا دبن پیاڤە
ئەون ڕۆناهیا چاڤا
سپیدا لێ دکم سلاڤا

# دجلە جان[1]

دجلە خانێ چاڤ فنجانێ
شەنگ و شۆخێ پەریخانێ
تە ئالەك سێڤێت لوبنانی
بەژن و بال چیایێ سیپانێ
بۆرهی هەیڤا دوو شەڤانێ
دێم سۆرگولا ل ناڤ باغانێ
تورینێ کەچا مەردانێ
بەخت و باوەر تو یا جانێ

دجلا هێژا هەی گول پەری
بێن خۆشی مسك و عەنبەری
مێکەوا ل زۆزانا د جەری
کەڤوکا ل ناڤ جیا د فری
خنیا وی بێ تو لێ بگەری
نائێن رێزاتە چو زەری
دەڤ و لێڤ شرین شەکرێ
دلێ گەنجا تو ڤەستری

دجلا جان گەردەن زێرینە
هەست نازکە و خوین شرینە
دەرمانا دەردو برینە

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل رێککەفتی (٢٠١٢/٥/١٥)ێ هاتیە ڤەهاندن.

سینگ باغچەیە و فەڕاشینە
دێم و ڕوی بەفرا شەڤینە
گول بوژکۆژێ[1] سەر ڤەبینە
کەس ژ تە عەزیزترین نینە
کەلەش گەورا ل ناڤ بەهدینە

(1) بوشکۆژێ.

## جيرانێ

كەتم تورا جيرانێ
ئێشا دلێ من توت[1] زانێ
ل من جەرك سۆت مێلاك كوزرى
ئاگر و فيغان تە بەردانێ

مالا تە ل جەم مالا مەبى
دل ب ئەڤينێ ل گەل تەبى
تە ڕوى وەك سۆرگولێن ڤەبى
تە خوين شەكر و خورمە بى

چاڤ ڕەش ئەسمەرا شرين
دەرمانكە ڤى دلێ ب برين
نە ل گەل من بێ نەشێم بژيم
گەهشتن بەهشتا بەرين

جيران دەركەتێ ل بەردەرى
ڕاوەستام ل بەر هەمبەرى
سلاڤ مش[2] تە وەرگرت پەرى
جهێ وان سەرچاڤا و سەرسەرى

---

(١) تو د.

(٢) من ژ.

# جیرانێ[١]

کەتم دەردێ تە جیرانێ
ئەگەرا ڤێ دلێ دزانێ
ئەڤیندارێ بەژنا تەمە
ڕوی نازکێ ڕەش ڕەیحانێ

مالا من ب ڕەخ یا تەڤە
دلێ من بۆ تە بەرهەڤە
جیران تو ل من نەکە گەفا
بەختێ تەمە ژ من نەڕەڤە

ئەی جیرانا نازک بەدەن
تە ژ جوانیا خۆ کرم ڕەبەن
ژبیر نەکە جیرانێ تەمە
سەر تە دلێ من ب خەمە

جیران گولە ل حەودا گولا
باغچەڤانێ تە ئەڤ دلە
تە ژین یا ل من کری بەلا
ڕوحێ بخوازێ دبێژم بلا

خەلک دزانن تو یا منی
ڕەوش و خەملا ژینا منی
نوژدارا ئازارێت منی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٨/٣)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## محەیف من گول ما نەجنی

من سلاڤ کر ل من ڤەگێرا
جیران تە دل دا بەر کێرا
هندی ساخم مینم ڤێرا
تو یا منێ و نابێ شکێرا[1]

---

[1] ژ شکێر.

# جيرانێ

کـــەتـــم تـــورا تـــە جيرانـــێ
تـــو ب دەردێ دليـــــت زانـــــێ
ل بـــەرمـــن رە بـــووری و گرێـــژی
مـــپ[1] ئێـــك چـــاڤی ئـــاوی دانـــێ

جيـــران ئـــەڤينـــداری تـــەمـــە
تـــە نـــەبيـــنم مـــن دل نـــەمـــا
کـــرم كۆڤـــان داری خـــەمـــا
چـــاڤ ب رێمـــە و هـــەمـــی دەمـــا

جيـــران تـــە حـــەوشـــی دار زەيتونـــە
ل بـــەرهـــەم بـــەرێ مـــن تـــو ڕوينـــە
دێ بـــــم نێچيرڤـــــانێ چاڤـــــا
ژ ديتنـــا تـــەمـــن تێـــربين نينـــە

جيـــران بـــەســـە مـــن دا هـــەژا
ب ئـــاگرێ خـــۆ دە مـــن نـــەســـۆژە
دل دێ ل ســـەر تـــە لێـــب گرێـــژە
ژ ڤـــێ دويربينـــێ مـــن نـــەكـــوژە

---

[1] من ب..

## جيرانێ

کەتم تورا تە جيرانێ
تو ب دەردێ دلێ من دزانێ
کرم ئێخسیرێ وان چاڤا
خوین شرینێ چاڤ فنجانێ

من حەژ تەکر ژ نیڤا دلی
شەوق و شەمالێ ونێدە هلی
خوینا تە ل ڤی دلی کەلی
دلێ ب کەسەر تو ل سەرکولی

دیتنا تە ل من مرادە
حەژێکرن بێ عنادە
شەڤێ هەمێ ل خەونا منێ
ژ تە تێرنابم خەما ڕادە

جیران راوستە ل بەردەری
پرچ و تەمە ڕێك شەهکری
بیم کۆڤاندار بەرهەم بەری
دل دایە بەربستێن ئاگری

# جیرانێ

کەتم تورا تە جیرانێ
تو ب دەردێ ڤی دلی دزانێ
ئەو ڕۆژا ئەز تە نەبینم
داخوازا مرنێ دکم جانێ

ئەزم عاشقێ وان چاڤا
دلێ من ئاگر وێ ل ل ناڤا
بەژنا شرین چەند زراڤا
تە دل ئێخست تەلها و داڤا

جیران ڕاوەستا ل بەر دەری
زلف و تەمەریک شەهکری
ل من گرنژی گولا سپێدا
بینا بەهشتێ ژێد فری

دیم سۆرگولا گەردەن زەلال
نازك ڕەندا شرین شەپال
قەد نەبین وەك تە كج دەلال
جیران تو دێ خەم و خەیال

## دژمن مەلەك

ئەز کەچەکم یا بەخت ب ڕەش
ئەڤرۆ ژی بووری ل گولا گەش[1]
سڤکا مالێ من خۆ دیت بەس
من ل ڤێ[2] ژینێ نە گۆت ئوخ خوەش

دەم دا مایمە و بێ گڕنژین
ل تەنگا من بوون خودان هەڤژین
هێش ئەز یا مایمە بێ ئەڤین
خۆشی و لەزەت خڕ ژ من ڕەڤین[3]

من دەست ژ جوانیا خۆ بەردا
کولێت مەزن من مان دلدا
فەلەکێ چەرخا خۆ ل مندا
بووم ڕێڤنگا ڕێ لێ هندا

بۆچی فەلەك ل من غائینی
ب چاڤەکێ کێم تو من دبینی
دلێ من یا د هەڕشینی
نەخۆشیا ل من د بارینی

ژ ئەڤرۆ پێڤە بۆچیە[4] شوی
چووم[1] بوومە گرارەك شەڤێ

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ژی ل من بووری بیم شێست و شەش.

(٢) ل جهەکێ دیتر: هێش من.

(٣) ل جهەکێ دیتر: هەمی خۆشی چوون ژ من ڕەڤین.

(٤) ل جهەکێ دیتر: بۆچیە ژ ئەڤرۆ پێڤە.

من هەڤال بوون[٢] خودان نەڤی
فەلەك تیرێ ل دلا د[٣] کەڤی

هێش گولبووم کەسێ نەچنیم
یا بێهن خۆش بووم نەرم و حەلیم
ژ دیرڤە ب ئەڤینێ ئەز د کەنیم
ل من بەلك وەریان چووم جرمسیم

چووم من نەما دلێ بەرێ
ل پیراتێ دکم وەغەرێ
یێ بڤێم نەشێم بێژم[٤] ئەرێ
ب چی دەرمانکم ڤێ کەسەرێ[٥]

خەلك گەهشتن مرادێن[٦] خۆ
ڕازیبوون[٧] ب نەسیبێ خۆ
بەس ئەز یا دادکەم قەهرێت[٨] خۆ
دەم[٩] یا دگریم ژبۆ[١٠] حالێ خۆ

بیرهاتنا دلێ من سۆت
تالعێ منە و نەبوومە[١] جۆت

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ئەز چووم.

(٢) ل جهەکێ دیتر: هەڤالێت من بوون.

(٣) ل جهەکێ دیتر: کا دێ ڤێ نالینێ بکێ.

(٤) ل جهەکێ دیتر: بێژمێ.

(٥) ل جهەکێ دیتر: ڤێ ئەگەرێ.

(٦) ل جهەکێ دیتر: مرادا.

(٧) ل جهەکێ دیتر: ئەو ب کەیف خۆشن.

(٨) ل جهەکێ دیتر: شەڤ و ڕۆژا دکم هزرێت.

(٩) ل جهەکێ دیتر: بەس.

(١٠) ل جهەکێ دیتر: بۆ.

دلێ من شکەست چوو من فرۆت[2]
ب قەهر و کولا من ژین[3] هاژۆت

ئاخینیێك وی تێن و د بۆرن[4]
خوزی و ئۆمێد ل دلی د زۆرن[5]
رۆندکێت گەرم وێ دبارن و سۆرن[6]
گیانەوەر وی بۆ من د لۆرن[7]

تەیر بووم ژ رەخی ب تنێ ڤەمام
من چەنك شکەستن و یا بوویم خدام
یا دادعیرم گۆتنێت بێ تام
هەوار د حالێ خودا حەلیام

چەند یا تەحلە ژینا ب تنێ
یا بەرهەڤم بۆ مرنێ
شخۆیە[8] دبێژم ڤێ گۆتنێ
سەد ئاخ و داخ هەی ل منێ

ستێرا من ژ عەسمانا وەریا
نە مەلەڤان و کەتمە دەریا
بۆ منی ب تنێ سوعید بریا
هێش ساخ هاتمە رێزا مریا

---

(1) ل جهەکێ دیتر: نەبیمە.

(2) ل جهەکێ دیتر: دل مام شکەستی و من نە فرۆت.

(3) ل جهەکێ دیتر: من ژینا خۆ ب قەهرا.

(4) ل جهەکێ دیتر: ئاخینکێت من ئێت د کوورن.

(5) ل جهەکێ دیتر: خوزی و ئۆمێدێت من دویرن.

(6) ل جهەکێ دیتر: رۆندکێت من تێت کەرم و سۆرن.

(7) ل جهەکێ دیتر: گیانەوەر بۆ من وێت لویرن.

(8) ژ خۆیە.

مـــرن يـــا خۆشـــتره بـــۆ مـــن
ئـــەڤـــرۆ بجهـــ نـــەهـــات خۆزيـــا مـــن
ژيـــن يـــا ڕەشـــبووی ل پـــێش چاڤـــێت مـــن
حاســـل نـــەبـــوو مـــرادا مـــن

چ هاتـــە ســـەرێ مـــن هـــەوار
دلـــێ مـــن كولـــە و برينـــدار
ل دلـــێ ڕەبـــەن نـــەهـــات بـــەهـــار
مـــن ژيـــن بووراند[1] ب تـــازی و زيمـــار

---

[1] ل جهەكێ ديتر: ژی ل من بووری.

## چیاییێن مه

چیــــاییێن مـــــه ڕەوشـــــا وان داروبـــــەرن
زۆزانـــن پـــەزێـــن كـــویڤی لێـــت[1] چـــەرن
كـــەو ڕەفـــن ل ســـەر كـیریـا وێـت[2] خـورن
زەریـــــێن مــــــه مـــــازیچنن بــــڕ بــــڕن

واریٚ مـــــه بــــەهشــــتا خـــــەم ڕەڤینـــــه
كویســـتانن مێـــرك و جیمـــەن كـــەڤینـــه
ڕوبیـــــارن ئـــــاڤێن كانیـــــا تـــــەزینـــــه
ل گۆڤـــەنـــدا خـــۆرت و قیـــز و پـــەرینـــه

چیـــاییێن مـــه بخێـــر خـــامتویر و گـــاره
خـــەم لێـــــنن ســـێ وەرزا لـــێ بـــەهـــاره
شـــڤانا بـــەز لـــێ چـــەرانـــد ئێڤـــاره
بێریـــــا بــــەز دوتـــــن مـــــەشــــك ل داره

واریٚ مـــــه بــــاغن ژ گـــــولا ڕەنگیــــــنن
ب نێرگـــــزن لویلـــــه بـــــەر و بـــــەیبیــــنن
بـێن خۆشـــن ئـــەڤینـــدار ل نـــاڤ دەتـــڕوینن
ســـەیـــرانن هاڤینگـــەهـــ دل حـــەلیـــنن

---

[1] لێ د
[2] بێت.

# هیڤیدار

هیڤیدار ڕەوشا بەهارێ
ڕوح سفکێ یا نازدارێ
خوین شرینێ ڕوی ب خویسارێ
دناڤ جانادا هلبژارێ

بێ قوسیرن تە هەر دوو چاڤ
دێم و ڕویا گرتی خۆناڤ
پرچا ڕەش سەر ملا بەلاڤ
چەند شێرینە بەژنا زراڤ

خواندەڤانێ تو زانایێ
کوترکا سپیێ و هێژایێ
گول بوژکۆژا[١] ناڤ باغایێ
تو تانجا سەرێ قیزایێ

نازکێ و شۆخێ و شەپالێ
بەخت و باوەر تو دەلالێ
سپەحیێ گەردەن ب خالێ
بجانیا خۆ ل دلا د ئالێ

هیڤیدارا سۆرسپیا
وەك خینا ل ناڤ بەفرا چیا
تورینا زەریا هەمیا
نێرگزا سەرێ کێریا

---

[١] بوشکۆژ.

هیڤیـــــدارا مـــــن یـــــا ڕنـــــده
هێژایـــــــه و بـــــــەژن بلنـــــــده
ناریـــــا ژیێـــــره ئـــــەلنـــــده
فـــەنـــەره و شـــەمـــالا گونـــده

## هەڤال و دۆست

چەند یا خۆشە هەڤالینی
دگەل ئێکدا بژین ب ئەڤینی
ئێك دلین ب سۆز و پەیمان
تێکەلی ب ڕەوشە ب دۆستینی

هەڤالێ باش ئەو برایە
دڕۆژێن تاریدە چرایە
تەنگاڤیا دە ب وەفایە
خۆشی و نەخۆشیا مەفایە

دۆستینا بێ بەرجەوەندی[١]
بێ تەماعی و سیهرەبەندی
هەڤال هەر دەم[٢] هاریکاربت
سەری ل تە ڕاکت ب[٣] پەیوەندی

دۆستێ دومێ تو بکەرە
ژ برایێ خراب چێترە
تو ل دۆستی قەنج[٤] دیر فەکرە
ژ کەسوکارا دل سۆزترە

---

[١] بەرژەوەندی.

[٢] ل جهەکێ دیتر: هەڤالێ قەنج.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ئەو هاوار بت ب ئێك.

[٤] ل جهەکێ دیتر: باش.

هەڤالێ چاك پشتەڤانە
ئەو رۆناهیا چاڤانە
دیر و نێزیك دلوڤانە
گەر بێ كەس بی ل تە خودانە[1]

دۆستینی گەلەك شرینە
بووراندن دگەلدا خۆش ژینە
تو باوەریا خۆ پێ بینە
چاڤێ تە بڤێت بۆ دەرینە

---

(1) ل جهەكێ دیتر: بەهایە دۆستێ خودان هەست.

# هویڤی [1]

مـــن چـــەنـــد هـــویڤی ژ تـــە کـــرن
تـــــە نـــــازداری ل مـــــن کـــــرن
دلـــێ مـــن ب خـــوە ڤـــە گرێـــدا
تـــە ژێـــویر کـــر حـــەژێ کـــرن

یـــا ژ تـــە ڤـــە ئـــەس نـــەزانـــم
خوانـــــــــــدەوارێ دلانـــــــــم
نـــە بێـــژە مـــن ئـــەس جـــانم
ژ تـــە جـــوانتر هـــەنـــە خـــانم

نازیـــا تـــو ل مـــن نـــەکـــە
بـــەس خـــوە ل مـــن گـــران بکـــە
دەریـــا ئـــــەڤینـــێ کـــــویرە
دێ خـــــەنـــــدقێ وەنـــــەکـــــە

پشـــتی چـــی تـــو ڤـــێ دبێـــژی
نـــێ دێ دلـــێ مـــن ســـۆژی
ڤینـــا خـــوە ژێ د ئـــاڤێژی
زاڵمـــــێ دێ مـــــن کـــــوژی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێکەڤتی (٢٠٠٥/٣/١٣)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# هەیلا بۆیچێ دونیایێ

هەیلا بویجێ دونیایێ
تژی دەرد و بەلایێ
قەد مە خۆشی بتە نەبر
گەمیا کول و خەمایێ

ل دونیایێ ئەم مێڤانین
ل قەدەرا خۆ بژڤانین
ل ژینا شرین شڤانین
ل هێلانێ دل کۆڤانین

دونیایێ بژین سەد سالە
ب زێڕ و زینەت و مالە
گاڤا خاترێ ژێ ب خوازین
پشتی مە وار ما ڤالە

دونیا مرن ئاستەنگە
بێ بەڕەڤانی چەنگە
قورتال نابین ب چو ڕەنگە
کراسەك گورتە و تەنگە

## ئەڤین فرۆت

ئـــەڤــین فـــرۆت بـــۆچی یـــاری
ئـــەڤ دلـــە ســـۆت مانـــە یـــاری
هـــزرا بـــاش ڕۆژا خـــۆ نـــەدکـــر
بـــێ مـــن نـــەشـــێ بکـــێ ژیـــاری

کراســـێ ڤینـــێ تـــە کـــەرکـــر
تـــە دەرپـــێ مـــن ل بـــەر خـــۆ کـــر
فـــەیـــدە ناکـــت مـــن حـــەشـــتەکـــر
ئـــەڤ جانـــە مـــن گـــۆری تـــەکـــر

بریـــار هـــۆ بلـــەز بـــۆچی تـــە دا
تـــە دوو دل هیلانـــە هنـــدا
تـــو بخـــۆ کـــەنـــێ مـــت[1] گرینـــێ
دێ مینـــێ ژار ئـــەڤـــین بـــەردا

ژ خـــودێ بترســـە دەرەوینـــێ
دلـــێ مـــن هنـــدە تێشـــینێ
ئێکـــدی وەك مـــن دێ خـــاپینێ
تـــو ل گـــەل کـــەســـێ نـــا قـــەدینـــێ

---

[1] من د.

# بیم قوربانی ئەڤینێ

خـــــوەزی ژ خێـــــر و مـــــرادێن خـــــودێره
مـــن هنـــده زوی نـــەكربایـــە ئـــەڤینـــێ
دا مـــن دل نـــە مابایـــە ب كـــول و كـــەســـەر
لـــێ مخـــابنی ل مـــن زوی چـــو لاوینـــێ
دل مـام خـەمگـین ل مـن حاسـل نـەبـی مـراد
ئـاخ فـەلـەكـێ تـو ب كـیش چاڤی مـن دبینـێ
هـــەمـــی ئـــەڤینـــدار وەك مـــن دل ب كـــولن
دەردێ ئـــەڤینـــێ ئـــەم ســـۆتین ب نـــەرینـــێ
بـــەهـــارا دلـــێ مـــن هشـــك بـــی و چرمســـاند
قـــەد فـــەیـــده نـــاكن نـــالینی و ئـــاخێنێ
ســەرێ چـەنـد سـالا مـن ئـەڤ دلـە دمرانـد
بـــۆ ئـــەڤینـــەك بـــێ ســـنور ب شـــەرمینـــێ
داویـــێ كچـــەكـــی دلـــێ مـــن حـــەلانـــد
ب ئـاگرەك بـێ د وی سـۆتم ب كـەرب و كـینـێ
دلـێ مـن شـكاند ژ هـەمـی خۆشـیێن دونیـایێ
خـەونـێن مـن مـان خـاڤ بـیم قوربـانێ ژینـێ
بـــیم عـــەڤـــدال كـــرم رێڤنكـــێ ســـەرێ ریـــا
ل گـەل سـیتاڤكا خـۆ د ئـاڤیتم وەك دینـێ
ئەس د گریم رۆندكێن من رێز رێز دهاتن خوار
وەكـــە تـــاڤێن بـــەهـــارا ل بـــەر تـــو روینـــێ

هەر دوو ڕویکێن من شل بین من هاش[١] خۆنە
هـــزر و بـــویرا دویـــر بـــرم دەرەوینـــێ
هـــەوار بـــلا مـــن نـــەکربـــا ئـــەڤینـــی
دلـــــدارین و چ دەردە ئـــــەم کـــــەتینـــێ
ئـــەس ل ڤـــێ ژینـــێ مـــام دامـــای و بـــەلـــەنگـــاز
ل مـــن بـــی مـــراد ئێـــك ڕۆژ ب گڕنژینـــێ

---

(١) هاژ.

## هەی خوین شرینێ

هەی خوین شرینێ
ڕوی بەفر و خوینێ
تە ئەڤ دلە سۆت
ب ئاگرێ ئەڤینێ
ئەز بەختێ تەمە
دێ من مرینێ

دیتنا تە ژینە
پڕ گرنژینە
ل دەڤ من تورینە
دلی بحەوینە
ئەز بەختێ تەمە
من نەمرینە

گاڤا تە دبینم
خەما ڤەدهوینم
ئەز هزرەکێ دبم
دەها ل گەل تینم
ئەز بەختێ تەمە
ل تە ب دل ئەڤینم

دل نازك رەندێ
ل دلی ئەلەندێ

شۆخێ و لەوەندێ

شەمال و فەندی

ئەز بەختێ تەمە

ژ مێژا مەلبەندێ

## هەی زالم

تــــه ئـــەز هـــێلام بـــۆچی زالـــم
ب کـــول و خـــەمـــا دل ب نـــالم
هـــەی بێبـــەختـــۆ کـــا ســـۆزا تـــە
شــــەڤ و ڕۆژێ ڕۆنـــــدکا د مـــــالم

خۆشــیا خــاترا خــو ژ مــن خــوەســتی
کفنــێ مرنــێ تــه ل مــن بــەســتی
تـــه شـــیا ڤینـــێ مـــا نـــەڕســـتی
ل ڤـــێ هێلانـــی دل مـــام شـــکەســتی

تـــو بـــی تـــه دل بخـــو حـــەســاندی
تـــه ئـــەڤینـــی تێـــده چانـــدی
تـــه هیڤـــی ل مـــن کرنـــه خـــەون
بیرهاتنـــــا تـــــه دل مرانــــدی

دارا خۆزیـــا ل مـــــن هـــات بـــرین
بـــێ شـــینوار مـــا ڤینـــا شـــرین
مـــا بـــێ دەرمـــان دلـــی بـــرین
زالـــــم چـــوێ بـــێ زڤـــڕین

# دل چرمسی

کەتم حەیفێ و سەد مخابن
من تو خوەستی نەدانە من
حەژێکرنا بژار و ژیری
ڤین بێ بەها هات فرۆتن

دلێ کۆڤان وێ چرمسی
ژ کول و دەردا و ژ بێ کەسی
فەلەکێ خەنجەر ل من هەسی
خودا تو ب دەردێ من حەسی

کا ئەو دلێ پێ بکم ئەڤین
خر خرابی سۆتن هێلین
برینێت کول مان بێ دەرمان
شتە[1] دویر کرم هەی خەم ڕەڤین

کانێ ئەو سۆرگولا ڤەبی
خەملا باغچێ ڤینێ تو بی
ڤێ ڕویدانێ سەبەب چبی
دل ما شکەستی و تە بەرزەبی

---

(1) ژ تە.

## دلێ ڕێڤنگ

گونەهبار بیم ئەز من سەرا نەدە
ڤینا بلەز و بەز گول ما نەت[1] دلدە
ئەڤ دلێ خەمگین ژێ تێت ئاڤ و خوین
ژین ما بێ ئەڤین ل خۆ دکم تازی و شین

خەلکێ تو خوەستی ل من ئێشان برین
گوستیر کر تلیێ نەخت هات ڤەبرین
باغچە مان بێ گول ل خۆ وەراندن بەلگ
دەرمان نەبین کول ڕێڤنگ هەر بی دل

بەهار بێ باران داروبار مان سل
پەزێ بێ شڤان دێ هەر خوتن گور
ڤینا بێ خودان ژیانا ب زیندان
ل مرنێ د بت مێڤان وار لێ قەبرستان

سەیران خۆشن بیار دین بێ کەس ژار
کرم دین و هار ت بێژم خۆزیا پار
ژین ما بێ شەمال هێلام بێ ئێغبال
شمن[2] ڤەبی دەلال ژ بێ مرادی بیم کال

---

(1) نە د.

(2) ژ من.

# دل مەلیلم

هندی تو سلبی دل ملیلم
ئەز دل ناهێلم تە بهێلم
من ژینا ل گەل تە ئەڤین ڤێرە
توچەند دل مای بێ خەما دکێلم

ڤینا تە کەلها من دیلداری
دەری ل من ڤەکە دا بێم واری
دویرکەتن دەردە یا ل من باری
بەس من بێشینە ب ئەڤی کاری

تە دل هێلا چەند گول ما تێدە
بێ دادگەهە خستم زیندا نێدە
کول و گازندا ل کێ بکم یارێ
کراس تە کەرکر من ل بەژنێدە

هەر ب ژوڤانم چاڤ ب ڕێمە
ب دلی کۆڤانم کا بۆ کێمە
ل ئەڤینێ ژارم نان بێ خوێمە
ل مرنێ مێڤان بم هێژ یا کێمە

# هەلز[1]

هــەلــز جــان دیتنــا تــە ل مــن مــرادە
چــاڤ ڕەش بــەژنــا تــە مــن دل بــێ شــادە
تــە ڕوی ســۆرگولن یــا ل نــاڤ باغچــادە
شــەپــالێ پرچــا تــە ســەر مــلادە
تــو گــول بوژکــۆژی[2] یــا د نــاڤ گــولادە
هــەی خــوین شــرینێ و هنگڤینــێ د ناڤــدە
هــەســتی ســڤکێ خــەمــلا ببکــادە
تــو ســرنج کێشــێ دەردێ دلادە
تــە چــاڤ مــام بــزن ژیانــا دناڤــدە
بــۆرهی قــەیتــانن هنــداڤ چاڤــادە
تــە لێــڤ شــەکــرن د گرنژینــادە
گــەردەن زەلالــێ زێــرێ د گوهــادە

هــەلــز نێرگــزێ خــەمــلا بــەهــارێ
هــەی شــەنــگ و شــۆخێ چــەنــدیا نــازدارێ
تــوڕینێ چــاڤێ ژ قیــزا دیــارێ
خوانــدەڤــایێ ل زانینــێ دلــدارێ
هــەردەم وەفایــا ئــەڤینــدارێ
تــو نومونــە یــا هــەمــی قیزایــێ

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٩/١٥)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[2] بوشکۆژی.

هەلز شرینا دەیك و بابایێ
خۆشتوڤیا دۆست و هەڤالایێ
تو ب جانیا خۆڤە د ناڤ دلا دایێ
ژ مەعدەنا زێڕێ تو یا بەهایێ
بەژن زراڤێ بخورتا مەلایێ
تو بەخت و باوەر گەلەك هێژایێ



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكۆلینێن كوردی

# حەیفا بێ باوەرێ

مخابنی تە دل کر ژار هەی بێ سۆزێ ل حەیفێ دمینم
ئێدی نەشێم دلێ برین کول و دەردا ژێ دەرینم(١)
باوەرنەکە تە ژبویر بکم هەی بێبەختێ تە چلمنکر(٢)
شەڤ و ڕۆژا د هزرا دەمە بۆ بویرهاتنا بگری د ڕوینم(٣)

پا کانێ ئەو سۆز و پەیمان ژ تە پشتڕاستبیم بێ باوەرێ
خودا حەسکت نێزیکە کو ئەو ڕۆژ بێتن تو ل من بگەرێ(٤)
تە حەلاندم فەیدە ناکت چوو تە شویکر ناڤەگەرێ(٥)
ل بازارەك تاڕی فرۆتم ب ئەرزانی ژ دلی دەرێ(٦)

دێ بخەملینە داریەستا من ژ وێنە و ناما ل مرنێ شاندم
تە خاپاندم تە توڕیا من بدەستا کولا و لێ ڤەشارتم
سەد ئاخ و داخ نە ب سەر ڤەبیم تو ڤێ ل مە دکێ بۆچی زاڵم(٧)
گونەها من ب دلێ شکەستی ل ستوی تەبت ل خۆ حەساندم(٨)

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ئەز نەشێم ڤان کول و دەردا بکەوینم.

(٢) ل جهەکێ دیتر: تە ژبویر ناکم پێش چاڤا.

(٣) ل جهەکێ دیتر: شەڤ و ڕۆژا بویرهاتنا بگر دبینم.

(٤) ل جهەکێ دیتر: نێزیکە کو بینن ئەو ڕۆژ شاخ ل سەری.

(٥) ل جهەکێ دیتر: فەیدە ناکت ب دلێ شکەستی ل من ڤەگەڕی.

(٦) ل جهەکێ دیتر: تە ب ئەرزانی ئەز فرۆتم ڤین چوو زەری.

(٧) ل جهەکێ دیتر: هاوار خودا نە ب سەرڤەبیم تو ڤێ ل من بکێ بۆچی زاڵم.

(٨) ل جهەکێ دیتر: تو ناترسێ ژ خودا بێ خۆ دلێ من شکاند ل خۆ ئالاندم، گونەها من ب دلێ شکەستی ستوی تەبت ل خۆ ئالاندم.

دابێژی من سەرێ ڕۆژێ من نەدکر ڤین ب ڤی کاری
بەری تو ڤی دلی بسۆژی تە ژینا من هێلا تاڕی
تە پیرۆز بت ئەو شویە خێرێ نەبینێ ل بەر داری
ب کەسەر و کۆڤانا شاد بێ گری و ڕۆهندکڤە بچێ واری

# پەشێمانم[1]

بریار من دا و پەشێمانم دل ب ژانم
هەوار خودا وە دیارە ئەز نەزانم
چ دەرگەهێ من قوتای ل من هات گرتن
ئێخسیرم ئەز بی تالعم دەرد گرانم

نیشکەکێڤە ئەز کەتم داڤێن ئەڤینێ
ژی ل من بووری شنوی بخوە حەسیام ل من گوینێ
لێ ئەز چبکم بەخت ب ڕەشبیم ل ڤێ ژینێ
کەسێ من دڤیا ئەز هێلام کەرب و کینێ

نازک گول بیم بێ خودان مام ل من بەلک وەریان
بخەم و کول بیم من نەمان تاقەت و شیان
خۆشیا خاترا خوە ژ من خواستن دل مام برین
چو نوژدارا و چو لوقمانا نەبین دەرمان

من خۆ هێلا ل هویڤیا مرنێ ل من ڕەشبی وار
شەڤ و ڕۆژا کار بیم گری ب تازی و زێمار
گەر خۆ بکوژم لوما نەکن حەقم هاوار
یا من دیتی کەس نەبینت من دل مازار

پەشێمانم پەریشانم د بریارێدا
ل من زڤڕی چەرخا دنێ و کەتم تێدا
دەریایەک کویر دا خەندقیم د کەسەرێدا
زاڵم فەلەک بێ مرادبیم د ڤێ دنێدا

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٧/٣٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## پوسیدارم[1] ب پەشێمانی

هال من کات هات ب پەشێمانی پوسیدار بیم
دل بێ ڕەحمێ تە ل من سۆت شنوی هشیار بیم
ئەڤینا تە ما دلیدە و دەرناکەڤت[2]
چەند ئەز بێژم ب کول و خەم کۆڤان داربیم

هەی زالمێ تە ل من دل سۆت ب ئاگری
ئێش و ئازار ل من بین هەڤال کاربیم گری
نە ب هێزلی و نە ب خابیری[3] نە ڤەمری
فەیدە ناکت پەشێمانی ل من دل مری

ل من بین خەون ئەو خۆشیێن چەندین سالا
ل من بووری ژی کرم ئێخسیرم وەك عەڤدالا
ژارۆ ئەزۆ دێ ڕۆندەکا[4] تو ڤەمالا
ژ هەر دوو چاڤا ژ خەیالا دل نەمام ڤالا

گەر من زانیبا ئەڤینی ب ڤی ڕەنگیە
دا توبەکەم من نەدکر ئەڤین[5] دل حەلیە
ئێخستم دەریایەك بێ بن نە مەلەڤانم

---

[1] ل جهەکێ دیتر: پوسیداربیم.

[2] ل جهەکێ دیتر: ڤینا تە ما د ڤی دلیدا و دەرناکەڤت.

[3] ل جهەکێ دیتر: خابووری.

[4] ل جهەکێ دیتر: ڕۆهندکا.

[5] ل جهەکێ دیتر: ڤین.

ئـەز[١] خـەنـدقيم چـووم بـيم قوربـانى ژبـۆ ماسـيە

هـەى هـەوارە و سـەد هـەوارە ب دليڤـە[٢] كوشـتم

دەردێ ئـــەڤينـــێ حـــەلانـــدم ئـــەز[٣]برشـــتم

ژێ قورتـال نـابم ب چـو ڕەنگـا و تـە ئێخسـتم

بـەس مـن[٤] يـا مـاى دێ بێـژم ئـاخ نـەگـەشـتم

مــن ب ڤــان دەســتا ئــاگر بــەردا ڤــى دلــێ ژار

هشيار بن[٥] كـەس نـەكـت ئـەڤينـێ[٦] بـێ پرسـيار

يــان دێ وەك مــن پــەشــێمان بــن دێ بــن هــەژار

يــا مــن ديتــى كــەس نــەبينــت بــبن گوهــدار

---

[١] ل جهەكێ ديتر: ئەس.

[٢] ل جهەكێ ديتر: ب دلڤە.

[٣] ل جهەكێ ديتر: ئەس.

[٤] ل جهەكێ ديتر: من بەس.

[٥] ل جهەكێ ديتر: هويڤيدارم.

[٦] ل جهەكێ ديتر: ڤينێ.

# شیلانا ژار

ئەزم شیلانا دل ب ژان ژینا شرین ل من بی زیندان
ب کول و کەسەر دل ب کۆڤانی بەخت ب ڕەش بیم مام بێ خودان
بێ کەس و کار دەربێ مریمە دخوم نانێ ساخان
ل بەر دلێ من تەحل بی ژیان دلێ من بی دەریا خەمان

شیلان دل کولە و بریندار من ساخ ناکن قەد چو نوژدار
ل چو وارا من ناهێت هەدار ئەز بیمە ڕێڤنگا بێ وار
دەرد بین کۆڤان دلێ من خوار لەو ناڤ بیم شیلانا هەژار
ب تنێمە و یا گرانم بار چاڤ بگری ژین ب زێمار

کا ئەو کەسێ لێ مەیز بکم دەردێ دلێ خۆ بۆ ڤەکم
ئاخینکا بۆ ئامادەکم چیرۆکێ بۆ بەنکی ڤەکم
دلێ خۆ بۆ بێ پەردەکم ژ خۆشیا دویرم ئەز نە لنکم
گلە و گازندا بۆ بکم هەوار خودا ئەز چ بکم

فەلەکێ ئەز نەحەواندم ل چەرخێ بادام و زڤڕاندم
ل گەلیێ خەمادە نڤاندم ئێش و ژانا ئەز حەلاندم
ل غەریبیێ ئەز چەسپاندم ل دەریایەك کویر خەندقاندم
دزڤڕۆکا خۆ دە ئەز چاندم فەلەکێ ب دلڤە مراندم

من نە ب تنێ کریە ئەڤین فەلەك ناهێلت بکم ژین
چاڤ مام بگری دل ب خەمگین شوینا ڕۆندکا ژ چاڤا تێن خوین
دارا ژینێ ل من هات برین چوو مر شیلانا چاڤ نەسرین
نە من ما بێن و من نەما شوین نەشێم بژیم دل بێ ئەڤین

ئاخ فەلەکێ ڤێ ل من نەکە    زەند و بەندا ل من هل نەکە

من ل ژینێ بێ مراد نەکە    هەڤرکیێ ل گەل من نەکە

من دڤێت بژیم وەك گەلەکا    هەڕە بەلا خۆ ژ من ڤەکە

ئازارا تو ل من خڕ نەکە    کفنێ مرنێ د من وەرنەکە

# جیرانا مه

چەند هێژایە جیرانا مە
فند و شەمالا تاخا مە
بەژن زراڤا سۆرگولی
یا ب دێم موریە ڕندا مە

ب جانیا خۆ خۆشی دامە
نازك بەدەنە گولا مە
شەوقا خو دارێشت مالا مە
شرینێ بخوینە ناما مە

هەی بیناهیا چاڤێت مە
ئەز داخبارێ دیتنا تەمە
شتلا ڕوحانا ل ناڤ مەما
دەڤ و لێڤین شەکر لەمە

شەڤ و ڕۆژا د هەزرا دەمە
دەڤ بکەنی ب کەیف و سەما
گولبەڕۆژا ژ مەهەرا چەما
مە ئاقل چوو و سەودا نەما

هەی نوژدارا کول و خەما
خۆ دیارکە هەمی دەما
داخبارێ جیرانا خوەمە
کەس نەبێژت ئەز تازەمە

ژ غەیری یا بۆرهی قەلەما

ل دەڤ تە ڕینم ئامادەمە

ڕۆژا نەبینم بەرزەمە

زێڕینە دگەل تە ئەو دەمە

## غاینێ زاڵم[١]

کەس نینە وەك من ب ئەگەر
دلدارەکم ب کول و کەسەر
من خۆشی بژینێ نەدیتن
ل خەما ئەز بیم پالە و ڕێنجبەر

سەد حەیف من حەژ تە کری
تە ب دلڤە سۆتم ب ئاگری
تو کچەکە بێ باوەری
چەند زاڵمێ و تو دل بەری

خوەزیا تە دل نە کەڤر با
ئەڤینی ل گەل من نەکربا
ب غائنی من تو نە دیتبای
دا من هۆ زوی دل تەمربا

هوسا چاوە ژ خودی د وێرێ
خەلەتیا ل من ڤەدشێرێ
قەی تو ل پاش ڕۆژێ نانێرێ
دێ چاوا ژیم تو نە ل ڤێرێ

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی (٢٠٠٤/٤/٢٢)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# شیرەتێن دەی بابا

شیرەتێن دەیك و بابا
گوهـ بدەنێ نە خرابا
حەش مە دكن ژ خۆ پتر
دەی دلە و جەگەر بابا

عەزیزن دەی بابێت من
تورەبكم مخابن
دەیكێ شێرێ سپی دا من
بابۆ خۆشكر ژینا من

ل دەی بابا ڕێزێ بگرن
شیرەتێن وان هلگرن
زارۆك بین مەزن كرن
قەدرێ وان زێدە بگرن

# ژ کیڤە بینم

ژ کیڤــە بیــنم دلــێ بــەرێ مــن نــەمایــە
ژ نویکـا پێڤــە حــەژ تــە بکـم بــێ مــەفایـە
هــەی بــێ ڕەحمــێ[١] تــە هـزرا ڤــێ ڕۆژێ نــەدکـر
تــە دوو دل ســۆتن ب دەردێ خــۆ نــە هوســایە[٢]

غــاین بێبــەخــت دا بێــژێ مــن ســـەرێ ڕۆژێ
مــن تــو نــەڤــێ[٣] بــەری تــو ڤــی دلــی بسـۆزێ
چ دلــە ل تــە فــەلــەك نــەیــار[٤]چــەنــدیێ ســۆزێ
کــرم قوربــانێ ئــەڤینــێ و ڤــین ئــالۆزێ[٥]

مــن دل داتــە مــام ل هویڤیـا تــە ڤــین تێـدەبــی[٦]
تە سۆز دا مـن ب عـەشق و ئـەڤین و تولیڤـە بـی[٧]
بــێ مــرادی بــی بــەهــرا مــن هــێلام بــێ ژیــن[٨]
ئــەگــەر مــرم ســویندێ دخــوم[٩] تــو ســەبــەبــی

---

[١] ل جهەکێ دیتر: هەی دل هشکێ.

[٢] ل جهەکێ دیتر: تە ب دەردێ خۆ دلێ من سۆت نە هوسایە.

[٣] ل جهەکێ دیتر: دێ تە هێلم.

[٤] ل جهەکێ دیتر: چ دلە ل تە ژ ڤینێ ڤالە.

[٥] ل جهەکێ دیتر: کرم قوربانێ ئەڤینێ و من د فرۆشێ.

[٦] ل جهەکێ دیتر: مام ل هیڤیا تە و من دل دا تە ڤین تێدەبی.

[٧] ل جهەکێ دیتر: ب عەشق ئەڤین تە سۆز دا من و تو لێڤە بی.

[٨] ل جهەکێ دیتر: من هێلام ب تنێ.

[٩] ل جهەکێ دیتر: باوەربکە ئەگەر بمرم.

مــن نــەدزانــی[١] تــو دوو دلــی و دوو ئــەزمــانی
فــەیــدە ناکــت ل مــن بزڤــڕی ب پــەشــیمانی
تـــە دل بـــارکر ژ کـــول و خـــەمـــا[٢]
هــەی زاڵمــێ مــن بــا دلــێ تــە نــەدزانــی[٣]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: هەی بێ هەستی.

[٢] ل جهەکێ دیتر: تە دلێ من ژ خەما بارکر تو ب تاوانی.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ژی ل من بووری من دلێ تە نەد زانی.

ئێدی من دل هشیار نا بت
باوەر نەكە ڤین هندا بت

پسمام ئێڤارە و دەرەنگە
گازیەك كەرە و یا بێ دەنگە[1]
جارێ پرسا دلێ خۆ بكە[2]
ئەرێ ئەڤینی ب چی ڕەنگە[3]

ئەز[4] قرقچیم د حالێ خۆ دا
من چەند گۆتە و تە گوهـ نەدا
تە دودماما خۆ ب هەروەدا[5]
د ناڤ كول و خەما تە ڤەدا[6]

چو چاخا[7] من نائینت تە بات[8]
دوماهیا من و تە هات
ژێكڤەكرن ل من كر خەلات[9]
چووم بیم ئێخسیر[10] بێ دەستهەلات

---

(١) ل جهەكێ دیتر: فەرمانەك بێ گازی و دەنگە.

(٢) ل جهەكێ دیتر: پسمام پرسا دلێ خوەبكە.

(٣) ل جهەكێ دیتر: كچا ئەڤینێ چ ڕەنگە.

(٤) ل جهەكێ دیتر: ئەس.

(٥) ل جهەكێ دیتر: دوتماماخۆ تە ب هەر وەدا.

(٦) ل جهەكێ دیتر: د ناڤ دەست و پیا تە ڤەدا.

(٧) ل جهەكێ دیتر: چ وارا.

(٨) ل جهەكێ دیتر: من هێز نەما بكم خەبات.

(٩) ل جهەكێ دیتر: مرن تە بۆ من كر خەلات.

(١٠) ل جهەكێ دیتر: ئەس حورمەتم، هەر وەسا ل جهەكێ دیتر: چبكم ژنم.

مــــافێ[1] مـــن ژ تـــه دێ ئینـــت ســـتاندن[2]
تـــه خـــهونێـــت مـــن خـــرِ مرانـــدن
ل تـــه زۆزان بـــیم هـــات[3] چـــهرانـــدن
قـــهدەر بـــی و هـــات نڤێســـاندن

---

[1] ل جهەکێ دیتر: حەقێ.

[2] ل جهەکێ دیتر: ستاندن.

[3] ل جهەکێ دیتر: ل چو دلدی ڤین نائێت.

## دلێ شکەستی

لاوێ مـــن خواســـتم چـــەنـــد جـــارە
مـــــن نـــــادنێ هـــــەی هـــــەوارە
ئـــەو نـــەبـــت مـــن کـــەس دی نـــەڤێـــت
مـــــن بـــــێخن نـــــاڤ چـــــار دیـــــوارە

دلـــــێ شـــــکەســـــتی بریـنـــــدارە
بـــەس یـــێ مـــت[1] ڤێـــتن نـــوژدارە

لۆمـــا نـــەکـــن بـــاب و دایـــێ
وی حـــەژ مـــن کـــر مـــن دل دایـــێ
ڕەوشـــا ژیـــن بـــی ل دونیـــایێ
وە دلســـۆت ئـــاگر بـــەردایـــێ

دل مـــا شـــکەســـتی بریـنـــدارە
بـــەس یـــێ مـــت[2] ڤێـــت نـــوژدارە

دێ بـــم ڕێڤنگـــا ئـــەڤینـــێ
ســـۆزی بـــەرنـــادم وەك زینـــێ
مـــەهـــرا مێـــرا ل مـــن حـــەرام بـــن
پشـــتی لاوێ نـــەکـــم ڤینـــێ

دل مـــا شـــکەســـتی بریـنـــدارە
بـــەس یـــێ مـــت[1] ڤێـــت نـــوژدارە

---

(١) من د.

(٢) من د.

نــێ نـــه گونـــەهبـــی مـــن ڤیـــا
بـــێ تـــاوان بـــیم مـــراد بریـــا
فـــەلـــەك زاڵـــم بـــی ل مـــن گـــەریـــا
كـــەتـــم چـــەرخـــێ ل رێـــزا مریـــا
دل مـــا شـــكەســـتی برینـــداره
بـــەس یـــێ مـــت[٢] ڤێـــت نـــوژداره

دونیـــا تـــو بـــێ مـــەفـــایێ
دوم كـــورتن و نـــەهێژایـــێ
بـــێ شـــك گـــەلـــەك شـــرینێ
بـــەس بـــۆ كـــەســـێ نـــەمـــایێ
دل مـــا شـــكەســـتی برینـــداره
بـــەس یـــێ مـــت[٣] ڤێـــت نـــوژداره

دونیـــا تـــه وار زینـــدانـــه
زیـــان تێـــده ب كۆڤـــانـــه
ب تـــەحلـــی و زەحمـــەت كێشـــانه
هـــەر تـــالیێ هێلانـــه
دل مـــا شـــكەســـتی برینـــداره
بـــەس یـــێ مـــت[٤] ڤێـــت نـــوژداره

---

[١] من د.
[٢] من د.
[٣] من د.
[٤] من د.

# دلێ شكەستی

ژ كویڤە بینم دلێ بەری من نەمایە
ژ نویكا پێڤە حەز ژ تە بكم بێ مەفایە
دل كر بازار بیم بكرێ كول و دەردا
ژیێ بێ زیمار ل من ڕەش بی وار نێ ڤالایە

كۆڤانا دا سەر كەسەرا چبكم خوەدا
خەم و خەیال وێل من كۆم بین ب هژمارەدا
مرادا من تو بی دل بەر ت وەختێ خوەدا
گول چرمسی بەلگ لێ وەریان پژكوژ نەدا

ئەگەر ئیغبال نە ژ من سلبا ب فرۆتنبا
دا كرم بۆ دلێ شكەستی بەهار و حبا
نە بام ڕێڤنگ تالع هندا ل ڤینێ خەریب
ل دوو دلا تو ڤەت وەشینێ فەلەك دەربا

دل و جەگەر بریندارن ل بیرهاتنا
چەند ژ من دویر بێ وی ل مت[١] ئارهن دەرمان تو نە
ئۆمێدارى ل خۆشتوڤیا گەهشتنە
ماسی بێ ئاڤ ژینێ ناكن ئەز و تو نە

---

[١] من د.

## هێلان

مــن كــول و خــەمــێن تــە د نیڤــا دلــێ خــودا چانــدن
تــە پــەنجــێن ڤینــا خــۆ ل ڕهــێن دلــێ مــن ئالانــدن
خــەلــك و عالــەم جــارەكــێ دمــرن بگــور تــێن ڤــەشــارتن
تــو یــا هــەرۆ مــن دكــوژێ ئــەز پــی نــائێم حــەســاندن

ئــەرێ یــارێ بێــژە هــەتــا كــەنگــی دێ هوســا بــی
تــە دل یــێ ژ مــن ســتاندی وا دیــارە دڤێــت جــودا بــی
بــەلا خــۆ ژ مــن ڤــەكــە مــام بــێ تاقــەت ڕیــێ هنــدا بــی
بــەر ب ســەنگــە ل وارێ خــۆ گــەر هــەژایــێ بــەهــا بــی

دلــێ مــن د خــەو بــی تــە هشــیاركر هــەی ڤــین ئــاگری
ب مــن تــو فێــر بــی گۆڤــەنــدێ دەســتێ مــن تــو نــاگری
دل تــە هێلایــێ بــەهــار چــوو دلــدی نــەشــێ بگــرێ
ل مــن ســۆت بــی ڕەژوی ڤینــا تــە ژی نائێــت دەرێ

مــا دێ ب چــەند كێــر مــن ســەرژێكــێ تــە ب دلڤــە حــەلانــدم
گێڕانــدم چــەنــد مزگــەڤــت و دێــرا تــە تــەز لــێ شــاندم
ل مــن ســڤك نــەبــی بــارێ گــران ب تونــدی ئێشــاندم
نــە مــن ب تنــێ كربــی ئــەڤینــی تــە دل شــكاندم

# هێلان[1]

یارێ تە ئەز هێلام بێ ژین
ب كول و كەسەر و دل خەمگین
خۆشیا خاترا خۆ ژ من خوەستی
چاڤ مام بگری و چوون گڕنژین

ئەز تێم وارێ خر و خالی
بویرهاتنا من دل ئالی
كەس نەبی ل گەل بكم هەڤالی
چو سۆزدارا دل لێ د ئالی

تە سۆز دابی من ل گەل ئەڤینێ
نێ تو هەر یا دوهی بی پار
ئیرۆ تە دڤێت من ب مرینێ

ئەڤینداری نە هوسانە
ل من زێدە نەكێ ڤان ئێش و ژانە
دل ساخ نابت ب چو دەرمانە
چەند هێلان دەردەك گرانە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (٢٠٠٤/٤/١٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## تورينا من[1]

هات ئەو تورينا من دڤێتن
ژينا من ژ وان چاڤا دزێتن
بگەهين ئێك ب ئەڤينى
هويڤيدارم ئەو ڕۆژ بێتن

غەريبێ هەر دوو چاڤا مە
كەتيێ تەلە و داڤامە
تينيێ ڕيك و لێڤامە
داخبارێ سينگ و سێڤامە

كەتم بەختێ تە و خودێدا
پەيمانێ ل گەل من گرێدا
ژبەر تە ڕوحا ل سەر ڤى جانى
دلێ من ئاگر خست تێدا

دێ سۆزى دم تە ب پەقينى
تو نەبێ نەكم ئەڤينى
تە دبينم تو من د حەلينى
ما تە دڤێت تو من بمرينى

---

[1] ل جهەكێ ديتر: ئەڤ هەلبەسە ل ڕێككەڤتى (٢٠٠٦/١١/١٠)ێ، هاتيە ڤەهاندن.

# کا گول خودا[1]

خۆزیا من بجهـ نەهات خودا
ژ دلدارا ئەز هێلام جودا
تە ژیان ل من کر زیندان
د هزرا دە ئەز مامە سەودا

کەلها ئەڤینێ ل من ڕوخاندن
گولا من چاندی ل من وەریاند
ڕها دلێ من تە قوساند
دلێ ب ئەڤین نە ل من مراند

خودا تویێ بڕەحمی و مەزنی
ئاگەهدارێ دلێ منی
باغچەڤانێ وێ گولی بیم
هێش بوژکۆژ[2] بی و تە ل من چنی

نەشێم بژیم نە ل گەل من بت
هندی هەبم و ئەو ژی هەبت
یا تو دبێژی هەر دێ ئەو بت
دێ من چاڤ ل ڕەحما تە بت

---

[1] ل جهەکێ دیتر: ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٧/١٤)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[2] بوشکۆژ.

## خەریب

لۆما نەكن هوين
ڕاوەستا ل من خوين
دوير بێ دل خەريب
نەشێم بكم ژين

خەم بين بەهرا من
برينا دان بن
ڕۆژ وێت[1] بوورن دچن
خر بينە خەون

گرم كالەك پير
هوسا بيم ئێخسير
گوپال دا دەستی
قەد تو ناچی ژێر

من چاف بين تاری
مەيلا ل من ژاری
چەند بێن كم واری
تو لێ نە دياری

---

(١) يێت.

# کا باوەری

تە ئەز کوژتم[١] نەڤەشارتی
ئەڤە ئەو بی یا تە خواستی
خڕ ئۆمێدێت من مراندن
ئەڤینی نینە ل ڤی ئاستی

دلێ د خەو تەکر ئەڤیندار
زڤستان تە ل من کر بهار
بۆچی ئەڤرۆ ل من بی نەیار
هەڕۆ دبێژم خۆزێت پار

ناڤبەینا مە تە کر دلمان
زاڵمێ کا سۆز و پەیمان
دێ چ بێژی خودایێ خۆ
دلی من هێلا بێ دەرمان

کۆڤانداری دەردێ خوەمە
بیم شڤانێ کول و خەما
دلێ من شکاند ڤین تێدە ما
ئێدی باوەری ب تە نەما

---

[١] کۆشتم.

## خۆزیا دوهی

ژین ل من کر تازی و بەهی
دل بێ وار ما و بێ ئاڤەهی
ل چاڤا ڕۆهندك تژی گری
ئیرۆ دبێژم خۆزیا دوهی

نێ دلێ من نە پیلایە
ژ کول و خەما نە ڤالایە
من ل ڤێ ژینێ ڕوح بەلایە
تە ڕەحم ل دلی نە مایە

بیم ڕێڤنگ ل ژینێ ب تنێ
تەز[1] هێلام ل هویڤیا مرنێ
کرم گولا بەلگ وەراندی
نەشێم بژیم نە ل گەل منێ

ژ من دویرکەتی ل من هندابی
ئەڤینا ب ڕەوش بێ بەهابی
ل ژینێ فەنەر و چرابی
بەخت ما هندا و نە خوەیا بی

---

[1] تە ئەز.

# کانێ ئەو ڕۆژ[١]

کـــانێ ئـــەو ڕۆژا ئـــەز و تـــو بگـــەهینـــە ئیـــك
ب دلـــەك خۆشـــی ببـم زاڤـا و بـۆ مـــن بـێ بیـــك[٢]
مـــرادا مـــە یـــا چـــەنـــد ســـالا دا حاســـل بـــت
دا ئاڤـــاکین خێزانـــەکـــا یـــا ب ڕێکوپێـــك[٣]

گوپیتکـــا کـــەلهـــا ئـــەڤینـــێ هـــەی شـــرینێ
تـــو ڤینـــا خـــۆ د نیڤـــا دلـــێ منـــدا د چینـــێ
هـــەر تـــوێ خۆشـــتڤیا مـــن و دێ هـــەر[٤] مینـــی
تـــو ئـــەگـــەرا ڤـــی دلـــێ ژار و برینـــێ[٥]

ئـــەز غـــەریبـــێ وان چاڤـــانم بوژکـــورینێ[٦]
داخبـــارێ وان پـــەیڤـــانم بـــۆ مـــن دخـــوینێ
مـــن هـــاش[٧] خـــۆ نامینـــت جـــانێ ڤـــە دلـــورینێ[٨]
ب پـــەیڤێـــت نـــازك و شـــرین مـــن دحـــەلینـــێ

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١/٨/٢٠٠٦)ێ ل جهەکێ دیتر (١١/٨/٢٠٠٨)ێ هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: تو ببی بیك.

[٣] ل جهەکێ دیتر: دا ئاڤاکین ئێك خێزانێ و هەر دوو ببین ئێك.

[٤] ل جهەکێ دیتر: هەر دێ.

[٥] ل جهەکێ دیتر: تو ژ دیرڤە ئەگەرا دلێ من دخوینێ.

[٦] ل جهەکێ دیتر: ل دلی خوینێ.

[٧] هاژ.

[٨] ل جهەکێ دیتر: جانێ ل دەڤ من ڕوینێ.

هەر ژ مێژدا ل تە عاشقم ڤین و ژینێ
ئەزم بۆ تە مەمێ ئالا و بۆ من زینێ
بگەهشتنێ کول و خەما ژ من د ڕەڤینی
چوجارا ل من تەحل نابێ تو هنگڤینێ

گاڤا پەیوەندێ تو دکێ ب دەنگێ زەلال
من د بێ غێر دونیا تو ڕینێ ڕۆژ دیت سال
مەست و سەر خۆشبن دیمە ب ئاڤێ دمینم بێ حال
خودا دزانت چەند حەژ تە دکم شۆخا شەپال

باوەر نەکە کەسەك بشێت مە ژێك ڤەکن
ئەم گوهـ نادەین چو گۆت گۆتا دێ وەك خۆ کن
مە سۆز و پەیمان وێ داین دێ مکمکن
دا ئەم بشێن پێکڤە بژین خۆ شاش نەکن

# کوترا چەنگ شکەستیمە[1]

ئـــەز کـــوترەکـــا چـــەنـــگ شـــکەســـتیمە
دل برینـــــــــدارم و بـــــــابێ خۆشـــــــیە
یـــا تێـــر ئـــازارم و ســـەر نـــەخامتیمـــە
ب کـــول و کـــەســـەرم و یـــابێ هویڤیمـــە
نـــە مـــن هێلینـــە و یـــا بـــێ خـــوەیمـــە
خـــودان خۆزیمـــــە و[2] یـــــا بـــــەرزەییمـــــە
دەم چـــاڤ ب گریمـــە و یـــا بـــێ کـــەنیمـــە
یـــا بـــێ هـــەوارم[3] و یـــا بـــێ گازیمـــە
وارێ[4] ڤینـــــێ دە هـــێش نـــەچـــەریمـــە
چـــەنـــگ شـــکەســـتیمە[5] لـــەو نـــەفریمـــە
بـــابوی ئـــەز هـــێلام کـــوتر هێتیمـــە
ئـــەز یـــا هنـــدابیم نـــزانم کیمـــە
بۆچیـــە بـــژیم ئـــەز یـــا مریمـــە
چ بێـــت ســـەرێ مـــن حـــەمـــد ڕازیمـــە
ڤـــان دەردا فـــەلـــەك ئـــەز نـــەهـــەژیمـــە
کـــەســـێ مـــن دڤێـــتن هـــێش نـــەخواســـتیمە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠/٨/٢٠٠٩)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[2] ل جهەکێ دیتر: دگەل خۆزییێت خۆ.

[3] ل جهەکێ دیتر: نە من هەوارە.

[4] ل جهەکێ دیتر: دناڤ باغچێ.

[5] ل جهەکێ دیتر: چەنگێت من شکەستن.

بـــــابێ ئۆمێـــــــدم و دل پـــــــڕ خۆزیمـــــــه

كـــــهلهـــا ئـــــهڤینــــێ یــــا ل بــــهر دهریمــــه

هـــێش نـــهچوومـــه ژوور چـــاڤ ل بـــهختیمـــه

تــــالع مــــن نینــــه و یــــا مــــاف خواریمــــه

كۆڤانــــــدارم ئــــــهز یــــــا دل[1] ســـــۆتیمه

ڕاســـته یـــا ب دلـــم[2] نـــه وهك كـــهســـێمه

گولـــهك بووریمـــه و بـــهلـــگ[3] چرمســـیمه

بـــێ باغجـــهڤـــانم[4] و دویـــــر هاڤیتیمــــه

ژیـــێ مـــن بـــووری بـــهخـــت ڕۆنشـــتیمه

كـــــوتركم هـــــهژار دهم چـــــاڤ برێمـــــه

ئـــاخ بـــۆ بـــهختـــێ مـــن هویڤیـــا خودێمـــه

بـــهخـــت ڕهشـــیا كـــن ئاســـتهنـــگ ب گرێمـــه

یـــا بـــێ چـــارهمـــه بـــێ دهســـت و پێمـــه

پاشـــــهڕۆژ ڕهشـــــم چـــــو یــــا ب دلێمــــــه

نـــه مـــن شـــیا نـــه هویڤیـــا مرنێمـــه

لـــێ چـــبكم ژنـــم دارا شـــــكهســـتیمه

---

[1] ل جهەكێ دیتر: ب دلیڤه ئەز بیم ژار ڕەژیەك.

[2] ل جهەكێ دیتر: بێ تێن و هلمم.

[3] ل جهەكێ دیتر: لەو.

[4] ل جهەكێ دیتر: بێهن د من نینه.

# ڤیان

ئەزم ڤیان مام بێ ئەڤین
شوینا ڕۆهندکا دبارینم خوین
سۆتم حەلیام ب دلڤە پەقیم
بۆچیە بژیم ئەز هۆ خەمکین

ئەز و کەنی ژێک ما نە سل
کۆڤاندارم ب برینم دل
کەسەر و خەم ل من بینە کول
کانێ ڤیانا ڕوی سۆرگول

کەتم دەریایەکا بێ بن
دکەمە هاوار لاو دویرە ژ من
ژیانا من ل من بی مرن
تەیر و تەواڵ دگرین بۆ من

ژ چاڤیت زەر ڕۆندکا د بارینم
ل بەر دەرگەهی ب خەم ڤەدرویینم
هزرکە دبم و دەها د ئینم
د خەونادا لاوێ خۆ نابینم

ئاخ فەلەکێ تە چ ل من کر
ژبۆ مرنێ دل ئامادەکر
نەهێلا بگەهم مرادێ
ڤینا شرین بن ئاخ تەکر

مریمە و دخۆم نانێ ساخا
هەوارە نەشێم دلێ خوە
دین و هار بیم ژ ڤی دەردێ خوە
د ئاخڤم ل گەل سیتاڤکا خوە

ڤیانم ژار دل مام شکەستی
من لەش حەلیا بەس ما هەستی
چ ئاگر بی و کەتیم تێدا
تەڤنێ ڤینێ مانە ڕستی

هاوار خودا سەبر نەما
نەشێم ڕاکم بارێ خەما
زاڵم فەلەك بەختێ تەمە
جەرکێ من سۆت ب پەلاڤا

ئیرۆ ب خورتی ئەز دامە شوی
ئاگرێ دلی بلند بی دوی
ناهێت ڤەمراندن ب چو ئاڤا
چو ژ من ناهێت دێ بێژم چی

کفنێ مرنی بۆ من دوری
بۆ ژینا خوە یا دکم گری
چ دەرد بی من هاتی سەری
ژەهرا مرنێ من فڕکری

دێ چاوا بوورت ئەڤ ژینە
کەس ساخ ناکت ڤان برینا
کانیا قیری و ئەز کەتمێ
دلێ من ل سەر ئێکدی دینە

ئەزم ڤیانا بێ سوعید
من چی ب چاڤێ سەری خوە دیت
ل ڤینا لاوی خوە بیم تە دیت
شێخێ من چولێ بێم مرید

# هەڤالا من

حەیف تەمراند هەڤالینی
ژ من دویرکەتێ و من نابینی
جدلە ل تە ژ ڕەحمێ ڤالە
دلێ خەریب تو د حەلینی

دەردێ ل دلی ل سەر کەسەرێ
خۆزیا دخوازم ل من ڤەگەرێ
دا نوویکین دۆستینیا بەرێ
ژین تاویمە و لێ فەنەرێ

کا ئەو ڕۆژێن بوورین خودا
کەیف و خۆشی ژ مە مان جودا
تە ژبویر ناکم دۆستا هێژا
سال بوورین سەدامێ نەدا

بۆچی دۆستی تو هۆسانێ
حەژ تە دکم تو باش دزانێ
ڕەوشا ژینا منێ جانێ
چاڤ ل وێ ڕۆژێمە و کانێ

ئەڤە چەند وەختە و نەدیارێ
بێ سەرا شوین دکم پسیارێ
نابێژێ کا هەڤالا من
خوشتوڤیا ڤێ ژیانێ

بــــــەری ئـــــــەز ڤــــــی ژی بــــــــووڕینم
جـــــارەك دی ل دەڤ تــــــە ئـــــەز ڕویــــــنم
ترســــــــم بمــــــــرم تـــــــە نـــــــە بیـــــــنم
ســــــەد ڤـــــان كــــــولا ئـــــەز بمیــــــنم

# نێچیرڤانا دل ساڤا

ڕەندێ بەژن زراڤێ
دێم سۆرگولێ ب خوناڤێ
ڕەحمێ ببە ب حالێ من
تو نەبێ من کەس نەڤێ

نێچیرڤانا دل ساڤا
ئەز کەتم تور و داڤا
دلێ من کەت وان چاڤا
ب ئاوریا دێ سلاڤا

یا دلی من تو دزانێ
ب ئەڤینی لێ ب خودانێ
چ ل ڤێ بەختێ ڕەش بکەم
ڕێڤنگێ ڤێ ژیانێ

مە هەر دووا ئێک ڤیا
خەلک وێ دکن لۆمەهیا
گازندە ل دەورازیا
گەهشتن مە خوەزیا

## مراد نەبی

مراد بو ژین دلێ من بی
تە ڤین لێ چاند مراد نەبی
من ئاڤدا ب ڕوهندکێت چاڤا
محەیف چرمسی و ڤەنەبی

دلێ نازك نە ئێشینە
دل نازدارە و گول نەسرینە
باغچەڤان ما تە دل نینە
ژ ڕەحمێ ڤالا و من نەمرینە

ل من هات بەهارەك بێ باران
نە بی پاییز و بەلك وەریان
نیسان ل من كر زڤستان
هاڤین سلبی و ڕەوش بۆ نەمان

كرم شڤانێ ڤان خەمە
نەشێم بژیم نە ل گەل تەمە
ل هویڤیا خودێ و هاتنا تەمە
بكە هەمی ئەز بەرزەمە

## هەی غاینێ

ئـــــەرێ بـــــۆچی كچـــــا جـــــوان
كـــرم ئێخســـير مـــام بـــێ خـــودان
نـــەهـــ ســـالا مـــن حـــەش تـــە كـری
تـــە ئـــەس هـــێلام هـــەی بـــێ وژدان

بـــيم شـــڤانێ كـــول و خـــەمـــا
ڤينـــا تـــە دڤـــی دلـــی دەمـــا
دا بێـــژێ مـــن نـــە بـــۆ تـــەمـــە
ب غـــاينی تـــە هـــاش[١] مـــن نـــەمـــا

مـــن دل دا تـــە ڤـــين تێـــدە بـــی
تـــە ســـۆز دا مـــن تـــو لێڤـــە بـــی
چ دلـــە ل تـــە ژ ڕەحمـــێ ڤالـــە
ژ كـــێش جـــورێ خـــوين دليـــدە بـــی

چ لێـــبكم ڤـــی دلـــێ شـــكەســـتی
كفنـــێ مرنـــێ تـــە ل مـــن بـــەســـتی
وە ديـــارە تـــو بـــێ هـــەســـتی
لـــەو ئيـــرۆ غـــەيـــری مـــن خـــوەســـتی

كـــا ديـــوارێن ل واری جـــارا
بـــبن بويرهـــاتن مـــان ل ڤـــارا
كۆمـــەك ســـالا مـــن حـــەشـــتەكـــر
نـــائێی ڕێـــزا ئـــەڤينـــدارا

---

(١) هاژ.

هەی غاینێ پیلان سەدێ
کێ گۆت دلی د ئاگری ڤەدێ
من نەدزانی ب فێل و فەندێ
تە ئەس هێلام بەس تو خودێ

# نه ترسه

ئەگەر ئەڤیندارێ ل دلێ من بەژدارێ
ڤینێ ئاشکەراکە نە ترسە نازدارێ

هەی دلبرین دارێ تو ژك وەك من ژارێ
ئەگەر ل دلی شادێ دێ گەهین مرادێ

بێ ترس خۆ ڤەنادێ ل تە حەسا گوه نادێ
گەر تە دڤێت ئازادبێ ڤی دلی بەر نادێ

ژی ل من نەبوورینە دل مەست و برینە
تژی کول و دەردن گەهشتن خۆزینە
دێ ل بەندا تە مینم بێتە من ژین نینە

# سبا ته ب خێر

من گۆت سبا ته ب خێر
گۆته من ب خێر و بێر
من گول دایێ دەستی
ژ دیتنێ نەبیم تێر

ته چاڤ خویسارینه
تژی گڕنژینه
کون من لاورینه
خەما تو ب ڕەڤینه

لێڤ هنگڤینن شانا
ل ناڤ کەڤێن زۆزانا
لەخرینم برسیمه
من دان بەر ددانا

ته ڕوی بەفر و خوینن
پەیڤێن ته شرینن
دیاری و مزگینن
دلێ من نه حەلینن

# سپێدە باش

سـپێدە بـاش هـەلات
بەلگێن گولا خویسارا ل سەر
شـێرین وەلات
کراسـێ ئـازادیێ ل بـەر
ژ بنـەك نـوی هـات
ل مـە پیـروز بـت ئـەو خـەلات
دێ کـین خـەبـات
ب قەلەم و چەك مزگینی هات

## محەیف

سەد محەیف مخابنیا تە
حاسل نەبی مرادا تە
ئەز نەمینم[1] بۆ دلێ تە
ئەڤرۆ قەهر و کول مان[2] بۆ تە
رۆندك و گری مێڤانێن تە[3]
نەمینن یێن[4] سەبەبێن تە
ژین ل تە کرنە جەهنم بۆ تە
خۆشیا خاترخواستن ژ تە
نەخوشی کر[5] نە بەهرا تە
دێ چ بێژنە خودایێ تە[6]
ژین ل تە کرنە ئاگر بۆ تە[7]
تەیر و تەوالا ل دگرین بۆ تە
کەتم حەیفا[8] جوانیا تە

---

[1] ل جهەکێ دیتر: مام نەمینت.

[2] ل جهەکێ دیتر: وی قەهر و کول هێلان.

[3] ل جهەکێ دیتر: مێهڤانن ل تە.

[4] ل جهەکێ دیتر: خێر نەبینن.

[5] ل جهەکێ دیتر: نەخۆشی بینە.

[6] ل جهەکێ دیتر: خودایێ خۆ.

[7] ل جهەکێ دیتر: وان ب ساخی ئاگر بەردان تە.

[8] ل جهەکێ دیتر: سەد محەیفا.

چەند شرینە ئەو بەژنا تە
هنگڤینن دەڤ و لێڤێن تە
بەفر و خوینن ئەو ڕویێن تە
گلاڤێژن هەر دوو چاڤێن تە
جیران مرن[١] بو دیتنا تە
شەنگە و شوخە گەردەنا تە
بورهی کڤانن سەر چاڤێن تە
نە ب سەرڤەیێ ئەو مێرێ تە
چەند ببژم ئاخ و خوزی[٢] بۆ تە
دارا خۆزیا بەر نەگرتە
بەلەک برین دبێژم تە
دلێ شکەستی بی دلێ تە
ئەز نەمینم[٣] بۆ حالێ تە
کەسەک نەبینت دەردێ تە

---

[١] ل جهەکێ دیتر: حەلان.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئاخێنکی تێنە من بۆ تە.

[٣] ل جهەکێ دیتر: سەد هەوارا.

# من باخێڤە

بەختێ تە من باخێڤە
خولامێ دەڤ ولێڤە
سۆزێ دێ دم تە مکم
سلنابم ژ ئیرۆ پێڤە
وەی لێ وەی لێ وەی لێ

تو ئەو ڤینێ لێدگەڕم
بەها ڕوح بت دێ کرم
ژ کەیفا بێ چەنگ د فڕم
نە ل گەل من بێ دێ مرم
وەی لێ وەی لێ وەی لێ

ڕوی سۆرگولا زاخۆیێ
باغچێ ڤینا من توی
وی بەژنا شرین شەپال
ژ من یا دویرکەتی و چوویی
وەی لێ وەی لێ وەی لێ

تە سینگ سێڤێن بەرواری
گەز و شەکر ژێت باری
دەستێ خۆ بدە دەستێ من
دا بارکن ژ ڤی واری
وەی لێ وەی لێ وەی لێ

# ئاخ مرنێ

من چوو ئۆمێد نەمان ل دنێ چاڤ ڕەش یار
ڕۆژەکێ من نە دیتبا هەی هاوار
ژ واری بارکر قەدەر حالبی فەلەك نەیار
چبکم خودا دۆست تە مراند دل مام هەژار

مخابنی بەژنا دەلال هێژابی
پوژکوژ گول بی نەگەهابی هندابی
بەهار هێلا بێ ڕەوش و خەمل پیروکال بی
زاڵم قەدەر تو سەبەبێ ژ من جودابی

مەحەیف دلبەر مر بێ مراد دل حەلاند
تەڤنێ ئەڤینێ وێ ڕاجاندی و نەڤەهاند
دلێ من ل سەر ئەڤیندار بی وێ دل شکاند
من دل کول بی بێ نوژ دەرمان وێ ئارهاند

ژ من هاتنا دا چم شەڕی مرنێ
گەلەك ئێشا دلێ ب کۆڤان و بویرهاتنێ
ئاخینیا وێ د ڕاهێلم هێلام ب تنێ
بویرهاتنا دلێ من یێ تێد سۆتنێ

# سحاريا

هندی سحاريا ئەم هێکا دخوين
ئەم ل سيکا برێڤە دچين قدقد دکين

ئاغلەبا رۆژا خوارن تەحينە
هار دبين دەينن ئێکدوو پەحينە
هندی هند ئەم دخۆن شاژی
دوماهيکێ دێ بين تاژی

خوارنا مە پتاتن و زەلاتە
مەعدە تەحمل ناکت نێ بی خەياتە
هندی هند ئەم دانقۆتێ دخوين
ناڤ جهی رە ئەم پياڤە دقوتين

هەرو نيڤرۆييا ساڤارە
ئەم خۆ نخێڤين ل مە تاسارە
هندی هند ئەم دەوی ڤەدخوين
ب رێڤە دچێن و ئەم د خەو دچين

چ گاڤا تو تێر بخوی دانهێرکێ
دێ بێ يا کوردان خۆ گرێلکێ

## چیرۆکا من کیر و دیره

چیرۆکـــا مـــن کیـــر و دیـــره
نـــه مـــن ڕایـــه و نـــه تـــه‌کبیـــره
مێـــرێ مـــن یـــێ بـــێ زه‌میـــره
خـــودا نـــه‌نیاســـه و حـــه‌قیـــره

دوهـــی کـــه‌چبـــیم ئـــه‌ڤـرو بـــیم ژن
ســـال وێ دبـــوورن ژ عـــه‌مـــرێ مـــن
خـــه‌م و خـــه‌یـــالا دلـــێ مـــن خـــوارن[1]
کـــه‌س ب حـــالێ مـــن قـــه‌د نـــزانن

ئـــه‌ز بـــیم ڕزقـــێ ئێکـــه کـــافر
ژیانـــا مـــن ل مـــن کـــره ئـــاگر
مـــن ل کێمـــا دا و هـــه‌ر مـــن داکـــر
خـــودای نـــه‌ســـیبێ مـــن دگـــه‌ل کـــر

ئـــه‌و ڕۆژ ب ڕه‌شـــبت ڕۆژا خواســـتیم
ژبـــۆ حـــالێ خـــۆ ئـــه‌ز یـــا دگـــریم[2]
ده‌ســـت ژ خـــۆ بـــه‌ردام[3] و بـــێ هیڤبـــیم
هـــه‌وار خـــودا دێ چـــاوا[1] ژیـــم

---

(١) ل جهه‌کێ دیتر: خوار.

(٢) ل جهه‌کێ دیتر: بۆ تالعێ خۆ بلەز وا دگریم.

(٣) ل جهه‌کێ دیتر: خۆزیا دخوازم و.

زادی دخـــــوم ب ڕۆنـــــدك و گـــــری
ڕادبـــــم و دریـــــنم ب صـــــەودا ســـــەری[٢]
دچـــــم ژوور و تـــــێم بـــــەر دەری
مـــامێ گونـــەهـــ[٣] یـــا ل مـــن کـــری

دام کـــەســـەکـــێ بـــێ دلـــێ مـــن
ڕۆنـــدك و گـــری بـــین بـــەهـــرا مـــن
حاســـــل نـــــەبـــــی مـــــرادا مـــــن
یـــێ مـــن دڤیـــا دویرکـــرن[٤] ژ مـــن

دکـــەنـــم بـــەس یـــا دل ســـۆتیمە
ئـــەز بـــێ حـــەز و بـــێ خـــوەیمـــە[٥]
ل مـــن هشـــکبی دەریـــا و[٦] ماســـیمە
ئـــەز ژنـــم دارا شـــــکەســـــتیمە

بـــۆ کـــێ بێـــژم ڤـــی دەردێ[٧] خـــۆ
مـــامێ ئـــەز فـــرۆتم بـــۆ خـــۆ
هنـــدی مـــن گـــۆت هـــەر یـــا بـــی ژ خـــۆ
بـــارێ گـــران دا پشـــتا خـــۆ

---

(١) ل جهەکێ دیتر: چەوا.
(٢) ل جهەکێ دیتر: ڕادبم درینم هزر ل سەری.
(٣) ل جهەکێ دیتر: تاوان.
(٤) ل جهەکێ دیتر: دیرکر.
(٥) ل جهەکێ دیتر: بێ هیڤیمە.
(٦) ل جهەکێ دیتر: دەریا هشکبی و ئەز.
(٧) ل جهەکێ دیتر: چیرۆکا.

ژێکڤەبینا من مرنە[1]
بەس نەخۆشی بەهرا منە
شویکرن زیندانا منە
بەختڕەش بین[2] تالعێ منە

[1] ل جهەکێ دیتر: ژێکڤەبین ئەڤرۆ مرنە.

[2] ل جهەکێ دیتر: بەختڕەشی.

# ئەگەر نەژ بەر خاترا تەبا

ئەگەر نەژ بەر خاترا تەبا هەی جەرگێ من
ڤینا تە ل ڤی دلی نەبا تورینا من
سال ب سال ئەز نەدهاتم ڤی وارێ خەما
لێ ئەز چبکم ژ تە غەریبم هەی دلێ من

ئێک ڕوینشتن ل دەڤ تە ڕوینم پێ شادم ئەز
د ژینەک شرین دا خۆ دبینم دەم د بووری بلەز
هەر دوو چاڤێت ڕەش و بەلەک حەلاندم ئەز
بەژنەک زراڤ قامەت ئەلیف ڕویکا دم گەز

هەر دوو بری شوبهەتی هەیڤا ئێک شەڤی
ل سەر وێ ئەنیا کەڤەرن بەفر و کەڤی
زلف و خالا دل کوزراند و کالا
تە لێڤ هنگڤین و قەیماغن سەر ڤی دەڤی

ئاخ ئەڤینێ چەند شرینێ ل دلا تو خوەش
ئێ تە نەڤێت تو دمرینی ژین لێ ما ڕەش
یا مە دڤێتن دێ گەهینێ هەی گولا گەش
ئەگەر ئەڤ دەردە ب تە خۆشبت ل من بیست و شەش

ل تە دیلدارم هەی خانا من تێر وەفایێ
تو لەیلا بێ و مەجریم ئەز ل ڤێ دونیایێ
شەڤ ما تاری و ل من درێژ بی و سەبر نایێ
ڕوح و جانی تو بیبیکا ڤان چاڤایێ

# ئەگەر تو نەبێ من نینە ژین

ئەگەر تو نەبێ من نینە ژین
ئەگەر ژ من ڤەبێ ب تازیمە و شین
ئەگەر من بهیلی ل کێ بکەم ئەڤین
ئەگەر ژ من سلبی دێ شێتبم و دین

بۆ من زینی و بۆ تە مەمەم
بۆ من ژینی بێ کول و خەم
بۆ من ڤینی هەر وەخت و دەم
دگەل ئێک مینن کەیفخۆشین ئەم

ئەڤیندارین ئەم پێکڤە دکەین کار
تا سڤك دەن خەم تە دبینم جار
حەژێکرنا گەرم نابینە سار
تو ژ من نەکە شەرم گولا نازدار

ل سۆزا ئەڤینێ بەژدارە دل
تو دێ من بینێ دلدارم گول
دلی د هەژینێ دل هێلا گول
تو گول نەسرینی تە سۆت بلبل

# لاوو من چەند حەشتەكر

لاوو مــن چــەنــد حـــەشـــتەكـــر
عـــــەزيـــــزو لاوو مـــــن دل مـــــر
تـــــەركـــــا بـــــاب و بـــــرا كـــــر
شـــــرين و شـــــەكـــــر و وەرە ڤـــــر

ســـــنك كويســـــتان و زۆزانـــــــە
ل هــــەڤـــال و هـــۆگری پاوانـــە
لاوك لـــــێ بـــــی مێڤانـــــــە
ڕێڤنگـــێ ڕێ دويـــری ســـەيرانـــە

خـــەريـــبم تـــو ژ مـــن دويـــرێ
كـــرم دێـــران مـــا نـــائينم بـــويرێ
دلـــێ شـــكەســـتی لێـــت[١] زويـــرێ
نـــــازك و نـــــازدارم ئێخســـــيرێ

دەرگـــــەهڤـــــانێ ڤـــــی دلـــــی
شـــەمـــالێ فـــەنـــەرێ لـــێ هلـــی
ژ باغچـــــا ڕوحـــــان و گـــــولی
ل دلـــێ مـــن ڕەبـــەنـــێ هـــەركـــولی

ئـــاخ ژ دەردێ تـــە ئـــەڤينـــێ
دل ئاســـن بـــت تـــوت[٢] حـــەلينـــێ

---

[١] لێ د

[٢] تو د.

چـــو دل نیـــنن تـــو نـــه تێـــده
دەرد و كـــــولا لێـــــت[1] ئـــالینێ

هــــەی خۆزیـــــا ئــــەڤینــــــدارا
تـــو بـــەهـــارێ ل هـــەمـــی واره
ئـــاگرێ تــــه چـــەنـــد دژواره
ئـــێ تـــو بســــۆژێ ل ژینـــێ ژاره

ئـــەڤینـــێ تـــوا ل مـــن بـــی بـــەلا
تـــەز[2] مرانـــدم مـــن دل حـــەلا
نـــەشـێم بـژیم نـــه ل گـــەل مـن بـی
بالیوزخــــــــانێ ڤینــــــــێ دلا

مـــن دل حـــەكـــیم و لوقمانـــه
ل دەردێ ئـــەڤـــین دكـــت دەرمانـــه
بـــەژدارێ كـــول و خـــەمانـــه
دادگـــەهـــە ل ســـۆز و پـــەیمانـــه

---

[1] لێ د
[2] ته ئەز.

## محەیف و سەد مخابنی

محـــەیـــف و ســـەد مخـــابنی
گێـنج کـەتـن دەسـتێ دوژمنـی
بـێ سـەر چـەنـاز ل مـە زڤـڕین
ئـاگر ئیـرۆ ل مـە غـەونـی
گـەلـی سـەرکـردا بکـن بـزاڤ
بـلا ئـەم نـەبـن[1] پێکـەنـی
کـێ دیتـە ب سـال و زەمـانـا
دەسـتگیرا سـاخ ژێـك هنجنـی
بێـدەسـت کـرن پـێ لـێ بـڕین
سـەرژێکـرن ل نـاڤ کفنـی
هـەڤـال و هـەجـەر و هـەژار
مە کوردا بخوینا وان سووندخوار
ڤـەکـین تـولێ نـەبـت ئێڤـار[2]

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ل ناڤ جیهانێ ببن.

(٢) من د.

## ئەز کەتم داڤێن تە جانێ

ئەز کەتم داڤێن تەجانێ
ل من خۆشکە ژینێ ب ڤیانێ
هەمی ڕوح سڤکا خوین شرین
ل دەردێ دلێ من دەرمانێ

من ل گەل تە پەیمان گرێدا
دا پێکڤە بگەهین ئۆمێدا
دلێ من ڤینا تە تێدا
هەی جانا ژ تورینا زێدا

دێم سورگولن خۆناڤ گرتی
شرینا ل من بی دەزگرتی
هنگڤین ژ دەڤ و لێڤا دبارن
من کاس بۆ خوە ژی داگرتی

تە هەر دوو چاڤ گلاڤێژن
ئاوری دبن تیر و د ڕێژن
جەرگ و دلا ل مە برێژن
تەیر و تەوال وێ ب مە دبێژن

## خۆ نەهێلە دا بکەسەر

خۆ نەهێلە دا ب کەسەر
نە ئەو کچێ من دل ل سەر
خەونا ب هویڤیا نەڤەهوینە
دلێ من بخودانە دلبەر

بەس دلێ من ب ئارهینە
من ئەڤینی ل گەل تە نینە
هەرە ئێکدی بۆ خۆ بینە
ڕەوشا ل ژینێ پێ بخەملینە

هێش زارۆکێ نەگەهایێ
گول بژکوژێ ل ناڤ باغچایێ
بۆ ڤەبینا تە هێش زویە
من نەئێخە ڤێ بەلایێ

سەری ڕۆژێ دێ بێژم تە
بەری بکەڤم وان داڤێن تە
بایێ تە گەرمە جانا من
هەرە بەلا تە ل سەرێ تە

## بێ باوەری

خۆزیا مـن تـو نـاس نـەكربـا
تـە ئـەڤ دلـێ هـە نـەبربـا
هوسـا نـەهـێلا بـام دل كـول
بـلا خـودای زوی ڕوح بربـا

كێ گۆت تو ڤێ ل مبكێ[١] جانێ
مـن بكـێ ئێخسـیرێ ڤیـانێ
تـە دل دا مـن دبێـژێ كـانێ
بـێ ڕەحـم دلـێ بـێ ئیمـانێ

هـویڤی وخۆزیـا ژی پـێ كورتـە
دارا خۆزیـا بـەر نـەگرتـە
دلـێ ب ئـەڤین ل مـن مرانـدی
محـەیف نـاڤێ مـن كـەت سـەر تـە

سـەد مخـابن تـەكـار مـن كـر
ل ژینـێ مـرن ل مـن شـەكـر
مـن بـاوەری ب ڤینـا تـە كـر
تـە گۆت نـەهبی مـن حـەژ تـە كـر

---

[١] ل من بكی.

# بێ باوەرێ

ها دیسا تە ل من زڤڕاند ڕۆژێن بەرێ
تلاندارا خەما دە هەژاندم شنوی ڤەدگەرێ
چەند کول و دەرد ل من ڤەحەواندن بێ باوەرێ
تە کرم گولا بەلك وەراندی تو ل چی دگەرێ

پشتی تە ئەڤ دلە فرۆتی لێت[١] بێ بکر
تە جەرگ و مێلاك ل من سۆتن ڤین ل گەل تەمر
ئێدی دل تە ناحەبینت خۆ بێ شەکر
چو من باوەری ل گەل تە نەما تە چی ل من کر

بەسە تە ژین ل من خر کر ئاستەنگ هێلام ب تنێ
تە ژ من ڤەکرن هەڤال و دۆست هۆ ب مت[٢] کەنێ
ما دێ ب چەند کێرا من سەر ژێ کی ڤین چرویکێ
هێلام بێ ئەڤین ل من بووری ژین هەی ل منێ

قەد ڤینێ ناکم ل گەل نەمەردا هەی دوو ڕوێ
ئەز برینێت کەڤن نوی ناکم ل نوژدارێ
سەرێ نە ئێشت گرێ نادم لێ کەفێ
دێ هەرە بەلا خۆ ژ من ڤەکە دل مرێ

---

(١) لێ د
(٢) من د.

## بێ باوەرێ[1]

بیناهیا هەردوو چاڤا تو بۆچی ژ من باوەر ناکی
گرنژینێ ل سەر ڤان لێڤا بێبەختی تو من بێزار دکی
دیتنا تە ژینا منە نەخۆشیێ بۆ من پەیدا دکی
جارێ پرسا دلێ خۆ بکە ما دێ چەندا لێ مێڤانکی
گەر تو نەبێ بۆچیمە ئەز ب ڤی کاری دێ من هنداکی
گاڤا ئاوریا دێ من ب چاڤا تو ڤێ ڕوحێ ل من بەلادکی
من د ئاخێڤێ بلێڤێن شرین مریبم من ژ توربێ ڕادکی
ئەڤیندارێ بەژنا تەمە خودا من ژێ بێبەهر ناکی
مرادا من ل گەل حاسلکە بەری ڕۆژێ ل من ئاڤا بکی
پێکڤە ڕازین ل بن ئێك بانی خۆدا ڤینا من لێ شادکی
من حەژ تەکر ب سۆز و پەیمان تو نەشێ من ژ خۆ جوداکی
برینـدارم نـوژێ و نـوژدار ب وان تبلێن خۆ من دەرمانکی
تو بارانی و ئەزم بهار ل من نە باری دێ من ژارکی
ئێخسیرم ئەز ل تەمام هەژار کول و خەما ل دلی بار دکی
ژ خودێ بترسە نیڤا چاڤا ژبەر چی هندە خۆ گراندکی
دل بریندارم ل ڤینا تە وەرە داڤی دلی ساخکی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٦/٧/٢٢)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# کچکێ دینێ هەچە و مەچە

کچکــێ دینــێ هــەچــە و مــەچــە
تــو هنــدە د بــەرخــوەرە نــەچــە
کــەســێ تــو نــەڤــێ کریتــێ
تــو چــاڤ و ڕی و دفــن فــەچــە

کچکــێ دینــێ ســەنــی و مــەنــی
بــەر چــو عــەینــا نــەســەکنــی
تــو خــۆ بینــی دێ بخــۆ کــەنــی
ژ مێــژدا یــا تــە یــا چــووی ژ بنــی

کچکــــێ دینــــێ ســــوبحانەلــــلا
تــو یــا ل مــەحلــێ بــی بــەلا
خوینــــا تــــە ناچــــت چــــو دلا
دێ ڤێجــــە د مالێــــدا بحــــەلــــە

کچــــــک هــــــات و ژ قوتابخــــــانێ
کــــورک بــــێ ســــەرێ کــــولانێ
پــــەرتووکــــا ئــــاڤری وێ داڤــــێ
مجــــد کــــورک هاتــــە قوتــــانێ

## دۆستێ غاین

مــــن دل داتـــــه و ڤـــین تێـــدەبــی
تـــه ســـۆزدا مـــن و تـــو لێڤـــەبــی
دابێــــــژی مـــــــن ســـــــەرێ ڕۆژێ
بــــەری تـــو ڤـــی دلـــی بســـۆژێ

جـــارێ پرســـا دلـــێ خـــۆ بکـــه
شـــنویکا خـــۆ ل مـــن گـــران بکـــه
پاشـــی مـــن ب ڤـــێ مرنـــێ ڤـــەکـــه
ســـۆزداری ل ڤینـــێ گـــەلـــەکـــه

چلێبکــــــەم ڤـــی دلـــێ مـــری
غـــاین تـــه بـــێ بـــەهـــا کـــری[1]
تـــو چـــەنـــد دل هشـــکی وەك بـــەری
کـــارێ مـــن کـــر ڕۆنـــدك و گـــری

مـــراد ل مـــن بـــن ئـــاخ کـــری
دلـــێ مـــن ســـۆت ب ئـــاگری
ب چـــو ئاڤـــا دل نـــەڤـــەمـــری
ب ڕوبیـــــاری ل مـــــن نـــازڤڕی

نـــەحـــەســـا[2] تـــو ژ مـــن ڤـــەکـــری

---

[1] ل جهەکێ دیتر: دل بۆ ته من هێلا ڤەکری.

[2] نه حەزا، ل جهەکێ دیتر: چ کچە.



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

ئاقـــــل و ســـــەودا ل تــــە بـــــری
ل بـــەر ڤـــی دلـــی هـــەر شـــەکـــری[1]
خـــۆ بـــێ زاڤـــا دێ ئـــێم ســـەری

دێ چ بێــــــژێ خـــــــودایێ خـــــــۆ
زیـکــــا تـــــە ژبیرکــــر ســــۆزا خـــۆ
وەرە ســــــەحکــــــە گـــــولا خـــــۆ
یـــــا چرمســــــی ســـــەر بنـــــا خـــــۆ

---

[1] ل جهەکێ دیتر:

## زاڵم غاين

بۆچی تە ئەڤ بریارە دا
تە تیرەك ل دلێ من دا
نێ تە د زانی ئەز حەژ تە دکم
ناڤ بەینا من تە خودا

زاڵم غاين لێڤە نەبە
ئەگەر تە باوەری هەبە
ب سۆز ئەڤینی دلی دەبە
تە نەدهێلا ڤین بەرزەبە

بێبەخت ئیرۆ ل من ئاخرەتە
ئێدی نەشێم ببم مالا تە
جارا دبێژم ئەڤە خەونە
ئەگەر ڕاستە خیانەتە

کەلها ڤینێ تە ل من ڕوخاند
دارا ژینێ بەلگ وەراند
دەڕەنگی من دلێ تە خواند
محەیف تە ئەڤ دلە مراند

# ئەز زارۆكەك جوانم

ئەز زارۆكەك جوانم
ئەز پژ كوژا گولانم
دێ بم زانا و خواندەوار
پاشەڕۆژا خۆ دزانم

ئەز زارۆكم ئەز كوردم
ئەز خودان خاك و عەردم
بوستەك ئاخا خۆ نادم
ئەز دێ ڕوحا خۆ ل سەردم

كوردستان دەیكا منە
ئەو ڕوح و گیانێ منە
چاڤ دەركەڤن دوژمنا
ئاخێ نادم یا منە

# چ دومانی و کەتم تێدا

چ دومانی و کەتم تێدا
من دل ب تەڤە گرێدا
من خوە ئێخست تەلهـ و داڤا
نەگەهشتم چو ئۆمێدا

ب دلێ شکەستی پەشیمان بیم
ل ناڤ ئەڤیندارا هندا بیم
ئاخ فەلەکێ بێ مراد بیم
سەد مخابن هۆ دل ژاربیم

د ڤێ ژینێدا مام نقستی
کفنێ مرنێ تە ل من بەستی
مریمە دخۆم نانێ ساخا
بیم ئێخسیر کەتم بەردەستی

ئەز چ بێژم سعویدا خۆ
بچی دەرمانکم ڤی دلی خۆ
من چی ئینادە سەرێ خۆ
ئەز ب خۆ بیم دوژمنێ خۆ

ئەڤینێ کرم عەڤدال
ب نەخۆشی من بووراندن سال
لەو ئیرۆ ئەز مامە بێ حال
ئیرۆ کو یا ل من بی هەڤال

کێم شیرەتی ل ئەڤیندارا
نەکن ئەڤینێ دوو جارا
دا وەك من نەگرین بووارا
دەردێ من گەلەك دژوارە

# شيلانم دل بريندارم

شيلانم دلبريندارم
ب دلێ شكەستى ئەڤيندارم

ل دەلالێ خۆ ئەز داخبارم
بێ سەميانم دل ئازارم

ئەز بخۆشيا بێ بارم
دارا شكەستيمە و هەژارم

هەوارە خەما ئەز خوارم
ل عەزيزێ خۆ ئۆمێدەوارم

تو دزانى كا چەند سۆزدارم
تو گولى و ئەز ل تە بەهارم

ل ئەڤينيا تە بەژدارم
ل حەژێكرنا تە نازدارم

دلێ تە نەبت بێ وارم
تو كيڤە بچى ل تە دلدارم

بخودێ ل سەر تە دين و هارم
قەنجيێت تە ئەز قەردارم

## کانێ ئەو گولا بێهن خۆش

کانێ ئەو گولا بێهن خۆش
د هزرادا چو ما مەندەهۆش
یا دنژنم و هەدر یفم
شەڤ درێژبی ل من نەبی ڕۆژ

نێ نەهوسانە ئەڤینی
تو ل کێش چاڤی دلا دخوینی
خەما تو ل ڤی دلی دچینی
ئێکدی ژمن چێتر نابینی

من حەژ تەکر ژ نیڤا دلی
من دل داتە ژیێ ئاقلی
من نەدزانی تو دوو دلی
ل دەڤ من ئاشتی و ژ دویرڤە سلی

دێ ڕۆژ ئێتن و پەشیمانبی
چاڤ ژ ڕۆندکا زوهانابی
ل زڤڕینێ دێ بێ بەهابی
کر ئاخرەت ئیرۆ ل من ڕابی

## جەژنا دایكبوونێ[1]

ئیرۆ جەژنا دایكبوونێ
شەمالەك نوی هلبی ل ژینێ
رۆهنبین چاڤێن دایك و بابا
هزار سال ژی تو ببینێ

پیرۆزباهییێن خال و ماما
تەڤ برازا ل گەل پسماما
خۆشك و برا ب كەیف و سەما[2]
هەڤال و دۆست ل ناڤ شاهیا مە

ئاهەنك ب فەنەر و فندە
هلكن شەمال و ئەلندە[3]
دایكبوون خۆشترین جەژنە
دناڤ مەدە[4] شاهی و گۆڤەندە

ژبۆ دای بابا تو چرایێ[5]
ژینا وان رۆناهی دایێ
ژی درێژبی ل ڤێ دونیایێ
خەمل دا مالێ و هێژایێ[1]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (٢٠٠٦/٨/٢٩)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[2] ل جهەكێ دیتر: خۆشك ب كەیفن و برا ب سەما.

[3] ل جهەكێ دیتر: شەمال هلبین لگەل ئەلندا.

[4] ل جهەكێ دیتر: مەدا، ل مالا مە.

[5] ل جهەكێ دیتر: لاو فەنەرێ و چرایێ.

# جەژنا دایکبوونێ

ئیرۆ جەژنا دایکبوونێ
شەمالەك نوی هلبی ل ژینێ
ڕۆهن بین چاڤێن دایك و بابا
هزار سال ژی تو ببینێ[٢]

ڕونیا چاڤای و بیناهی
تە د مالێدا کر ڕۆناهی
کەسوکار کۆم ببن ب شاهی
دەی بابا بکن پیرۆزباهی

دێ خوازین دۆست و هەڤالا
هلکین فەنەر و شەمالا
جەژنا دایکبوونا تەیە
ڕەوشا برا و مام و خالا

ڕابن مالێ بنەقشینن
ب گول و نێرگزا بخەملینن
بیرهاتنێ ب کەیفێ بوورینن
دا دۆست و هەڤالا ببینن

---

[١] ل جهەکێ دیتر: خەملا مالێ و تو هێژایێ، شیرکێشێ پشتا برایێ.

[٢] هەتا ڤێرێ دگەل هەلبەستا بەری ڤێ وەکهەڤە.

# ب ئاگری تو نەلەیزە

ب ئاگری تو نەلەیزە
ژینا ب ئەڤینی عەزیزە
لاوا تونەکوژە ب ئیزا
تو خۆ ژ ڕێکا من پارێزە

ژ تە دکەم هویڤی و ڕجا
خۆ نیشا من نەکە چوجا
دلێ من نەدە بەر پەنجا
ژ من ڤەبە هەی کچا قەنجا

دەردا ل دلی زێدە نەکە
ئاگەهداربە و چاڤا ڤەکە
ئەز و تو گەلەك ژێك دویرن
یا هاتی سەرێ گەلەکە

بۆ تە د ڕێکم ڤێ هۆزانێ
یا دلێ من دا نو بزانێ
بەلا خۆ ژ من ڤەکە جانێ
ڤین گرانم تو ئەرزانێ

## ئەز ئامادەمە

جانـــا ژێهـــاتی ئـــەز ئامـــادەمـــە
ئـــەڤینیـــا تـــە د ڤـــی دلـــێ دەمـــە
نـــازك شـــەپـــالێ مـــر بـــێ تـــەمـــە
ئـەز تـە ژبیرنـاکم هنـدی ئـەز هـەمـە

دێمــێ ســورگولی دەم ل مــن مــەرەمــە
کلــێ ســوبحانێ ژ وان چاڤــا شــەرمــە
هـەیـڤ ژ جوانیـا تـە دبـن عـەورا ڤـەمـە

ستێرا سپێدەهیا ژ قـەهـرێن تـە ڤـەما
رۆژ ل مـە هـەلات وی رەنـگ لـێ نـەما
چیـا ژ جوانیـا تـە د حالـدە ئـەو جـەما
چـەنـد گـول و گیـا ئـاگر پێڤـە مـا

## دلێ نازك بريندارە

دلێ نازك بريندارە
ئەو ساخ نابتن چوجارا
ئەڤينى ما د دلێ كولدە
نە دەرمانە و نە نوژدارە

تە دل دابەر مو تيرا
ڕۆژێن بەرى تە نە ل بيرە
بيرهاتن ل دلى زيران
خوشتوڤيا من ژ من دويرە

سەبەب چيە لمن نا پرسى
ديارە ژ خودێ ناترسى
تە دلێ من هێلا بێ وار
زاڵمێ تو چەند دل قورسى

هزر و بيرا ئەز دوير برم
كول و خەما بێ هێز كرم
ئەز هێش گەنج بيم تە پيركرم
خاين ماتە دڤێت بمرم

# ئەز خەریبم

دیار بە و من خەریب نەکە
ئەز دل کولم چاڤا ڤەکە
بدلێ کۆڤان من حەشتە کر
چبکم ل من خائن فەلەکە

ناڤ بەینا مە یا بی دلمان
دڤێن من و تە بکن قوربان
باوەرنەکە تە بهێلم جان
بسۆزێن ئێك دل مکم پەیمان

دارا مرادێ و ئۆمێدە
من ل ڤینا تەژین واتێدا
سووند ب هەر دوو چاڤێن دەلال
نەگەهی من مرنا د ڕێدە

ئەڤینداری تەمە دلبەر
خوینێ ل دلی ژێ نا ئێ دەر
رویدان ل مە نابن ئەگەر
بلا دویر بی من دل وێ ل سەر

# ڕێڤنگێ خەما

خەون و خەیالێت کو ئەز حەژ تە بکم[(١)]
دل کۆڤان دارێ چاڤێت بەلەکم[(٢)]
بەلێ پا چبکم نەیار فەلەکم[(٣)]
چەرخ ل من بادا بکە سەر گەلەکم[(٤)]

من دل خەریبە نا ئێم بۆ برا تە[(٥)]
مراندم ب ساخی دەولەت سەرێ تە[(٦)]
گەر نە ل گەل من بێ قەد ناژیم بێ تە[(٧)]
تە هێلام بێ دل گونەهە ستوێ تە[(٨)]

بیم ڕێڤنگ ل پڕ سۆسا سالوقدانە
ژ من چێتر دزانێ دل بێ خودانە
هوسا دویری من کا دێ چاوا ژی
کا چەند کول و دەردی دلێ تە دانە

---

(١) ل جهەکێ دیتر: خەون و خەیالێت من نێ گەلەکن.
(٢) ل جهەکێ دیتر: شوخ و شەپالێ هزرێت من لنکن.
(٣) ل جهەکێ دیتر: نازك دەلالێ ئەز بێ فەلەکم.
(٤) ل جهەکێ دیتر: من ڕوح ئێخسیرا چاڤێت بەلەکن.
(٥) ل جهەکێ دیتر: من دل خەریبە نائێم بویرا تە.
(٦) ل جهەکێ دیتر: ئەڤین ما تێدە دەولەت سەرێ تە.
(٧) ل جهەکێ دیتر: دیار بە جانێ ئەز ناژیم بێتە.
(٨) ل جهەکێ دیتر: تە هێلام بێ دل گونەهە ستوێ تە.

دل كولم ببم مەم و زين ل من نەديارە
ئەز بيم سيامەند خەج هێلا ل وارە
بۆسيدم فەرهات شرين هەوارە
مەجروينم دين بيم لەيل ل من نوژدارە

## دۆستا دل غائن

سەردەڤ دۆستا دل غائینی
ل من هنداکر رێکا ژینێ
تە دل و ئەزمان نە ئێك بین
تو ب خوە دکەنێ مت[١] گرینێ

رۆژێت مە ل کەلێك بووراندین
ل باخچێ ڤینێ مە گول چاندین
هێلان بێ ئاڤ چرمساندین
بەلك لێ وەریان بێ بەها بین

کا سۆز و پەیمانێت بەرێ
بەرێ من داڤێ وەغەرێ
نێ نە هوسانە ئەڤینێ
کول و دەردا ل من کر دەرێ

دلێ رەبەن تژی کول بین
ئەو رۆژا ئەم ژ ئێك دوو سل بین
خوەشی چوون نەخۆشی خڕ بین
ئۆمێد برین هەمی مرین

---

[١] من د.

## دل كەتێ ل داوەتێ

من تو دیتێ ل ناڤ داوەتێ
بخوە حەساندم ب ئەشارەتێ
چاڤێ بەلەك ل من نقاندن
چبكم دلێ كۆڤان كەتێ

گۆڤەند گەرا ل گوندێ مەدە
دۆستا من یا كەتی تێدە
كەزی بەردان سەر بەژنێدە
ب ڕاستی دلێ من نێ لێدە

كوڤەندەك گەرا ل بەر دەری
ئەز ڕوینشتم بەرهەمبەری
جوانترە ژ شەوقا ڤی هەیڤێ
نێ هەر ئەز بیم ل تە مشتەری

سەرێ گۆڤەندی ب تە ڕەوشە
ل ناڤ گولا گولەك گەشە
دلێ من نێ هەر یێ خۆشە
زوی د بەر مرە بووری مەشە

# ڤین

ڤینە ئاڤا دکەت ژینێ
ل دلا چی دکەتن هێلینێ
ئەڤیندارا ژ خەو ڕادکەت
د گەهینتێ مزگینێ

ڤین پەیڤەك شرینە
تام شەکر و هنگڤینە
ل دل گولا نوژدار ڤینە
ل خەریبیا خەم ڕەڤینە

ڤین سێ پیتێن هەژینە
هەمی دل لێپ[١] هویڤینە
گولن ل باغچێ تە ژینێ
بلبلە دلە لێت[٢] خوینە

دلێن بێ ئەڤین ب داخن
نەمرینە و نەساخن
دێ پیر بین کەس وا ناخن
ل ژینا خودێ کولاخن

---

(١) لێ ب.

(٢) لێ د.

## دلمایی

سەبەب چیە تو دل مایی
ل بەر ڤی دلی تو هێژایی
سل نەبە فەنەرا ژینێ
ژبیر نەکە تە سۆزا دایی

بەختێ تەمە من باخێڤە
گڕنژین سل نابن ژ لێڤە
گەردەن و ڕیی شەکر پێڤە
سینگ باغچە ب هنار و سێڤە

کەزیێن درێژ پرچا تاری
سەر بەژن و بالێدە دباری
کلێ ژ هەر دوو چاڤا شەرمە
بریێن وەك هەیڤا ل ئێڤاری

نازیا نەکە ل من نازدارێ
خوە گران نەکە تو دلدارێ
چەند دلمایی بێ هەر تو یارێ
تو بۆ ژینا من بەهارێ

# گولا من

جـــۆرێن گـــولا ل باغچـــا پـــڕن
ڕەنـــگ و ڕەنگـــن بـــێن ژێـــت فـــڕن
کۆڤانـــــداریێ ئێـــــك گولێمـــــه[1]
کـــەتـــم حـــەیفـــێ گـــول هـــات کـــرن
ســـــەد مخـــابن ژ مـــــن ڤـــــەکـــرن
ب ســـۆز دیلـــدارم بـــیم هـــەتـــا مـــرن[2]

گـــــولا مـــــن نـــــازك و نـــــازداره[3]
ژمێـــژه[4] ل گـــەل مـــن ئـــەڤینـــداره
دلـــێ خـــــەمگـــین بریـنـــــداره[5]
ســـۆرگول نـــوژه و لـــێ نـــوژداره[6]
نـــەگـــەهشـــت مـــن، مـــن دل ژاره[7]
مـــــن هلبژارتـــــــی ژ هـــــــەزاره[8]
ل دۆزا ژینـــــا مـــــن بـــــەژداره[1]

---

[1] ل جهەکێ دیتر: شەنگ و دیلداریێ دلێ وێمه.

[2] ل جهەکێ دیتر: تە ژبیر ناکم هەتا مرن.

[3] ل جهەکێ دیتر: گولا من نازگول و نازداره.

[4] ل جهەکێ دیتر: شمێژه.

[5] ل جهەکێ دیتر: دلێ من ل سەر بریندارە.

[6] ل جهەکێ دیتر: ل دەردێ دلێ من نوژداره.

[7] ل جهەکێ دیتر: نەگەهمێ من دل ژاره.

[8] ل جهەکێ دیتر: ل دەردێ دلێ من نوژداره، دلێ من ل سەر بریندارە.

بلـــبلم مـــن گـــول ئـــەگـــەرە
ئـــەز كـــۆژتم(٢) ب دەرد و كـــەســـەرە(٣)
بشـــێن زيمـــارێ گـــولا خـــۆ بـــيم
گـــولێ دل دا بـــــەر خـــــەنجـــــەرە
ڕەوش و خــــــەمـــــــلا ل بـــــــەرە(٤)
چـــــبكم ئيـــــرۆ ژ مـــــن ڤـــــەدەرە(٥)

كـــا ئـــەو گـــولا دل حـــەلانـــدی(٦)
ل بـــــاغچێ دليـــــدە مـــــن چانـــــدی(٧)
ئۆمێـــــــدا دل مـــــــام نڤانـــــــدی(٨)
حـــەيفـــا خوشـــيێت مـــە بوورانـــدی
چێـــــــبكم دلـــــــێ ئارانـــــــدی
ل مـــــن هـــــات ســـۆتن ڤـــەمرانـــدی(٩)

---

(١) ل جهەكێ ديتر: ل دۆزا ڤێ ژينێ بەژدارە، ل دۆزا ژينيدە بەژدارە.

(٢) كۆشتم.

(٣) ل جهەكێ ديتر: بكرم ڕوحا من ل سەرە.

(٤) ل جهەكێ ديتر: دێ ل سەر گولێ ئێم كوشتنێ.

(٥) ل جهەكێ ديتر: ئيرو چبكم ژ من ڤەدەرە، وەناكم كەس ببت شخوەرە.

(٦) ل جهەكێ ديتر: پژگوژا گولا خەم ڕەڤاندی، گولا من شتلا سوسنێ.

(٧) ل جهەكێ ديتر: ل باغچێ دليدە من چاندی.

(٨) ل جهەكێ ديتر: پەردا دلێ من هەژاندی، داڤا ڤينێ لێ ئالاندی، فند و ڕەشا ژينا منێ.

(٩) ل جهەكێ ديتر: ب ئۆمێدا دل ما نڤاندی، گولێ تە دل وێ مراندی، نێ خوەش حالێن بگەهشتنێ.

# هێلام بێ ئەڤین

نەشێم بکەم ژین
هێلام بێ ئەڤین
تە زوی دل فرۆت
ب ئاگری تە سۆت
ئۆمێد من نەمان
خۆزی بەرزە بین
دل ما بریندار
بیم ئێخسیر و ژار
ما بێ خەمل وار
چوون سۆز و پەیمان
گول لێ ڤەنەبین
باغچێ بێ خودان
مان بێ زڤستان
من ژین بێ تازی
لمرنێ تگەم کازی
دەردێ بێ دەرمان
نوژدار بۆ نەبین
نێ من دل نەما
ژ ڤان کول و خەما
ل ڤی دەردێ دوژوار
لێ ببە هەوار
بگڕنژە ئەڤین
دا بشێم بکەم ژین

## دەردێ ئەڤینێ

ئاخ ژ دەردێ تە ئەڤینێ
جەرگ و دلا تو د حەلینێ
چو دل نینن تو نە تێدە
تو چەند تەحل بێ هەر شرینێ

ئەڤین تو دەریایەك كویرێ
تو بێ بنێ و دل داعویرێ
ل دلێ ئەڤیندارا د زویرێ
شەڤ و ڕۆژا مە تو ل بویرێ

ئەڤین دەردێ ئەڤیندارا
ئاگرێ تە چەند دژوارە
دلا دسۆژێ گونەهە ناكێ
تو نەكەڤێ ل دار و بەرا

ئەڤین بۆچی تو بێ دلێ
سەر دلێن ژار خەم و كولێ
جارا د كەنێ و جار تو سلێ
تورە و ئاشت بێ هەر تو گولێ

ئەڤین ب بەهایێ و هێژایێ
د ژینا مەدە ئاڤ و بایێ
نوژدارا دلێن بریندار
تو دەرمانا سەر دلایێ

ئەڤین تووێ خۆشیا ژینێ
دلا ب ئێکدوو تو د حەسینێ
دل ئاسن بت تو د چەمینێ
یێ تە نەڤێت تو د مرینێ

## بیك و زاڤا

بویکا ل دیلانێ بویکە
خەنها ل دەست و نەینویکە
گۆڤەندا ل حەوشا مەزن
ل زاڤای سەر سوبەهیکە

سلاڤ و پیرۆزباهی
دێ کین سەما و کین شاهی
هەیڤ و ڕۆژێن ل دیلانێ
پێکڤە بژین ب تەناهی

بویک بۆ زاڤای گولە
پڕکۆژە ل باغچێ دلە
باغچەڤان ژك بلبلە
زاڤای مراد حاسلە

حەوشا مەزن ب خەملین
بویکێ و زاڤای هوین بینن
لیمویێ لێب ڕەشینن
دۆست و هەڤال دا بینن

ئەلیف و میم و یا ل بەرن
نوین و هێ ناڤ پێ ناس دەرن[١]
هەر پێنج پیتا ناڤ پێکهاتی[٢]
ل ڤی دلی کول و کەسەرن[١]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: نون و هیا دل خەمگین.

[٢] ل جهەکێ دیتر: هەر پێنج پیتا بیم ئەڤیندار.

چەند ڤینا[2] تە من تێت بویرێ
دبێ ئاكر ل دلی د زویرێ
مراد نابت هندی[3] دویرێ
نێ تو ژك وەك من خەمگیرێ[4]

ئەز ل كیو هۆزانڤانی
هەلبەستڤەهان[5] ب دل كۆڤاننی
نیشا من دان پەیڤێت جوان[6]
نەشیا ل ڤینێ بكێ شڤانی[7]

دل هندا بی من لێگەریا[8]
نە مەلەڤان كەتم دەریا
گول چرمسی بەلگ وەریا
ڕاستە وێت[9] ژیم ل ڕێزا مریا

كرم تەیرێ چەنگ شكاندی
هێلین ل من هەرڤاندی
من نەمان وار لێ بكم ژیار
ڤینا بێ سۆز ل من ئالاندی

---

(1) ل جهەكێ دیتر: ئەز كرم ژار بەژنا شرین، ئێخسیر بیم ئەز دلبرین.

(2) ل جهەكێ دیتر: ناڤێ.

(3) ل جهەكێ دیتر: بێ مرادم تو ژ من.

(4) ل جهەكێ دیتر: ئەز مراندم ژ دەریا كویرێ.

(5) ل جهەكێ دیتر: پەیف ڤەهان.

(6) ل جهەكێ دیتر: من نەت زانی رۆژ دێ ل من ئینت.

(7) ل جهەكێ دیتر: ل كۆل و دەردا بكم شڤانی.

(8) ل جهەكێ دیتر: گول ما بێ ئاف من لێگەریا.

(9) بێت.

خـــودایێ مـــن ژ تـــه منـــهتـــه
دەرد دا مــن ل گـــهل بـێ مـــرۆەتــه
مــن نـــهھێـــز مـــا و نـــه تاقـــهتـــه
مـــــن بمرینـــــێ ل مـــــن داوەتـــــه

# بيك و زاڤا

سەر سوباهی پیرۆز بتن زاڤە
هەڤژینا تە بەژنا وێ زراڤە
ل بیك و زاڤا ل دەی بابا چاڤ ڕۆنبن
شکەیفا[1] ڕۆندك وێت[2] ماینە ب چاڤاڤە

ل حەوشا مەزن دێ خۆشکن گۆڤەندێ
زاڤا باشاکەت دەستێ لەوەندێ
خۆشکا زاڤایی کا شویشا لەوەنتێ
لێب ڕەشینە بۆ خاترا ڤێ چەندێ

بیك و زاڤا هێش گولن بشکوژن
چوون سلاڤا کێشا ژینێ ب دۆزن
ژی درێژ بن بۆ ئێك دوو پیرۆزبن
هەر دل خۆشبن ل گرێژینێ ب سۆسبن

بیك و زاڤا ئەو ستێرن ل عەزمانی
کەژبن[3] هەردەم شەوقێ بدن خانی
زاڤا مال خوێ بیکی تو کابانی
هیلینەك نوی بۆ زاڤای تە دانی

---

(١) بێت.

(٢) ژ کەیفا.

(٣) گەشبن.

## دەرەوینێ

کا سۆزا تە دای هەی دەرەوینێ
ژ خودێ نا ترسێ[1] تو مت[2] خاپینێ
بۆ من تە سووند خوار نەبم نەکێ ڤین[3]
ڤان کول و دەردا ل دلێ مت[4] چینێ[5]

دلێ من تە سۆت[6] ب وان تبل و دەستا
خائن[7] بێ سوزێ خوین لێ ڕاوەستا
د ڤێ قلوزێ من دل وەستا[8]
چوون هویڤی و[9] خۆزی مرن مەبەستا

چالا[10] توت[11] کولێ دێ کەڤێ تێدە
تو وات لەیزی دل بێ ئۆمێدە

---

(١) ل جهەکێ دیتر: من دل وێ ژ تە مای.

(٢) من د.

(٣) ل جهەکێ دیتر: دوهی تە سووندخوار ئیرۆ مت کێ ژار.

(٤) من د.

(٥) ل جهەکێ دیتر: بناڤێ وی خودای دێ من مرینێ.

(٦) ل جهەکێ دیتر: نە سۆژە کوزێ.

(٧) ل جهەکێ دیتر: نێ تو.

(٨) ل جهەکێ دیتر: د ڤێ قلوزێ مراد من خوەستە.

(٩) ل جهەکێ دیتر: دلێن تیر.

(١٠) ل جهەکێ دیتر: بویرا.

(١١) تو د.

قــــەد مــــن بــــاوەری ئێــــدی ب تــــە نــــەمــــا[1]
بێبــــەختــــێ زاڵــــم هــــەر ژ ئیــــرۆ پێــــدە

دل بــــێ تاقــــەتــــا بلنــــد نــــافرم
بــــارێ هێجــــەتــــا نــــەشــــێم هلگــــرم
ڤــــان گفتوگــــوا دێ ل گــــەل تــــە بــــرم
ل گــــەل بــــێ مــــروەتــــا ئــــەز ناڤــــەگــــەرم

---

[1] ل جهەکێ دیتر: کەسێ باوەری ئێدی ب تە نائێت.

## سۆزدارى

تــــه ســــۆزداى لێڤــــه نــــهبــــه
تــوا وا دل مــاى ژ مــن سل نــهبــه

ل ڤــێ ژینــێ هــێلام بــێ ئــهڤــین
محــهیــف مخــابن ژێــك ڤــهبــین

بــێ خــودانم ل مــن بــه ســهمیــان
دل ب ژانــــــم لێبــــــه دهرمـــــان

ب كۆڤانــدارى خــهم بــۆ مــن مــان
مــن كــول دهردى ل دلــى دهمــان

ئاســــن دلــــێ ژ ڕهحمــــێ ڤــــالا
ل دلــێ كــولێن چــهنــدین ســالا

ژ نویكــا دبێــژى مــن تــو نــهڤــێ
خــۆ دویــر تێخــى تــو ژمــن ڕهڤــێ

دهلال كــا سـۆز تــه چ ل مــن كــر
دل مــام بــێ دۆز بریــا تــه كــر

خــائن نــهبــه ژ خــودێ بترســه
هــهى بــێ ســۆزى مانــه بــهســه

## سۆزداری[1]

نــەشــێم خۆشــتە بــێ هــویڤی بکــم
ئــەز دێ ســۆزی ل گــەل تــە نــوی کــم
ئـــــــەز مرانــــــدم کچـــــــا دەلال
دێ ڤــێ ژی ل خـــۆ و تـــە نیڤـــی کـــم
مـــن بـــێ هـــویڤی نـــەکـــە یـــارێ
تـــــو ژك[2] وەك مـــــن برینـــــداری

نـــێ هـــەر تـــو بـــی خۆزیـــا[3] بـــەرێ
تـــــە بـــــەرێ مـــــن دا[4] وەغـــــەرێ
نـــەت[5] بێــژی نــە و نــەت[6] بێــژی ئــەرێ[7]
دلـــێ مـــن ژ ســـینکی هـــات[8] دەرێ
مـــن بـــێ هـــویڤی نـــەکـــە یـــارێ
تـــــو ژك[9] وەك مـــــن برینـــــداری

---

(١) ل جهەکێ دیتر: هویڤیدارم.

(٢) ل جهەکێ دیتر: تو ژی.

(٣) ل جهەکێ دیتر: نێ هەر توی دەردێ.

(٤) ل جهەکێ دیتر: تە بەرێ من دا.

(٥) نە د.

(٦) نە د.

(٧) ل جهەکێ دیتر: نەد بێژی نە و نە گۆت ئەرێ.

(٨) ل جهەکێ دیتر: دل ژ سینگی ئیناد.

(٩) ل جهەکێ دیتر: تو ژی.

خــــەم و كۆڤاننێـــت چـــەنــد ســــالا
وێــت[١] بــين كــەســەر ل دلـــى ئـــالان
هـــزرەكــــێ دبــــم دەهـــــا دێــــنم[٢]
مـــن ل ڤــێ ژينـــێ نـــە چـــو حـــالا

مـــن بـــێ هـــويڤى نـــەكـــە يـــارێ
تــــو ژك[٣] وەك مـــــن برينــــــدارێ

(١) ل جهەكێ ديتر: ل من.

(٢) ل جهەكێ ديتر: هزرەكێ تبم و دەها تينم.

(٣) ل جهەكێ ديتر: ژى.

# سۆزداری

نێ تە من ڤین سوز بت یاری
ئێدی نەکم ئەڤینداری
دەست ژێك قەتان كا سۆزداری
ژبیر نەکە ل من قەرزاری
گونەهبت هەر تو بەژداری
تە بەخت کێشا بڤی هەفساری
گەلەك جارا تهاتم واری
بیرهاتن بی یێن ژێت باری
تهات بێش چاڤا پرچا تاری
ئەو هەردوو چاڤێن خویساری
پاوان بین بۆ من بت یاری
کا ئەو سۆندێن بۆ من خواری
دەستێ تەنکە ژەهرا ماری
هەوار چەند تەحلە هەژاری
فەقیربم کەس نائێت هاری
ناڤ بەینا نالێ و بزماری
دل و نەشێ ڕاکێ باری
دەست من باقشکر ب دیواری
خۆشی نەمان بەس خەمداری
خودا بکێ هاریکاری

## بێ سۆزێ

هات بەهارا ڕەنگ و خەملین
سۆزێ نویکە دا بکین ئەڤین
سەیرانگەها دلێ کۆڤان
ل گەل من نەبێ نەشێم بکم ژین

هاڤین هات و کەکو گەرمە
لێڤە نەبە سۆزێ شەرمە
تە ئەڤ ناڤە ڕانابت سەرمە
بەفرا چیا حەلا ژبەر مە

هاتی باییزا ئاخلێڤە
سۆزداریێ نە هەڕێڤە
دارا ژینێ بەلک لێ وەریان
ئەز هێلام ل هویڤیا مرنێڤە

زڤستان هات ڕەوش و درێژ
سۆز تە فرۆت کرم دەروێش
ئیرۆ لڤینێ هندابی کێش
دل تە حەلاند چ دڤێتن هێش

## بێ سۆزی

چـــوون ڕۆژێـــن ب خۆشـــی مـــن هـــێش وێ ل بیـــرن
ژی چـــوو ل مـــه بـــووری هـــێش ئـــەو ژێـــك دویـــرن
مـــن گونـــەهـــ چبـــی ژیـــن هـــێلا تـــاری
دەردا ت[1] مـــەزێخـــم کولێـــت مـــن کـــویرن

دلـــێن بـــێ ئـــەڤـــین دێ زوی هنـــدابن
ئـــاگرێن بـــێ دویکێـــل ئـــەو قـــەد هلنـــابن
خـــڕ هـــویڤی خـــەونـــن مـــراد بـــێ نـــابن
چـــو وار ب خۆزیـــا نـــێ ئاڤـــا نـــابن

بـــێ ســـۆزی کـــەنگـــی دێ ل مـــن زڤـــڕێ
ل مـــن کـــر دەرەنگـــی هـــەی ڤـــین ئـــاگرێ
تـــە بـــاوەر نـــەت[2] کـــر ل گـــەل تـــە بکـــم ئـــەڤینـــی
کـــی دل فـــرۆش بـــت تـــو لـــێ بکـــرێ

ئـــەز کـــەتـــم حـــەیفـــا ڤـــی دلـــێ شـــکەســـتی
ســـەرێ چـــەنـــد ســـالا ئـــەڤـــین مـــن بـــەســـتی
مـــب[3] ئـــەڤـــان تـــلا ب ڤینـــا تـــە ڕســـتی
تـــە ل مـــن ئالزانـــد مـــرن مـــن خـــوەســـتی

---

(1) د.

(2) نه د.

(3) من ب.

## بێ سۆزێ[1]

هەی بێ سۆزێ مام بێ خودان
چ داڤ بین تە[2] ل بەر من ڤەدان
بۆچی تو پرسا من ناکی[3]
نە بدیتن و نە بسەرەدان

دا بێژی من سەرێ ڕۆژێ[4]
بەری تو ڤی دلی بسۆژێ[5]
بۆ دلی دەرمانبی و نۆژێ[6]
ب ئەرزانی تو من د فرۆشی[7]

تو دوو دلی و دوو ئەزمانی
من یا دلێ تە نەدزانی
کرم ئێخسیر و بەندەوار[8]
تە ئەز فرۆتم ب ئەرزانی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٦/٦/٢٠٠٦)ێ، هاتیە ڤەهاندن. ل جهەکێ دیتر: (٥/٢/٢٠٠٤)، ب ناڤونیشانێ (پەشمانی) ژی هاتیە.

[2] ل جهەکێ دیتر: تە بۆچی داڤ.

[3] ل جهەکێ دیتر: کرم ئێخسیر ل من ناپرسی.

[4] ل جهەکێ دیتر: بۆ من بێژە تە چی ل بەرە.

[5] ل جهەکێ دیتر: ما تە دل ئاسن و بەرە.

[6] ل جهەکێ دیتر: دلێ من ب کول و کەسەرە.

[7] ل جهەکێ دیتر: ژ دەردێ ڤینا تە ب ئەگەرە.

[8] ل جهەکێ دیتر: فەیدە ناکت پەشیمانی.

من دل داته ڤین تێدەبی
ته ڤین دا من و لێڤەبی
نێ نه هوسانا ئەڤینی
ئەگەر بمرم تو سەبەبی

## کا سۆزا تە[1]

کـــا ســـۆزا تـــە هـــەی غـــاینێ
بـــێ بـــــاوەرێ دەرەوینـــــێ
ژ خـــودێ نـــا ترســـی مـــن دهێلـــی
کێ گۆت ل گەل من بکێ ئەڤینێ

ڤینـــا تـــەمـــا د دلـــێ کولـــدە
بـــێ بیرهـــاتن خـــەم مـــان د ســـەردە
تـــە ل مـــن دل ســـۆت هـــەی زاڵمـــێ
ژ وارێ ئـــەڤینـــێ تـــە فـــردا

پشـــتی تـــو چـــووی مـــن دل ژار بـــی
بریـــار تـــە دا ل مـــن هنـــدا بـــی
رۆژ دێ هێـــت ل مـــن پـــەشـــێمان بـــی
غـــاینێ تـــو نـــە ســـۆزدار بـــی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەفتی (٢٠٠٧/٦/١٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

# كا سۆزا تە

كــا ســـۆزا تـــە گونـــەهبـــارێ
تـــە دلـــێ مـــن هـــێلا بێـــزار
دابێـــــــژێ مـــــــن ســــــەرێ ڕۆژێ
بــەرێ مــن ل خــۆ بكــێ ئــەڤینــدار

كــەتــم حــەیفــێ تــە زورێ شــیكر
تـــە دلـــێ مـــن بـــێ هیڤیكـــر
ژیانـــا مـــن ل مـــن تـــاریكر
ڕێــك نێزیــك بــی تــە ل مــن دیركــر

زاڵـــم بـــۆچی بـــێ وژدانـــی
تـــە ئـــەز دام ب ئێكـــە بیـــانی
تیـــرەك ژەهـــرێ ل دلـــێ كولـــدا
مـــن یـــا دلـــێ تـــە نـــەدزانـــی

دل بیرنـــــدارم بـــــێ دەرمـــــان
مـــن نـــە حـــەكیمـــە و نـــە لوقمـــان
خـــائینێ هـــەی ئـــاخ و ئـــەمـــان
ســـەر ئـــەڤینـــا تـــە بـــیم قوربـــان

## كا سۆزداری(١)

تـەز(٢) هـێلام بـێ سـۆزێ ل سـەر ڤـان كـول و دەردا
دلـێ تـو ل مـن سـۆژێ مـن گـیـان ل سـەردا(٣)
تــو وال مــن خــائن بــێ زالـمــێ بێبــەختــێ
نــەخۆزیــا وێ ڕۆژێ مــن بــاوەری ل گــەل دا(٤)

ئۆمێـد بینــە خــەون(٥) تــەز(٦) هـێلام بـێ مـراد
مـن بـرین ناكـەون تـە دلـێ(٧) مـن هـەژانـد
ژیـن ل مـن كـر مـرن ل ئـەڤینـێ نـەمام شـاد(٨)
دلـێ مـن پـڕ كـولن لـێ چانـدن و مرانـد(٩)

بــلا ســـەرێ(١٠) ڕۆژێ گۆتبــا مـــن یـــارێ
نـەهوسـا ب ڤـی ڕەنگـی مـت(١١) كـوژێ نـەیـارێ

---

(١) ل جهەكێ دیتر: هەی زالمێ.

(٢) تە ئەز.

(٣) ل جهەكێ دیتر: دلێ من توت سۆژی ل ژینێ ڤین مام هندا.

(٤) ل جهەكێ دیتر: نە خۆزیا وێ ڕۆژێ ژ من دلخوەستی و بەردا.

(٥) ل جهەكێ دیتر: ڕۆژ بین خەون و خۆزی.

(٦) تە ئەز.

(٧) ل جهەكێ دیتر: من زانی درەون هەوار تە دل.

(٨) ل جهەكێ دیتر: ژین ل من مرن شنویكا ئەڤینێ لێ چاند.

(٩) ل جهەكێ دیتر: دلێ من پڕ كۆلن ساخ نابت تە مراند.

(١٠) ل جهەكێ دیتر: بلا هێش.

(١١) من د.

تـه ل مـن مراندی دل ژ خۆشـیا[1] خـاتر خـوەسـت
مــن ژیــن مــا بــێ خــەمــل ئینــام بــەر سـێدارێ

گونـــەهـــا تـــە کـــری نائێـــت غـــەفرانـــدن
ل ئـــەڤـــی دلـــێ مـــری ڤـــین نائێـــت چانـــدن
چـەنـد تـو ل مـن بزڤـرى ب خـائن تـێ خواندن
بـــاوەری بتـــە نـــەمـــا[2] ئـــەز نـــائێم خاپانـــدن

---

[1] ل جهەکێ دیتر: ژ ڤینێ.

[2] ل جهەکێ دیتر: من باوەری کری.

# کا سۆزداری[١]

کــــەســــەر دار و کۆڤانـــــدارم دل برینـــــدار
کـــەتـــم دەردێ تـــە دلبـــەرێ بـــیم ئـــەڤینـــدار
تـــە ئـــەز کـــۆژتم[٢] هـــەی زاڵمـــێ هـــێلام بـــێ وار
بـــەهـــارەك هشـــك ئـــەز چـــەرانـــدم مـــن دل مـــا ژار

دلبـــەرێ مـــن بـــرین مـــان کـــول مـــان بـــێ دەرمـــان
نـــوژدار تـــو بـــی هـــەی بـــێ ســـۆزێ ئـــاخ و ئـــەمـــان
هـــەرۆ تـــو یـــا مـــن د خـــاپینێ کـــانێ پـــەیمـــان
ئـــەڤـــێ جـــارێ مرنـــا منـــە ب کـــەفیـــل دەمـــان

نـێ تـە خـەملانـد[٣] داربـەسـتا مـن ل مرنـێ شـاندم
تـــە توربـــا مـــن ب دســـتا کـــولا و لـــێ ڤـــەشـــارتم
ل بـــەر ســـەرێ مـــن دارا خۆزیـــا تـــو بچینـــە
دا ئـــەڤینـــدار مـــن نـــاس بکـــن بـــێ مـــرادم

دکـــم شـــێرەتـــێ ل ئـــەڤینـــدارا د خـــەو نـــەمینـــن
یـــان دێ وەك مـــن ل گـــەل بـــی ســـۆزا خـــۆ مـــرینن
ئـــەڤـــین ژینـــە و دل بـــەرپرســـە و لاو بخـــوینن
هویڤیـــدارم یـــا مـــن دیتـــی هـــوین نـــەبینـــن

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٤/٣/٢٩)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[٢] ل جهەکێ دیتر: سۆتم.

[٣] ل جهەکێ دیتر: دێ ب خەملینە.

